## بەرگی دواوە

ئەم پەڕتووکە: لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانەی کەسایەتیی منداڵەکەتە کە لەسەرەتای دانانی بناغەی کۆمەڵایەتییەوە.

ئەم پەڕتووکە: باسی کارتێکردنی گفتوگۆکانت لەسەر کەساییەتی منداڵەکەت ئەکات لەژیانی ڕۆژانەتاندا.

ئەم پەڕتووکە: ڕێگاکانی چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەی پەروەردەیی ئەخاتە بەردەستی دایکان و باوکان.

ئەم پەڕتووکە: لە زۆر سەرچاوەی زانستی و پشکنینی تازەوە وەرگیراوە.

ئەم پەڕتووکە: ڕێگاکانی هەڵسووکەوتی بەجێ و زانستیانە دەستنیشان ئەکات و بەرپرسیاریەکە ئەداتە دەست دایکان و باوکان.

## نـــــاوەڕۆك

## بەشی یەکەم

## بەشی دووەم

پرسیاری 1

منداڵەکەم سێ ساڵانە و فێری ئەوە بووە کەشت ئەخاتە گیرفانیەوە کاتێك ئەچین بۆ میوانی، هەرچەند هەوڵمدا لەگەڵیدا، بەلاَم سوودی نەبوو، ناچاربووم گوێچکەیم گرت و لێی تووڕە بووم، بەلاَم سوودی نیە و ئێستا نازانم چیبکەم.

پرسیاری 2

منداڵەکەمان سێ ساڵە و لەئێستاوە وای لێهاتووە بەقسەمان ناکات، باوکی ئەڵێت لەوانەیە شێت بووبێت و ئەیەوێت بیبات بۆلای دکتۆر، منیش دڵم نایەت ئازاری بدەم و ناچارم بەدزی باوکیەوە دڵنەوایی ئەکەم و ئامۆژگاری ئەکەم، ئایا چیبکەم؟ منداڵەکە بەرین بۆلای دکتۆر یان نا؟

پرسیاری 3

منداڵێکمان هەیە تەمەنی (5) ساڵە و منداڵێکی زۆر ڕێك و پێکە و زۆر لێی ڕازین، تەنها یەك شت هەیە ئەویش ئەوەیە کە درۆ زۆر ئەکات، چیبکەین بۆ ئەوەی حەیامان نەبات؟

پرسیاری 4

ئایا ئەگەر منداڵەکەمان شتێکی کرد سزای نەدەین ئەەی چیبکەین، ئایا بۆی هەیە هەرچی ئەکات بیکات؟

ئایا هەموو جۆرە سزایەك خراپە؟

پرسیاری 5

منداڵەکەم لەتەمەنی (2) ساڵیدایە و هەر جارێك بەجێی دەهێڵم دەست ئەکات بەگریان بەدوامدا چی بکەم؟

پرسیاری 6

منداڵەکەمان پێیگرتووە (18 مانگە) و هەراسانی کردوین، ناتوانین شتێك لەژوورەکەدا دانێین، ئەو ڕائەکاتەسەری، گوڵەکانمان ئەخاتە خوارەوە و ئەیشکێنێ، چیبکەین و تاکەی ئەمە بەردەوام ئەبێت؟

پرسیاری 7

ئایا ڕێگا بدەین بە منداڵەکەمان کە سەیری هەموو شتێك بکات لە تەلەفیزیۆندا و چیبکەین کاتێك فلیمی ماج و موج پێشان ئەدات، چونکە کاتێك بە منداڵ پێنج ساڵیەکەمان ئەڵێین کە نابێت ئەو سەیری بکات ئەوەندەی تر ڕق ئەگرێت و ئەچێتە بەر تلفزیۆنەکە و ئەیەوێت بیکوژێنێتەوە، چار چییە؟

پرسیار 8

منداڵێکی شەش ساڵانمان هەیە، هەرکە ئەچینە دەرەوە ئیتر دەست ئەکات بەگریان بۆ شیرینی و یاری ناوێرم بچمە دوکانێکەوە، چونکە ئەزانم کە ئەمکات بەسینەما، هەموو جارێك ناچار ئەبم کە بەقسەی بکەم، ئێستا کەخەریکە قوتابخانە دەست پێئەکات ئەترسم نەچێت بۆ قوتابخانە ئەگەر ئەوەی ئەیەوێت بۆی ئەکەم، ئەزانم گوناه گوناهی خۆمە، بەڵام چیبکەم چارێك؟

پرسیاری 9

منداڵەکەمان تەمەنی شەش ساڵ و نیوەو هەتاکو ئێستاش میز ئەکات بەخۆیدا، هەرچیەکمان کردووە بەخۆڕایی چووە، هەست ئەکەین کە خۆشی پێی ناخۆشە و شەرم ئەکات، باوکی گاڵتەی لەگەڵ ئەکات و پێی ئەڵێت ئەگەر میز بکەیت بەخۆتدا ئەوا کچان حەزت لێناکەن، ئەڵێت ئەمە وای لێ ئەکات کە بترسێت و ئیتر میز نەکات بەخۆیدا، ئایا باوکی ڕاست ئەکات یان نا.

پرسیاری 10

منداڵێکی ساوامان هەیە کە تەمەنی 11 مانگە، ئێستا فێربووە کە لە باوەشماندا نەبێت خەوی لێناکەوێت و هەر کە دایئەنێین خەبەری ئەبێتەوە و دەست ئەکات بەگریان، چیبکەین و چۆن ئەتوانین لەم خوە خراپەی ڕزگارمان ببێت؟

پرسیاری 11

منداڵەکەمان تەمەنی 2 ساڵە و هەتاکو ئێستا گیروگرفتێکی وامان نەبووە، بەلاَم ئێستا فێربووە کە شەو خەبەری ئەبێتەوە ئەیەوێت بیگرینە باوەش، ئێمەش هەردووکمان کارمان هەیە و ناتوانین شەوی دوو سێ جار هەڵسین و ئەو بگرینە باوەش، چارمان چیە؟ ئەبێت هەر بیگرینە باوەش؟ یاخود قەیناکات ئەگەر لەگەڵ دایکی بنوێت تاکو بەیانی، چونکە بیستومانە کە ئەمە باش نیە بۆ منالْ .

پرسیاری 12

منداڵەکەمان تەمەنی 2 ساڵەو هەتاکو ئێستاش ئەترسێت لەخەڵکی و هەر میوانێکمان دێت ئەو دەست ئەکات بەزریکاندن، چیبکەین؟ چارمان چیە.

پرسیاری 13

منداڵەکەم هەشت ساڵانە و هەتاکو ئێستاش هەر پەڕۆ ئەخاتە دەمیەوە، جارانیش هەروای ئەکرد بەلاَم قسەمان نەئەکرد لەبەرئەوەی منداڵ بوو، ئێستا پێی ئەڵێێن کەچی سوودی نیە، چارمان چیە؟ من زۆر بەشتێکی ناشیرینی ئەزانم و حەزناکەم کە گەورەبوو هاوڕێکانی گاڵتەی پێبکەن.

پرسیاری 14

کچەکەمان تەمەنی دە ساڵە و هەرچی هاوڕێکانی پێی ئەڵێن ئەو ئەیکات، هەرچەندە خۆشی حەزنەکات، ئێمە پێمان وتووە کە پێویست نیە هەرچیەکیان پێوت ئەو بیکات بەلاَم سوودی نیە چیبکەین؟

پرسیاری 15

زۆرجار گوێمان لەخەڵکیە کە ئەڵێت وابکە باشە بۆ منداڵەکەت، کەچی هەرگیز گوێم لێنەبووە کە یەکێك بڵێت وامەکە بۆ منداڵەکەت خراپە، پرسیارەکەم ئەوەیە کە مرۆڤ چی نەکات باشە لەپەروەردەی منداڵدا؟

پرسیاری 16

منداڵێکمان هەیە کە هەرگیز بەقسەی دایکی ناکات، بەلاَم لەگەڵ مندا هیچ گیروگرفتێکمان نیە، چارەمان چیەو ئەم منداڵە بۆ وای لێهاتووە.

پرسیاری 17

کوڕێکی حەوت ساڵی و کچێکی پێنج ساڵانمان هەیە، هەرجارەی شتێك بۆ کوڕەکان ئەکرێن کچەکەش داوای هەمان شت ئەکات، ئێمەش ناچالا ئەبین کەشتێکی بۆ بکڕین و بە هەرشێوەیەك بێت ڕازی بکەین بۆ ئەوەی خۆی بەکەم نەزانێت، نازانین ئەمە هەڵەیە یان نا، چیبکەین؟

پرسیار 18

منداڵێکی 3 ساڵانەم هەیە کە زۆر لەتاریکی ئەترسێت و دەست ئەکات بەزریکاند و بەهیچ شتێك ژێر نابێتەوە هەرچەندە کە پێی ئەڵێین کە هیچ نیە و مەترسە، بەڵام سوودی نیە؟

پرسیار 19

هەرجارێك میوانێکم دێت، منداڵە سێ ساڵەکەمان تووشی بەغیلی ئەبێت و بەتەواوەتی ڕقم هەڵئەسێنێت بۆچی وا ئەکات و چیبکەم؟

پرسیار 20

منداڵەکەمان تەمەنی دوو ساڵە و هەتاکو ئێستاش ئەترسێت لە خەڵکی و هەر میوانێکمان دێت دەست ئەکات بەزریکاندن، چیبکەین و چارمان چیە؟

پرسیاری 21

کچە پێنج ساڵانەکەم زۆرجار خەوی ناخۆش ئەبینێت و ئەڵێت کە خێوی دیوە، ئەمە چیە و چیبکەم؟

پرسیار 22

کوڕەکەمان پێنج ساڵانە و زۆر شەرمنە وە دڵنیا نییە لەوەی لەگەڵ منداڵانی تردا پەیوەندی دروست بکات زۆر خەفەت بارین بەوەی ئەمە کاربکاتەسەر پێشکەوتنی مێشك و هەست و نەستی، چی ئەبێت بەهۆی شەرمنی، و چۆن ئەتوانین یارمەتی بدەین.

پرسیار 23

پیاوەکەم بەرتیل ئەدات بەمنداڵە چوار ساڵەکەمان بۆ هەرکارێك ئەیکات، ئایا ڕاستە ئەگەر من پێم ناخۆشبێت و بڵێم ئەمە ڕاست نییە؟

پرسیار 24

کوڕێکی دەساڵانمان هەیە کە فشە بەهەموو شتێکەوە ئەکات، بەتایبەتی کە چەند ئەزانێت و چەند زیرەکە، بەڕاستی نازانم ئەمە لەکوێوە هاتووە و بۆچی وا ئەکات نازانم چیبکەم؟

پرسیار 25

چی ڕووئەدات ئەگەر.....

کچێکی حەوت ساڵانمان هەیە کە هەردەم پرسیار ئەکات چی ئەبێت ئەگەر... بۆ نمونە پرسیار ئەکات کەچی ئەبێت ئەگەر تۆ و باوکم جیابونەوە؟ چی ئەبێت ئەگەر من نەخۆشکەوتم و کەس لەماڵەوە نەبوو؟ چی ئەبێت ئەگەر باوکم مرد، ئیتر زۆر بیر لەمجۆرە شتانە ئەکاتەوە و باسیان ئەکات، ئایا ئەمە ئاساییە یان نا؟

پرسیار 26
منداڵی خوشکەکەم لەم بەینەدا هاتن بەمیوانی بۆ ماڵی ئێمە، سەرم سوڕما لەئاقڵی و ڕێکوپێکی کچەکەیان کە لەتەمەنی هەشت ساڵی دایە، هەموو ماوەی میوانداریەکە ئەو کچە خەریکی شت خستنەوە شوێنی خۆی بوو ئاگاداری منداڵەکانی ئەکرد، لەوەدا بوو کە پیاو بڕوای نەئەکرد کە ئەمە کچێکی ئەوەندە ڕێکوپێکی لێدەرچوو بێت، ئەمە چیە و ئایا ئەمە ڕاستەیان نا؟

پرسیار 27
کوڕێکی سێ ساڵانم هەیە و سکم پڕە بەمنداڵێکی ترەوە لەشەش مانگیدا چۆن منداڵەکەم ئامادە بکەم و پێی بڵێم کە منداڵێکی ترمان ئەبێت؟ ئایا چی بکەم؟

پرسیار 28
هەرجارێك یاریەك ئەکرم بۆ کوڕە حەوت ساڵانەکەم، کچە پێنج ساڵانەکەشم داوای شتێك ئەکات، کە زۆرجار ناچار ئەبم بۆی بکڕم کە ئەشزانم ئەمە باش نیە چیبکەم.

خۆناسین

توڕەبوون

ترسی منداڵ

غەمباری

گەلەکۆمەکی

ڕەخنەگرتن یان هەڵسەنگاندن

موراڵ

# کەسایەتیی منالەکەت

کۆی تایبەتمەندییەکانی دەروونی کە مرۆڤێك لـە مرۆڤێکـی تـر جیائەکاتـەوە لێکۆڵینەوەیـەکی زانسـتییە لـەبارەی کارتێکردنی پەروەردە لە کەسایەتیی منداڵ و گرنگی گفتوگۆ لەگەڵ منداڵدا.

**ئامادەکردن و کۆکردنەوەی: شێرزاد فەقێ عەلی**

Sherzad mustafa
Lindhemsvagen 48
19451 upplandsvasby
Stockholm-sweden
E- mail: sherzad_mustafa@hotmail.com
Phon:0046709532253

سەرپەرشتی زانستی : د. عەبدولباقی ئەحمەد

**دکتۆری تایبەتمەندی دەروونیی منداڵ**

Dr Abdulbaghi Ahmad, MBChB, PhD
IACAPAP Ambassador
Assisting Professor & Founder of
Child Mental Health & Metin Health House
Duhok, Kurdistan Region - Iraq
Associate Professor & Senior Consultant in
Child and Adolescent Psychiatry
Uppsala University - Sweden
Office Phone: 0046186112555, fax: 0046186112565
E-mail: abdulbaghi.ahmad@neuro.uu.se





# پێشەکی

هەرچەندە دایکوباوك باشبن و منداڵەکەیان خۆشبوێت، بەلاّم هەر تووشی گیروگرفت ئەبن لەپەروەردەکردندا و ناچار ئەبن چاری بۆ بدۆزنەوە، چاکی و خراپی دایکوباوك لەسەر ئەوە کەوتووە کە چۆن ئەتوانن ئەم گیروگرفتانە چارەسەر بکەن، دایکوباوکی وا هەیە وا ئەزانن گیروگرفت هەر لەخۆیەوە و لەکتوپڕدا ڕوودەدات و نازانن بۆچی و چۆن چاریان ئەکەن، هەر جارێك گیروگرفتێك ڕوودەدات دڵگیر ئەبن و دۆشدا ئەمێنن و ئاواتە خوازن کە لەدنیایەك و کۆمەڵێکی وادا بژیانایە کە گیروگرفتی نەبوایە و ئەمانیش تووشی ئەم گیروگرفتانە نەهاتنایە، لەکاتێکدا دایکوباوکی وا هەن کە ئەزانن و ڕازین بەوەی کە ژیان گیروگرفتیشی تێدا ئەبێت، ئەگەر توانیان پێشەکی بیری لێئەکەنەوە و ڕێگای چارەسەر و خۆپاراستنی بۆ دائەنێن و لەهۆکاری ڕوودانی گیروگرفتەکە ئەکۆڵنەوە و خۆیان ئامادە ئەکەن بۆ ئەوەی ئەگەر جارێکی تر ڕوویدا ئەمان بتوانن بەرەنگاری بن و خۆیانی لێبپارێزن، بەمانایەکی تر ئەمانە ئەتوانن کۆنترۆڵی گیروگرفتەکان بکەن پێشئەوەی کە گیروگرفتەکان تووشی سەرسامی و حەبەساویان بکات.

زۆربەی زۆری گیروگرفتی پەروەردەی منداڵ پەیوەندی بە (ڕاهێنانەوە) هەیە، منداڵ تۆپەڵە قوڕێك نییە کە مرۆڤ بەهەوەسی خۆی شتی لێدروست بکات، ئەم بیرە کۆنە بیرێکی هەڵەیە و ئەبێت بیری لێبکەینەوە، بەڵکو منداڵ کەسێکی جیاوازە لەکەسانی دەوروبەری و لە هیچ کەسێکی تر ناچێت، کەواتە پەروەردەکار پێویستە هەوڵبدات.

منداڵەکەی بناسێت وەو تاکە کەس وە بارودۆخی ناو خێزان بەشێوەیەك بگونجێنێت کە ڕیزی منداڵەکەی تێدا بگیرێت و مەرجەکانی پێشکەوتنی دەروونی و مێشکی و لەشی بۆ ئامادە بکات، هەروەها دایکوباوك خۆیان ئامادە بکەن بۆ زیاتر تێگەیشتن لەمنداڵەکەیان و ڕۆڵی دایکوباوکایەتی بەو شێوەیە ببینن کە یارمەتی منداڵەکە بدات بۆ پێشکەوتن.

ئەم خۆ ئامادەکردنەی دایکوباوك یەکەم نیشانەی خۆشەویستیە بۆ منداڵەکە و ئەنجامیشی دڵخۆشکەر و گەیشتن بەئامانج و ڕەزامەندی دایکوباوکەکەیە، کارێکە کە هەردوولا ئەگەیێنێتە ترۆپکی ڕەزامەندی و دڵخۆشی کە لەسایەیدا نەوەیەکی بەکەڵك پەروەردە دەکرێت، کەواتە گەیشتن بەم ئامانجە تەنها بەکاری درێژخایەن ئەبێت و کاری درێژخایەنیش ئەوخونی و زەحمەت و ئازاری زۆری لەڕێدایە و ڕێگایەکە پڕە لەگیروگرفت و ئەبێت دایکوباوك خۆیانی ئامادە بکەن.

پەروەردە کارێکی وردەکاریە لەبەرئەوەی هیچ منداڵێك لەویتر ناچێت بۆیە چارەسەری گیروگرفتەکانیش جیاوازن و لەیەکتری ناچن و تایبەتن بەو کەسانەوە کە بەشدارن لەگیروگرفتەکەدا، ئەمە مانای ئەوەیە کە ناتوانرێت چارەسەرێك بۆ هەمان گیروگرفت بدۆزینەوە کە لەدوو شوێن و دووکەسی جیاوازدا ڕوودەدات، ئەبێت هەر حاڵەتەو چارێکی خۆی هەبێت، ئەمە مانای ئەوەیە کە دایکوباوك ئەبێت خۆیان لەمنداڵەکەی خۆیان بگەن و خۆیان چاری گیروگرفتەکانی

بکەن، نەك تەنها ئەمە بەڵکو ئەو چارەسەرەی کە ڕاستە بۆ منداڵێکیان بەکەڵکی منداڵێکی تریان نایەت هەرچەندە گیروگرفتەکان وا دیارین لەیەك ئەچن و لەیەك کاتدا ڕوو ئەدەن، لەبەرئەمانە و ئەو گۆڕانانەی لەژیانی ئەندامانی کۆمەڵدا ڕوو ئەدات ئەتوانین بڵێین کە پەروەردەکاری کارێکی درێژخایەن و لەدووانە هاتووە و هەردەم لەگۆڕاندایە و خۆ ئامادەکردن بۆی پێویستی بەکاری درێژخایەن و لەدوانەهاتووە.

خووڕەوشت و هەڵسوکەوت و تێگەیشتنی منداڵەکەت بەمیکانیزمێکی تایبەتیدا ئەڕوات کە تایبەتە بەخۆیەوە و لاسایی کەسیتر ناکاتەوە و پێویستی بەتێگەیشتنی تایبەتی هەیە، کەواتە دایکوباوکێکی دڵسۆز ئەزانن کە ئەوەی بۆ منداڵەکەیان باشە لەوانەیە بۆ منداڵێکی تر باش نەبێت و چاوەڕوانی ئەوە ناکەن کە منداڵەکەیان بە ڕۆتینێکی تایبەتیدا بڕوات، لەبەرئەوەی منداڵێکی تر بەهەمان ڕۆتیندا ڕۆیشتووە، بەڵکو هەوڵئەدەن کە لەمنداڵەکەیان بگەن بەو شێوەیەی کەکەسایەتیی خۆی بپارێزێت و بەرەوپێشی بەرێت.

لەبەرئەم هۆیانە، لێرەدا بەگشتی ئەتوانین گیروگرفتەکان هەڵسەنگێنین و چارەسەری گشتیان باس بکەین و نەتوانین بەتایبەتی باسی منداڵەکەی تۆ بکەین، ئەمە کاری دایکوباوك خۆیانەو کەس هەقی ئەوەی نیە ئەو مافەیان لێبسێنێتەوە، ئەوان کەسێکن کە باشتر لە هەموو کەسێکی تر منداڵەکەیان ئەناسن، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە نەتوانرێت گیروگرفتەکان ڕێکوپێك بخرێت و بەپێی قۆناغی جیا جیا باسیان بکرێت، چونکە ژیانی منداڵ پێکهاتووە لە قۆناغی یەك لەدوای یەك و هەر قۆناغەی گیروگرفتی جیای هەیە کە تایبەتە بە قۆناغەکەوە و جیاوازە لە قۆناغی داهاتوو، جا کاتێك دایکوباوك ئەمەیان زانی ئیتر بۆیان ئاسان ئەبێت بۆ ئەوەی بەلای کەمەوە بزانن کە بۆچی ئەم گیروگرفتە ڕوویداوە و بزانن کە ئەمە شتێکی کاتیەو چارەسەری پەیوەندی هەیە بەم قۆناغەوە و ئەتوانن خۆیان ئامادە بکەن بۆ قۆناغی داهاتوو.

لێرەدا ئەتوانین هەندێك ڕێڕەوی گشتی باس بکەین کە زانینی یارمەتی دایکوباوك ئەدات لەکارەکەیاندا و ئەتوانن وەکو خەتی پان سوودی لێوەرگرن.

یەکەم: قسەکردن و گوێگرتن: دوو هونەری گرنگن لە پەروەردە و پەیوەندی مۆڤایەتیدا و پێویستی بەڕاهێنان و دووبارەکردنەوە هەیە، قسەکردن و باسکردنی هەموو گیروگرفتێك و ڕووداوێك لەگەڵ منداڵدا لە زۆر تەنگوچەڵەمە دایکوباوك ڕزگار ئەکات و منداڵ فێری دەربڕینی هەست و نەستی ئەکات و کاتێکیش کەهەست و نەست بەڕاستی دەربڕدرا ئەوا ئاسانترە لەیەکتری بگەن و بتوانن گیروگرفتەکانیان کەمبکەنەوە و خۆیانی لێبپارێزن، لەقسەکردندا منداڵ پێئەگات و لەگوێگرتندا گەورە.

دووهەم: دەست نەخستنە ناو کاری منداڵەوە: دایکوباوك پێویستە پارسەنگێك دانێن بۆ تێکەڵکردنی کەسایەتیی خۆیان لەگەڵ کەسایەتیی منداڵەکەیان، ئەم پارسەنگە گرنگیەکی تایبەتی هەیە و کارێکی ئەوەندە ئاسان نییە، بەتایبەتی بۆ دایکوباوکێك جاری یەکەم کە بەزۆر بارودۆخ ئاشانین و هیچ شتێکی واشیان بەدەستەوە نیە کە بەراوردی پێبکەن، وازهێنان لەمنداڵ بۆ ئەوەی خۆی چارەسەری گیروگرفتەکانی خۆی بکات کارێکی سەرەکی پەروەردەکارە و ئامادەکردنی منداڵە بۆ ژیانی دواڕۆژ و ڕێزگرتنی کەسایەتیی منداڵەکە، بەم ڕێزگرتنە منداڵ پێئەگات و ئەگەشێتەوە و کە ئەمەش ئامانجی پەروەردەکارە، ئەمە مانای ئەوە نیە کە دایکوباوك خۆیان لەبەرپرسیاری بکێشنەوە و

لەکاتێکدا ئەزانن منداڵەکان پێویستییان پێیانە خۆیان گێل بکەن، بەڵکو مانای ئەوەیە کە هەمیشە هەنگاوێك لەدوای منداڵەکەیانەوە بن ئەوەندە بێت کە منداڵەکە کەوت بتوانن بیگرنەوە.

## گوێگرتن و قسەکردن بۆ منداڵ

ئەم باسە بۆچی؟

لەماوەی ساڵەکانی ڕابردوودا چەند جارێك داوامانلێکراوە کە لەسەر باسی گیروگرفتی ناوخێزان و مێرد منداڵان شتێك ئامادە بکەم، لەڕاستیدا ئەمکارە ئەوەندە سادەو ئاسان نیە، ئەمەش لەبەرئەوەی کە لەمبارەیەوە هیچ لێکۆڵینەوەیەك نەکراوە لەکۆمەڵگای ئێمەدا و گیروگرفتەکانیش ئەوەندە زۆرن کە پێویستیان بە شارەزایانی زۆر هەیە بۆ ئەوەی لەبارەیانەوە کاربکات، جابۆیە بەباشمزانی کە بگەڕێن بەدوایی شتێکی هاوبەشدا کە هەموو مێرد منداڵان و دایکوباوك بگرێتەوە و سوودی لێوەربگرن.

ئەگەر بمانەوێت گیروگرفتەکانی ئەم قۆناغە بەشبکەین بەبەشی جیاوازە وە بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوە ئەوا ئەتوانین بڵێین کە ئەم گیروگرفتانە لەسێ جۆر گیروگرفت پێکهاتووە:

هەندێك لەو گیروگرفتانە تایبەتن بەم قۆناغەوە و هەموو خێزانێك هەمان گیروگرفتیان تووش ئەبێت و گیروگرفتەکە و چارەسەرەکانیان گرنگ بۆ پێشکەوتن و گەشەکردنی هەست و نەست و کەسایەتیی منداڵەکە و بڕینی ئەم قۆناغە بەسەرکەوتوویی بۆ قۆناغی گەنجایەتی، بەپێچەوانەوە هەڵەکردن لەچارەسەریاندا ئەبێت بەهۆی زۆر گیروگرفت بۆ خێزان و منداڵەکەش لەدواڕۆژدا.

هەندێکیتر لەم گیروگرفتانە پەیوەندی بە شێوەی پەروەردەی منداڵەکەوە هەیە لەژیانی منداڵیدا چارەسەریان ئەبێت لەوێوە دەستپێبکرێت، هەندێکی تر لەم گیروگرفتانە گیروگرفتی منداڵەکە خۆیەتی و ئەبێت خۆی چاریان بۆ بدۆزرێتەوە و ڕۆڵی خێزان لەوەدایە کە تەنها یارمەتیدەر بن کاتێك منداڵەکە داوایان لێئەکات.

جا باسێك کە بتوانێت ئەم گیروگرفتانە و چارەسەرەکانیان بگرێتەخۆی کارێکی ئەوەندە ئاسان نیە، بۆیە گەڕام بەدوای باسێکدا کەهۆی سەرەکی هەموو گیروگرفتەکان بێت و هاوبەش بێت بۆ هەموو دایکان و باوکان و چارەسەرەکەشی بداتە دەست خاوەنەکەی (دایکوباوك) کە بەپێی توانا هەوڵبدات چارەسەریان بکات.

زۆربەی زۆری گیروگرفتەکانی ئەم قۆناغە و قۆناغەکانی پێشوش پەیوەندی بە جۆری دیالۆگەوە (قسەکردن و گوێگرتن)ەوە هەیە لەناو خێزانداو لەگەڵ منداڵدا، ئەمەش لەخۆلاسەی پەرتوکەکەی (Tomas Gordon) بەناوی (Aktivt FŐrĂldraskap) وەرمگرتووە و خستومەتە شێوەی کوردیەکی سادە کە دایکوباوکی کورد بتوانن سوودی لێوەرگرن و زانیاریەکی بەکەڵکی هەبێت بۆ پیاچونەوەی شێوەی قسەکردن و گوێگرتن لە منداڵەکەیان و هەوڵبدەن بەمبۆنەیەوە مەشق لەسەر شێوەی جیاواز بکەن، چونکە تەنها زانیاریەکە بەس نییە بۆ ئەوەی مرۆڤ بگاتە ئەنجامێکی باشتر لەپەیوەندیدا لەگەڵ منداڵەکەی، بەڵکو پێویستە مەشقی لەسەر بکەن لەگەڵ کەسانی دەوروبەردا کە لەهەمان بارودۆخدان ئاڵوگۆڕی بیروڕای خۆیان بکەن.

هیوادارم ئەم باسە بناغەیەك بێت بۆ دروستبوونی دیالۆگێکی پەروەردەیی لەخێزاندا و ببێت بەهۆی کەمکردنـەوەی گیروگرفتی نێوان دایکوباوك و منداڵ کە گرنگترین و پیرۆزترین کار ئەنجام ئەدەن لە پەروەردەی منداڵەکانیان و لەهەر هەنگاوێکدا بەردی بناغەی دوارۆژێکی باشتر بۆ گەلەکەیان دائەنێن.

## چۆن گوێئەگریت بۆ ئەوەی منداڵەکەت قسەت بۆ بکات؟

یەکێك لەو گیروگرفتانەی کە دایکوباوك تووشـی ئـەبن لەتەمـەنی مێـرد منـداڵی منداڵەکەیانیانـدا ئەوەیـە کـە منداڵەکان ئیتر قسەیان بۆ ناگێڕنەوە وەکو جاران و دڵ و دەروونی خۆیان بۆ دایکوباوك باس ناکەن، هۆی ئەمە ئەوەیە کە منداڵەکان گەیشتونەتە ئەو قەناعەتەی کە ئیتر سوودی نییە کە قسەیان بۆ بگێڕنەوە یان ئەگەر بیروڕای خۆشـیان دەربڕن لەوانەیە تووشی ئازار و ئەشکەنجە ببن، بـەم هۆیـەوە دایکوبـاوك هـەزارو یـەك شانسـی لەدەسـت ئەچـێت و پەیوەندی بەینیان وردە وردە کەم ئەبێتەوە و نامێنێ.

بۆچی دایکوباوك خەفەتی ئەوە ئەخۆن کە منداڵەکان قسەیان بۆ ناگێڕنەوە؟ بۆچی منداڵـەکان واز ئـەهێنن لـەوەی ئیتر دڵ و دەروونی خۆیان بۆ دایکوباوك بکەنەوە؟ بۆچی دایکوباوك ناتوانن ئەو پەیوەندیەی کە جـاران هـەیانبوو بـە منداڵەکانەوە بپارێزن و یارمەتیدەری منداڵەکان بن؟ بۆچـی منداڵـەکان هەسـت ئەکـەن کـە ئاسـانترە قسـە لەگـەڵ هاورێکانیان یان دکتۆرێکی دەروونی بکەن لەبارەی هەست و نەسـتیانەوە؟ ئـەم هـاورێ و دەروون شـیکەرەوانە چـی ئەکەن کە ئەتوانن ئاوا پەیوەندی دروستبکەن لەگەڵ منداڵەکاندا کەچی دایکوباوك ناتوانن؟

لەم ساڵانەی دواییدا دەروون شیکەرەوەکان وەلامـی هەنـدێك لـەم پرسـارانەیان دەسـتکەوتووە بـەهۆی پشـکنین و پراکتیکەوە توانیویانە تێبگـەن لـەوەی پێویسـت و یارمەتیـدەرە بـۆ پەیوەندیەکـە، پشـکنینەکان دەریخسـتووە کـە لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە کە پێی ئەوترێت (قبوڵکردن) بـەمانای ئـەوەی قسـەکردن لەگـەڵ منداڵەکـەدا بەوشـێوەی کەپیشانی ئەدات کە ئێوە (دایکوباوك) منداڵەکە قبوڵ ئەکەن.

## بۆچی ئەمە ئەوەندە گرنگە؟

کاتێك کە مرۆڤێك ئەتوانێت وا لە مرۆڤێکی تر بکات کە ئەم قبوڵی ئەکات وەکو خۆی و تێئەگات، ئەوسا ئەویش خۆی بۆ ئەکاتەوە و ئەمیش ئەتوانێت یارمەتی بدات، ئەم قبوڵکردنەی کەسـێکی تـر وەکـو خـۆی بـەردی بناغـەی پەیوەندیەکە کە ئەو کەسە تێیـدا (لەپەیوەندیەکـەدا) ئەگەشـێتەوە و پێئـەگات و ئـەتوانێت خـۆی بگۆڕێـت بـەرەو تەندروستیەکی دەروونی باشتر و ببێت بە بەرهەمهێنەرێکی بەکەڵك و خەونەکانی خۆی بهێنێتـەدی، ئەمـە شـتێکی

ساده و دژ بەیەکە لەهەمانکاتدا، مرۆڤێك پێویستە هەست بکات کە قبولْ ئەکرێت وەکو خۆی ئەوسا ئەتوانێت خۆی ڕزگار بکات و بیر لەگۆڕان و پێشکەوتن بکاتەوە کە خۆی ئەیەوێت.

هەستی قبولْکردن وەکو زەمینەیەکی باش وایە بۆ نەمامێك کە وای لێئەکات گەورە بێت و ببێت بەو گولْە جوانەی کە تۆوەکە توانای هەیە ببێت، خاکەکە تەنها هەلومەرجی پێگەیشتنەکەی بۆ ئامادە ئەکات کە پێبگات و ببێت بەگولْەکە، ئەم زەمینەیە تەنها تۆوەکە ئامادە ئەکات و تواناکەی لەخودی تۆوەکەدا خۆی هەیە، بەهەمان شێوەش منداڵێك توانای پێشکەوتنی تێدایە وەکو تۆوەکە و قبولْکردنەکە وەکو زەمینەکە وایە بۆی، ئەم قبولْکردنە یارمەتی منداڵەکە ئەدات کە تواناکەی پێشبخات.

## بۆچی قبولْکردنی دایکوباوکەکە کاریگەریەکی وای هەیە بۆ سەر پێشکەوتنی منداڵەکە؟

ئەم ڕاستیە زۆرجار لەلایەن دایکوباوکەوە لەبیرئەکرێت، زۆربەی زۆری مرۆڤ بەوە پەروەردە بووە کە ئەگەر هەر لەئێستاوە هەموو شتێك لە منداڵەکەیان قبولْ بکەن، ئەوە منداڵەکە کە گەورەش بوو هەروا ئەکات وەکو خۆی ئەیەوێت و بەقسەی ئەمان ناکات، بۆیە وا بیرئەکەنەوە کە باشترە هەر لەئێستاوە بۆی باسبکەن کە ئەمان چیان پێخۆشە و چیان پێناخۆشە بۆ ئەوەی منداڵەکە وا بێت وەکو خۆیان ئەیانەوێت، جا لەبەرئەوەی ڕێگای (قبولْنەکردن) ئەگرنەبەر، ئەو بناغەیەی کە دایکوباوك منداڵەکەی لەسەر پەروەردە ئەکەن پڕە لەشتی پیرۆز و ڕەخنە و مۆراڵ (ڕەوشتی بەرز) و ئاگادارکردنەوە و بەسەر داسەپاندن و ..... هتد، هەموو ئەم دەربڕینانە نیشانەیە بۆ منداڵەکە کە ئەمان ئەوە قبولْ ناکەن، ئەگەر وانەکات وەکو ئەوان ئەیانەوێت.

### کچێکی سیانزە ساڵان ووتی:

هەرجارێك کە قسەیەکیان بەقسە نەکەم پێمئەڵێن کە من چەند خراپم، پێمئەڵێن کە چەند بیروڕای شێتانەم هەیە و پێمئەڵێن کە ئەوان ناتوانن بڕوام پێبکەن، منیش بەردەوام شتی وا ئەکەم کە ئەوان پێیان ناخۆشە، خۆ ئەوان من بەخراپ و بێئەقلْ ئەزانن، جا بۆچی وانەبم وەکو ئەوان وا ئەزانن، خۆ ئەوان تێم ناگەن.

پەندێکی کۆن هەیە کەئەڵێت: (هەمیشە بە منداڵەکەت بڵێ کە بێئەقلْە و ئەو بێئەقلْە دەرئەچێت) کەواتە منداڵ وادرئەچێت وەکو دایکوباوك ئەڵێن وایە، هەروەها قبولْنەکردنە کە واله منداڵەکە ئەکات کە ئیتر ئەویش قسە لەگەڵ دایکوباوکی نەکات و بەباشتری ئەزانێت و خۆی بەدڵنیاتر ئەزانێت ئەگەر قسەکانی لەدڵی خۆیدا بهێڵێتەوە و دەری نەبڕێت، دەروونشیکەرەوەکان ئەم ڕاستیە باشئەزانن و بەچاپوکی بەکاری ئەهێنن لەگەڵ نەخۆشەکانیاندا، چونکە قبولْنەکردنەکە وا لە منداڵەکان ئەکات کە خۆیان بخەنە سوچی بەرگری لەخۆکردن و نارازی بن و بترسن و نەتوانن توانای خۆیان بەتەواوەتی بزانن، گەورەترین دەستکەوتی ئەم قبولْکردنە ئەوەیە کە منداڵەکە هەست ئەکات کە خۆشەویستە، کاتێك کەسێك قبولْئەکرێت وەکو خۆی نیشانەیەکی (خۆشەویستی ڕۆحی) یە، خۆشەویستی ڕاستیش وزەی مرۆڤ بەرەلائەکات و دەروونی ئەکاتەوە و هەست بەنرخی خۆیئەکات.

## پێویستە بسیەلمێنین کە منداڵەکانمان قبوڵ ئەکەین

جیاوازی هەیە لەنێوان ئەوەی کە ئێمە وەکو دایکوباوك ئەزانین کە منداڵەکانمان قبوڵ ئەکەین و لەنێوان ئەوەی کە منداڵەکانمان ئەزانن و هەست ئەکەن کە قبوڵیان ئەکەین، ئەگەر منداڵەکان ئەم قبوڵکردنەی دایکوباوك هەست پێنەکەن، ئەوە مانای ئەوەیە کە منداڵەکان لەم هەستەی ئێمە مەگەیشتون و هەستەکە کاری لەسەر نەکردون لەبەرئەوە وەکو دایکوباوك پێویستە مەشق لەسەر ئەمە بکەین و خۆشەویستیمان بەوشێوەیە دەربڕین کە ئەوان هەستی پێبکەن، ئەم هەست دەربڕینە لە قبوڵکردنی منداڵەکەوە وەکو خۆی و لەخۆشەویستی ڕاستەوە دێت.

هیچ گومانی تێدا نیە کە زۆربەی زۆری دایکوباوك هەستی خۆشەویستی بۆ منداڵەکەی دەرئەبڕێت، ئەم دایکوباوکانە گفتوگۆیەکی (سارێژکەر) ئەکەن لەگەڵ منداڵەکان و ئەوانیش تەندروستیان باشتر ئەبێت و کارێکی پۆزەتیڤ ئەکاتەسەر پێشکەوتنی ژیانیان، ئەم دایکوباوکانە ڕێگا بەمنداڵەکان ئەدەن کە هەست و نەستی خۆیان دەربڕن وەکو خۆیان ئەیانەوێت و هەستێك ئەدەن بە منداڵەکان کە ئەوان کرۆڤێکن و نرخی خۆیان هەیە و ئەویش نرخی خۆی لەلای خۆی زیاد ئەکات و ئەگەشێتەوە، ئەم دایکوباوکانە هەڕەشە و گوڕەشە ناکەن و هەوڵ ئەدەن لەترسی منداڵەکە کەمکەنەوە و گەشەکردنی منداڵەکە ئاسانتر ئەکەن و گۆڕانێکی پۆزەتیڤ بۆ منداڵەکە ئەنجام ئەدەن.

هەندێك دایکوباوك بەپێچەوانەوە، بەجۆرێکی وا قسە لەگەڵ منداڵەکان ئەکەن کەبریندارکەر و ڕوخێنەرە، هەستێك ئەدەن بە منداڵەکان کە گوناهبار و بێکەڵکن، ڕێگای هەست و نەستی ڕاستی لە منداڵەکانیان ئەگرن، هەڕەشەیان لێئەکەن و هەستی خۆیی منداڵەکان بریندار ئەکەن، بەمە ڕێگای گۆڕانێکی پۆزەتیڤ و گەیشتن بەپلەیەکی بەرزتر ئەگرن، بەوەی ئەیانخەنە باری پارێزگاریکردن لەخۆ.

هەندێك دایکوباوك توانایەکی سروشتیان هەیە بۆ گفتوگۆی پۆزەتیڤ لەگەڵ منداڵەکاندا و هەندێکی تر پێویستیان بە مەشقکردن هەیە بۆ ئەمە، ئەم دایکوباوکانە پێویستە واز لەو شێوە ڕوخێنەرە بهێنن لەپەیوەندیدا و فێری ئەوە بن کە بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ لەگەڵ منداڵەکانیاندا قسەبکەن، کەواتە لەپێش هەموو شتێکدا پێویستە بزانن (چۆن) قسە لەگەڵ منداڵەکانیان ئەکەن، بەمانایەکی تر چۆن قبوڵیان ئەکەن.

### 1. قبوڵکردن بەهۆی دەستنەخستنە ناو کاری منداڵەوە

دایکوباوك ئەتوانن بۆ منداڵەکەیان دەربڕن کە قبوڵی ئەکەن بەوەی کە دەستنەخستنەکارەکەیەوە .

بۆ نموونە:

منداڵێك ئەیەوێت خانویەکی قوڕ دروست ئەکات لەڕۆخی ئاوەکە و دایکوباوکیشی لەولاوە خەریکی کاری خۆیانن و واز لە منداڵەکە ئەهێنن کە کارەکەی خۆی بکات، ئەم دایکوباوکە پەیامێك ئەدەن بەمنداڵەکەیان کە (خانوەکەت

وەکو خۆت و بەهەوەسی خۆت دروست بکە) منداڵەکـە وا هەسـت ئـەکات (ئـەوەی مـن ئەیکـەم شـتێکی باشـە و دایکوباوکم پێیان خۆشە).

ئەم شێوەی دەستنەخستنە ناوکـاری منداڵەکـە شـێوەیەکی ئاشـکرایە بـۆ قبـوڵکردن بـەبێ قسـەکردن، هەنـدێك دایکوباوك نازانن کە دەست خستنە ناوکاری منداڵەکەوە نیشانەیەکە بۆ قبوڵنەکردنی منداڵەکە، ئەمانـە ئەیانـەوێت بەزۆر بچنە ناو دونیای تایبەتی ژیان و بیری منداڵەکەوە و گوێ بەپێویستی منداڵەکـە نـادەن کـە ئەیـەوێت سـاتێك بەتەنها بێت و ئەوەی خۆی ئەیەوێت بیکات، دایکوباوك ئەیانەوێت کە منداڵەکەیان شت فێربێـت (قەڵایـەکی ڕاسـت وائەبێت) ئەم دایکوباوکە پێویستیان بەوەیە کە منداڵەکەیان بەڕاستی شت فێربێت (قەڵاکە دوور لە ئاوەکە دروسـت بکە با نەڕوخێت) ئەم دایکوباوکانە ئەیانەوێت شانازی بەمنداڵەکەیانـەوە بکـەن (سـەیرکە چـەند قەڵایـەکی جـوانی دروستکردووە) ئەم دایکوباوکانە ئەیانەوێت تێگەیشتنی گەورەکان بەسەر منداڵەکانـدا بسـەپێنن (قەڵاکـەت سـەری نیە) ئەم دایکوباوکانە هیوای نهێنیان هەیە بە منداڵەکان (تۆ قەد فێری شتێکی تر نابیت ئەگەر هەر خەریکی یـاری بیت) ئەم دایکوباوکانە لەوە ئەترسن کـە خـەڵکی ئـەڵێت چـی (ئـەتوانێت قەڵایـەکی باشـتر بکـەیت ئەگـەر زیـاتر هەوڵبــدەیت) ئــەم دایکوباوکانــە هەســت ئەکــەن و ئەیانــەوێت کــە منداڵــەکانیان پێویســتی پێیــان بێــت (با بابە یارمەتیت بدات).

هەموو ئەمانە غەم و پەژارە و دڵەڕاوکێی دایکوباوك دەرئەخات و ئەو پەیامە خراپە ئەدات بە منداڵەکە کـە ئـەو کارەی ئەو ئەیکات ناپەسەندە و ئەمان پێی ڕازی نین، منداڵەکەش هەستی خۆ بەکەمزانین و لەخۆڕازینـەبوونی تێـدا دروست ئەبێت و ناتوانێت پێشبکەوێت، کەواتە دەستنەخستنە ناوکاری منداڵەکەوە کاتێك خەریکی کـاری خۆیـەتی نیشانەیەکە بۆ منداڵەکە کە کارەکەی پەسەندکراوە و ئــەمان لــێیڕازین، بـەڵام دەستخســتنە ناوکـاری منداڵەکـەوە، منداڵەکە ناچار ئەکات کە پێمان بڵێت (تۆ هەقت نەبێت بەسەرمنەوە).

ئەم نمونەیە و سەدەها نمونەی وا لەژیانی ڕۆژانەی خێزاندا هەن کە دایکوباوك و منداڵ ئەگەیەنێتە ئەو ڕادەیـەی کـە ئیتر نەتوانن پەیوەندی لەگەڵ یەکدا بکەن، چونکە هەرجارێك کە منداڵەکە ئەیـەوێت کارەکـەی خـۆی خـۆی بیکـات دایکوباوك خێرا سەرکردایەتی ئەگرتەدەست و بەوشێوەیە ئەیکەن کە خۆیان ئەیانەوێت نەك بەوشێوەیەی کە منداڵەکە ئەیەوێت، ئاوات و ئامانج و هەست و نەستی خۆیان دەرئەبڕن نەك هینی منداڵەکە، هیواکانی خۆیان ئەهێننەدی نەك هینی منداڵەکە، پەیامێك ئەدەن بەمنداڵەکە کـە کارەکـانی ئـەویان بـەدڵ نیـە و ئـەو ناتوانێـت ئەوشـتانە بکـات لەبەرئەوە ئەبێت ئەمان بۆی بکەن.

## 2. گوێگرتن نیشانەیەکی تری قبوڵکردنە

بێدەنگی و گوێگرتن نیشانەیەکی تری قبوڵکردنەە ئەم بێدەنگی و گوێگرتنە پێیەوترێت (گوێگرتنی پاسیڤ) ئەمـە پەیامێکی پێویستە و بەچاکی ئەتوانرێت بەکاربهێنرێت بۆ ئەوەی کە مرۆڤەکـەی بەرامبـەرت هەسـت بکـات کـەتۆ قبوڵی ئەکەیت، ئەم بێدەنگی و گوێگرتنە پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی هەیە بەکولتوری گەلانـەوە و جێگـۆڕکێی ئەمـە لەکولتورێکەوە بۆ کولتورێکی تر لەوانەیە مانایەکەی پێچەوانە بدات بەدەستەوە، گـەلانی ئێمـەو دەوروبـەرمان کـە

کولتورمان لەیەکەوە نزیکە، قبوڵکردنی بەرامبەرەکەمان بەوردە قسەو کۆمنتار و لەسەرکردنەوە و پرسیارکردن و ناڕەزایی دەربڕین بەناهەمواری کارەکە و تەئیدکردنی قسەکەرەکە دەرئەبڕین و خۆمان ئەخەینە لایەنی ئەو و جاری واش هەیە ئەوەندی تر هەڵیئەدەین و خۆمان ئەکەین بە کەسی یەکەم لەباسەکەدا، ئەمە بەشێکە لەکولتوری ئێمە و پێویستمان بەلێکۆڵینەوە هەیە لەمبارەیەوە.

گوێگرتن لەکەسێك کە بیەوێت هەستونەستی خۆی دەربڕێت و گوێگر بتوانێت هەستونەستەکە بگەیەنێتە ئەنجام و سودێکی گیانی و دەروونی بدات بەخاوەنەکەی هونەرێکی گەورەیە و پێویستی بە مەشقکردن هەیە، لەڕاستیدا هونەرەکە لەوەدایە کە هەرجارێك کە قسە بە قسەکەرەکە ئەبڕێت بە (کۆمەنتار و ڕەخنەو تەئییدکردن و.. هتد) دەرگایەك لەسەر قسەکەرەکە دائەخەیت و ڕێگای لێئەبەستیتەوە کە قسەکانت بۆ بکات و پەیامێکی ئەدەیتێ کە (خەتای خۆیەتی جیابۆ وا ئەکات، من بومایە وامئەکرد..... هتد) ئەمانەش مانای ئەوەیە کە تۆ قبوڵی ناکەیت و شتەکانی و هەستەکانی هەڵەن.

بەڵام لەپەیوەندی کۆمەڵایەتیدا و لەناو خێزاندا دایکوباوك ناتوانن بەتەنها گوێبگرن و قسەنەکەن، چونکە گفتوگۆیەکی گەرم و زیندو پێویستی بە هەردوولا هەیە کە بەشداری تێدا بکەن، لەبەرئەوەی قسەکردنەکە ئامێری پەیوەندیەکەیە، بەڵام دایکوباوك چۆن قسە لەگەڵ منداڵەکان ئەکەن ڕۆڵێکی گرنگی هەیە، لەم باسەدا گرنگیەکەی ڕوون ئەکەینەوە.

بالێرەدا چەند تاقیکردنەوەیەك بکەین و بزانین دایکوباوك چۆن وەڵامی منداڵەکان ئەدەنەوە و چۆن وەڵامەکە کاری چاك یان خراپ ئەکاتەسەر پەیوەندیەکە، لێرەدا دایکوباوکانی خوێنەوار ئەتوانن خۆان تاقیبکەنەوە و وەڵامەکانیان بنوسنەوە پێشئەوەی روونکردنەوەکانی ناو پەڕتوکەکە بخوێننەوە.

### نمونەی یەکەم:

منداڵە پانزە ساڵانەکەت ئێوارەیەك دێتەلات و ئەڵێت:

قوتابخانە تەنها بۆ بێئەقڵەکانە، ئەوەی کە لەقوتابخانە فێرئەبین بێسوود و بێکەڵکە و لەدواڕۆژدا پێویستمان پێی نییە، من بڕیاری خۆمداوە کە نەچمە قوتابخانەی ئامادەیی، خۆ مەرج نیە ئامادەیی بخوێنیت بۆ ئەوەی کارت دەستبکەوێت، زۆر ڕێگای تر هەیە کە پیاو ئەتوانێت کاری دەستبکەوێت.

### نموونەی دووەم:

کچە دەساڵانەکەت هات و ووتی:

نازانم خەتی چیمکردووە، جاران شیلان منی خۆشئەوێت بەڵام ئێستا منی خۆشناوێت و نایەت بۆ ئێرە و یاریم لەگەڵ ناکات، کە ئەشچم بۆ ماڵی ئەوان ئەو هەر یاری لەگەڵ بینایی ئەکات، ئەوان بەیەکەوە یاری ئەکەن و منیش هیچ، بۆخۆم لەولاوە بەتەنها دائەنیشم، ئای چەند ڕقم لەهەردووکیانە.

**نموونەی سێهەم:**

منداڵە پێنج ساڵانەکەتان زۆر بێتاقەتە لەسەر نانخواردن و ئێوە خەریکی قسەکردنن لەگەڵ میوانەکەتاندا و ئاگاتان لەو نەماوە کە چەند جارێك بانگیرکردوون و ئێوە نەتانتوانیوە وەڵامی بدەنەوە، لەدوای ئەوە کە ئەتەوێت قسەی لەگەڵ بکەیت، ئەو توڕەیە و نایەوێت قسەت لەگەڵ بکات.

**نمونەی چوارەم:**

بۆچی هەرمن ئەبێت ژوورەکەی خۆم ڕێکبخەم، دایکی ئاسۆ قەد شتی وای پێناڵێت و ڕۆژانەی خۆشی هەر هەیە، منداڵ پێویستی بەوە نییە ئیشی ناوماڵ بکات.

زۆربەی زۆری ئەو وەڵامانەی دایکوباوك نەیانداوەتەوە ئەتوانین لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆیبکەینەوە:

1. ئەمری پێئەکەیت، شتی لێقەدەغە دەکەیت، پێیئەڵێیت چیبکات و چی نەکات.

أ. من هەقی دایکوباوکی خەڵکی ترم نیە.

ب. ئاوا قسە لەگەڵ دایکوباوك ناکرێت.

ج. ئێستا ئەڕۆیت و یاری لەگەڵ شیلاندا ئەکەیت.

2. ئاگاداری ئەکەیتەوە (warning) بیریئەهێنیتەوە، هەڕەشەی لێئەکەیت، بەمنداڵەکان ئەڵێیت چی ڕوودەدات ئەگەر وانەکەن و چ سزایەك ئەدرێن.

أ. ئەگەر وابکەیت پەشیمان ئەبیتەوە.

ب. جارێکی تر وابکەیت ئەتکەمە دەرەوە.

ج. باشتروایە واز لەم بیرە بهێنیت، ئەگەر ئەتەوێت ڕزگارت ببێت.

3. بۆیان ڕاست ئەکەیتەوە، باسی مورالّیان بۆ ئەکەیت، ئامۆژگاریان ئەکەیت، بەمنداڵەکان ئەڵێیت کە ئەبوایە چیبکەن.

أ. پیاو ئاوا ئەکات.

ب. قەت فێرنابیت بەقسەم بکەیت.

ج. ئەبێت ڕێزی گەورەکان بگریت.

4. پێشنیاریان بۆ ئەکەیت، تەنگوچەڵەمەیان بۆ چارەسەر ئەکەیت. وەڵام و چارەسەری تەنگوچەڵەمەیان بۆ ئەدۆزیتەوە.

أ. بچۆ قسە لەگەڵ مامۆستاکەت بکە.

ب. ساڵێکی تریش چاوەڕێ بکە، ئەوسا بڕیار بدە کە ئەخوێنیت یان نا.

ج. داوا لەشیلان و بینایی بکە کەبێن و لێرە یاری بکەن، یان یاری لەگەڵ منداڵانی تر بکە.

5. دەرسیان دائەدەیت: هەوڵ ئەدەیت بەفاکتە منداڵەکان ڕازی بکەیت و بەقسەی مەنتقی و ئـەرگومێنت و قـیم و ئەخلاقی خێزان

أ. ژیانی ئامادەیی خۆشترین ژیانە کەتۆ لەدەستت ئەچێت.

ب. منداڵ ئەبێت فێرببێت بەیەکەوە یاری بکات.

ج. بیرەلەوە بکەرەوە کە دایە پێویستی بەیارمەتی هەیە.

د. ئەگەر بەمنداڵی شتەکانت کۆبکەیتەوە کە گەورەش بوویت فێر ئەبیت.

هـ. کاتێك کە من منداڵ بووم دوو ئەوەندەی تۆ ئیشمئەکرد.

6. ڕەخنەیان لێئەگریت، خـەتاباریان ئەکـەیت، هەڵسـەنگاندنێکی نێگەتیڤـە ئـەدەیت بەمنداڵـەکان و لـەنرخیان کەمئەکەیتەوە.

أ. تۆ بەڕوونی بیرناکەیتەوە.

ب. کە منداڵێکی بێئەقڵیت.

ج. ئەمەی تۆ ئەیڵێیت هەڵەیە.

د. تۆ هیچ نازانیت بۆیە وائەڵێیت.

7. مەدحیان ئەکەیت، حەزەکانت یەکئەخەیت لەگەڵ حەزەکانی ئەواندا، هەڵسەنگاندنێکی پۆزەتیڤیان ئەدەیتێ.

أ. تۆ کچی باشیت.

ب. تۆ بەئاسانی ئەتوانیت ئەمە بکەیت.

ج. تۆ ڕاست ئەکەیت.

د. منیش هەروەکو تۆ وابووم بەمنداڵی.

8. تانەیان لێئەدەیت، گاڵتەیان پێئەکەیت، واله منداڵەکان ئەکەیت کە هەست بکەن کە گاڵتـەجاڕن و لـەقاڵبێکی تایبەتیدا دایانئەنێیت، هەستی شەرمنیان تێدا بەهێز ئەکەیت.

أ. تۆ منداڵێکی زۆر بێشەرمی.

ب. ئەتەوێت خۆت بەزیرەك نیشان بدەیت؟

ج. تۆ کەرانە هەڵسوکەوت ئەکەیت.

9. بۆیان ڕونئەکەیتەوە، شیکردنەوە و پشکنینیان بۆ ئەکەیت:

بۆ منداڵەکان باسئەکەیت کەتۆ ئەزانیت بۆ وائەکەن.

أ. تۆ بەغیلیت بەشیلان دێت.

ب. تۆ وائەڵێیت بۆ ئەوەی تورەم کەیت.

ج. لەڕاستیدا تۆ خۆت بڕوات بەمە نیە.

د. واهەست ئەکەیت کەتۆ باش نیت لەقوتابخانەدا.

10. دڵنەوایی ئەکەیت، یارمەتیی ئەدەیت، ئەیهێنیتەوە سەرخۆ: هەوڵ ئەدەیت کە منداڵەکە هەست بکات بەوەی کە باشترە لەوەی کە خۆی ئەیزانێت و هەستە ناخۆشەکانی لەبیرئەبەیتەوە.

أ. بەیانی چاك ئەبیت.

ب. هەموو منداڵێك واهەست ئەکات لەو تەمەنەدا.

ج. خەفەت مەخۆ خۆی چاك ئەبێت.

د. منیش جاران وامئەزانی.

هـ. ئەزانم قوتابخانە جاری واهەیە کە ناخۆشە.

11. پرسیاری لێئەکەیت لێپرسینەوەی لەگەڵ ئەکەیت، هەوڵئەدەیت کەهۆی تەنگوچەڵەمەکە بزانیت و گرفتەکە چارەسەر بکەیت.

أ. کەی هەستت بەمەکرد؟

ب. بۆچی ڕقت لەقوتابخانەیە؟

ج. قوتابیەکانی تر شتی وا ئەکەن؟

د. پرسیارت کردووە کە ئەوان لەماڵەوە هاریکاری ناکەن؟

هـ. کێ ئەم بیرە شەیتانیەی خستۆتە سەرتەوە؟

و. چی ئەکەیت ئەگەر لە ئامادەیی نەخوێنیت؟

12. خۆت ئەدزیتەوە لەوەڵام، منداڵەکە سەرقاڵ ئەکەیت بەشتێکی ترەوە، گاڵتە بەقسەکانی ئەکەیت؟

أ. ئاە گوێمەدەرێ.

ب. باباسی ئەمە نەکەیت ئێستا.

ج. گویچگرە باباسی شتێکی خۆشت بۆ بکەم.

د. ئەرێ لەفوتبۆڵێندا چۆنی؟

هـ. جا بۆ ناچیت قوتابخانەکە بسوتێنیت.

و. من ئەمانەم پێشتریش گوێلێبوە، هیچ نیە.

زۆربەی زۆری دایکوباوك ئەم وەڵامانە ئەدەنەوە بەمنداڵەکانیان بەبێ ئەوەی بزانن کە ئەم وەڵامانە هەستێك ئەدات بە منداڵەکان کە ئاوایە:

أ. تۆ ئەتوێت من خۆم بگۆڕم و ناتەوێت واهەست بکەم.

ب. تۆ بڕواناکەیت کە من خۆم ئەتوانم ئەم گرفتە چاربکەم.

ج. تۆ هەست ئەکەیت کە خەتای خۆمە.

د. تۆ بڕواناکەیت کە منیش وەکوتۆ تێئەگەم.

هـ. تۆ هەست ئەکەیت کە من ناهەقیم کردووە.

و. تۆ گرفتەکەی من بەگرنگ نازانیت.

ز. تۆ ن قبوڵناکەیت وەکو خۆم.

ح. تۆگوێنادەیت بەوەی من چۆن هەست ئەکەم.

کاتێك دایکوباوك (شتێك بە منداڵەکەی) ئەڵێت، لەهەمانکاتدا (شتێك لەبارەی منداڵەکەیەوە) ئەڵێت، جابۆ بەگفتوگۆ لەگەڵ منداڵدا کاریگەریەکی ئەوەندە گرنگە، هەم بۆ کەسایەتیی منداڵەکە و هەم بۆ پەیوەندی نێوانیان هەرجارێك کە تۆ قسە لەگەڵ منداڵەکەت ئەکەیت، بەردێك ئەخەیتەسەر بناغەی پەیوەندیەکەتان، هەر پەیامێك ئەدەیت بە منداڵەکەت، شتێك ئەڵێیت لەبارەی ئەوەی کە تۆهەستت چیە بەرامبەری بەو شێوەیە منداڵەکان ئەو وێنەیە دروست ئەکەن بۆخۆیان کە ئێمە چۆن سەیریان ئەکەین، کەواتە قسەکردن لەگەڵ منداڵدا چۆن بناغە دائەنرێت (Konstruktiv) بۆ پەیوەندی نێوانتان بەهەمان شێوەش لەوانەیە ڕوخێنەر (Desturaktiv) بێت.

بۆئەوەی باشتر لەم دوانزە وەلآمە بگەین، بابگەڕێینەوە بۆ پەیوەندی نێوان گەورەکان خۆیان و بزانین چۆن ئەم وەلآمانە کارئەکەنە سەر پەیوەندی نێوانیان، کاتێك کە تۆ گرفتێك بۆ هاوڕێکەت باسئەکەیت و ئەم وەلآمانەت ئەداتەوە، تۆ چۆن هەست ئەکەیت، ئەم وەلآمانە وا لەتۆ ئەگەیەنێت کە:

1. ئەو واملێئەکات کە ئیتر قسە نەکەم.
2. ئەو واملێئەکات کە دژی بوەستمەوە.
3. ئەو واملێئەکات کە هەقیلێبکەمەوە.
4. وا هەست ئەکەم کە بێئەقڵ و نەفامم.
5. ئەو واملێئەکات کە خۆم بەگوناهبار بزانم.
6. زۆر ملێئەکات کە بیروڕای خۆم بگۆڕم و وەکو ئەو بکەم.
7. بڕوام پێناکات کە من ئەتوانم کارەکەی خۆم بکەم.
8. وائەزانێت لەگەڵ منداڵدا قسە ئەکات.
9. تێمناگات.
10. هەروەکو هەستونەستەکانم هەق نەبن.
11. ئەو هەر قسەکانی پێئەبڕیم.
12. لەوە ئەچو کە تحقیقم لەگەڵ بکات.
13. وادیاربوو کە بەلایەوە گرنگ نیە.

کەواتە چۆن ئەم وەڵامانە کارێکی خراپ ئەکاتەسەر پەیوەندی نێوان تۆ و هاوڕێکەت، ئاواش کارئەکاتەسەر پەیوەندی نێوان تۆ و منداڵەکەت، کەواتە ئەم وەڵامانە چارەسەر کەرنین بەڵکو ڕوخێنەرن، جابۆیە باشتر وایە وەڵامی وابەکاربهێنین کە یارمەتی گفتوگۆکە بدات والە منداڵەکە بکات کە هەستونەستی خۆی دەرببڕێت، بۆ ئەمەش هەندێك وشەهەن کە پێیانئەوترێت وشەی (دەرگاکەرەوە).

## دەرگاکەرەوە

یەکێك لە باشترین و بەکەڵکترین وەڵام بۆ ئەوەی منداڵەکەت هەستونەست و گرفتەکانی خۆیت بۆ دەرببڕێت و بەردەوام بێت لە قسەکانیدا (وشە دەرگاکەرەوەکانە) یاخود ئەو وشانەی کە داوا لەمنداڵەکە ئەکات کە بەردەوام بێت لەقسەکردن، ئەم وەڵامانە هیچ لە هەستونەست و ڕاوبۆچوون و هەڵسەنگاندن و ڕێنیشاندان و ڕەخنەو ڕێنمایی لەگەڵ تێکەڵ نییە و واز لەمنداڵەکە ئەهێنێت بۆ ئەوەی چی پێخۆشە و چۆن ئەیەوێت هەستەکانی دەربڕێت، بۆ نموونە:

- ❖ ئاها.
- ❖ تێئەگەم.
- ❖ ئێ چیبوو دوایی.
- ❖ وائەزانیت؟
- ❖ بەڵێ.
- ❖ ئێ بۆم باسکە بابزانم.
- ❖ ئادەی، داوایی چی بوو.
- ❖ حەزئەکەم بزانم بیروڕای تۆ چیە؟
- ❖ لەوە ئەچێت کە ئەمە زۆر گرنگ بێت بۆتۆ؟
- ❖ ئادەی بۆم باسکە جارێکی تر.
- ❖ لەوە ئەچێت ئەمە زۆرکاری تێکردبێت؟
- ❖ ئەی دوایی؟

ئەم دەرگاکە رەوانە پەیوەندی ئاسان ئەکات لەگەڵ بەرامبەرەکەدا و هانیئەدات کەلەسەر قسەکانی بڕوات، ئەمانە وائەکات کە قسەکەرەکە سەری گوریسەکەی بەدەستەوە بێت و نەترسێت لەوەی کەتۆ قسەکانی پێببڕێت، ئەم دەرگاکەرەوانە وائەکات کە (هەستونەست و ئاگاداری و ڕەخنە....هتد) ی تۆ کارنەکەنەسەر پرۆسێسی گفتوگۆکە.
مرۆڤ سەریسوڕ ئەمێنێت لەئەنجامی ئەم گوێگرتنە و ئەبینێت کە چۆن قسەکەرەکە بڕوای بەخۆی زیاد ئەکات و هەست ئەکات کە ئەم کسێکە کە خەڵکی گوێیلێئەگرن و نرخی خۆی لەلا زیاد ئەبێت و بەئاسانی لێت نزیك

ئەبێتەوە و دڵی خۆی ئەکاتەوە، ئەم دەرگاکەرەوانە هەستێك ئەدات بە منداڵەکە کە قبوڵ ئەکرێت و وەکو مرۆڤێك مامەڵەی لەگەڵ ئەکرێت، ئەمە وەکو ئەوە وایە کە پێیبڵێیت:

- تۆ هەقی خۆتە کە هەستونەستی خۆت وەکو خۆی دەربڕێت.
- من ڕێزی تۆ ئەگرم وەکو تاکە کەسێك کە بیروڕای خۆی هەیە.
- لەوانەیە من لەتۆوە شتێك فێرببم.
- بەڕاستی شتێکی بەکەڵکە کە گوێ لەقسەکانت ئەگرم.
- من گرنگی بەتۆ ئەدەم.
- من ئەمەوێت زیاتر بناسم و تێبگەم.

کێ هەیە بە پۆزەتیڤی بەرامبەر ئەم ڕەفتارانە ئەبێتەوە؟ چ گەنجێك هەیە هەست بەگرنگی خۆی نەکات کاتێك ڕووبەڕووی ئەم جۆرە گرنگی پێدانە ئەبێتەوە؟ چونکە منداڵ هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەورەکان لەم ڕووەوە بگرە بەپێچەوانەوە، ئەمان زیاتر پێویستیان بەم جۆرە گرنگیپێدانە هەیە، چونکە ئەمان جارێ لەخۆیان سەرپشك نین و ئەبێت بۆیان بسەلمێندرێت کە ئەمان گرنگن.

کەواتە چۆن ئەم 12 وەڵامانە کارێکی خراپ ئەکەنەسەر پەیوەندی نێوان تۆ و هاوڕێکەت، ئاواش کار ئەکەنەسەر پەیوەندی نێوان تۆ و منداڵەکەت، کەواتە ئەم وەڵامانە چارەسەرکەر نین و ڕوخێنەرن، جابۆیە باشتر وایە وەڵامی وابەکاربهێنێت کە یارمەتی گفتوگۆکە بدات واله منداڵەکە بکات کە هەستونەستی خۆی دەربڕێت.

## گوێگرتنی ئەکتیڤ

دەرگا کەرەوەکان تەنها دەرگای گفتوگۆکە ئەکەنەوە بۆ قسەکردن، بەڵام دایکوباوك پێویستیا بەوە هەیە کە دەرگاکە بەکراوەیی بهێڵنەوە، بۆیە گوێگرتنی ئەکتیڤ پەیوەندی نێوان (پەیامدەر) و (پەیاموەرگر) لەگفتوگۆکەدا بەهێزتر ئەکات و گوێگر ئەبێت بە بەشێکی ئەکتیڤ لە پەیوەندیەکەدا، لەم پرۆسەیەدا (پرۆسێسی کۆمینیکەشون).

(دایکوباوك) هەوڵئەدات کە لەپەیامدەرەکە (منداڵەکە) بگات و بزانێت چۆن (هەست ئەکات) و پەیامەکە مانای چی و هەوڵئەدات کە بیکات بەووشە (کۆدی) تایبەتی و و بیگەڕێنێتەوە بۆ پەیامدەرەکە بەبێئەوەی کە هەستونەست و بیروڕای خۆی تێکەڵ بکات، ئەمە بەزمانی فاکتە پێیئەوترێت (feedback).

لێرەدا نمونەیەك ئەهێنینەوە بۆ (گوێگرتنی ئەکتیڤ) سەرنج بدە کە چۆن منداڵەکە پەیامەکەی باوکی دانپیائەنێت و چۆن ئاسانتر ئەبێت بۆ منداڵەکە کە زیاتر قسەبکات و لەبیرەکەیدا قوڵببێتەوە و بەناو گرفتەکەدا بڕوات و بیر لەسەرەتایەك بکاتەوە بۆ چارەسەری گرفتەکە.

بەهار: خۆزگە منیش وەکو جوان جار جار هەڵامەتم گرت.

باوك: هەست ئەکەیت کە غەدرت لێکراوە؟

بەهار: ئەو لەماڵەوە ئەمێنێتەوە و ناچێت بۆ قوتابخانە، بەڵام من بۆم نیە وابکەم.

باوك: حەزئەکەیت نەختێك زیاتر لەماڵەوە بیت؟

بەهار: ئا، بەڕاستی زۆر بێتاقەتم لە قوتابخانە.

باوك: ئایا ئەوەندە بێتاقەتی لە قوتابخانە؟

بەهار: ئا، جاری واهەیە ڕقیشم لێیئەبێتەوە، ڕقم لە دەرسەکانە، ڕقم لەسەعیکردنە.

باوك: لەوە ئەچێت ڕقت لەهەموو شتێك بێت لە قوتابخانە؟

بەهار: ڕقم لەهەموو مامۆستاکان نیە، بەس دووان نەبێت، یەکێکیانم بەهیچ شێوەیەك خۆشم ناوێت و نامەوێ چارەی ببینم.

باوك: کەواتە یەکێکیانە کەتۆ زرۆ ڕقت لێیەتی؟

بەهار: ئا، مامۆستا عبداللە، چارەم چارەی ناوێت، ناخۆشیەکە ئەوەیە کە هەموو ساڵەکە ئەو مامۆستامانە.

باوك: کەواتە ماوەیەکی زۆر ئەبێت ئەو مامۆستای ئێوە بێت؟

بەهار: ئەڵێ، نازانم چیبکەم؟ ئەزانیت چی ئەکات؟ هەموو ڕۆژێك دەست ئەکات بەقسە لەبارەی ئەوەی کە قوتابی ئەبێت وای لێدێ کە بێز لەخۆی بکاتەوە.

باوك: تۆ هەست ئەکەیت کە بێهودەیە گوێ لەم هەمووشتانە بگریت؟

بەهار: بەڵێ، ئەو وادەریئەخات کە قوتابخانە زۆر گرانە و ئێمە ناتوانین کە دەرەجەی باش وەرگرین ئەگەر یارمەتیمان نەدرێت.

باوك: تۆ واهەست ئەکەیت کە هەر لەئێستاوە دۆڕاویت و ناتوانیت دەرەجەی باش وەرگریت؟

بەهار: ئا، چونکە من حەز ناکەم ماستاو بۆ ماۆستا بکەم، ئەوانی تر وائەکەن هەربۆئەوەی خۆیان بەرنەپێشەوە و خۆیان خۆشەویست بکەن، من هەرچیەك بکەم هەر خۆشەویست نابم و کەسی واشی تێدانیە کە وەکو من بیربکاتەوە و لەگەڵ من ڕێکبکەوێت.

باوك: کەواتە هەست ئەکەیت کەلەلای هاوڕێکانت خۆشەویست نیت؟

بەهار: ئا، بەڕاستی کۆمەڵێك کچ نەبن زۆر بەناوبانگن و دیارن لە قوتابخانەدا، ئەگینا کەسی تر نییە وەکو ئەوان جاکوا میش هاوڕێی ئەوان بومایە، بەڵام نازانم چۆن ببم بەهاوڕێیان؟

باوك: تۆ حەز ئەکەیت ببیت بەهاوڕێی ئەو کچانە، بەڵام نازانیت چۆن؟

بەهار: ئا، ڕاست ئەکەیت، بەڕاستی ئەمەوێت ببم بەهاوڕێی ئەوان و نازانم چۆن، ئەوان جوانترین کچانی قوتابخانەکەش نین و باشترینیش نین، هەندێکیان باشن بەڵام هەندێکیان لەمنیش خراپترن.

باوك: تۆ بیرلەوە ئەکەیتەوە کە چۆن ببیت بەهاوڕێی ئەو کچانە؟

بەهار: ئا، ئەوان یەك شتیان هەیە کە ئەتوانن بەئاسانی قسە لەگەڵ خەڵکی بکەن، هەرئەوەندە ووتیان چۆنیت، ئیتر دەست ئەکەن بەقسەکردن و حکایەت گێڕانەوە و بەئاسانی ئەبن بە هاوڕێی خەڵکی، منیش وانیم ناتوانم وەکو ئەوان بم.

باوك: تۆ بڕوات وایە کە ئەوان بەئاسانی ئەتوانن قسە لەگەڵ خەڵکی بکەن و تۆ ناتوانیت؟

بەهار: من ئەتوانم لەگەڵ یەك کچدا بەتەنها قسەبکەم، بەلاّم کەبوو بەچەند کەسێك ئیتر ناتوانم و بێدەنگ ئەبم و نازانم چیبکەم.

باوك: کەواتە ئەتوانیت لەگەڵ یەك کچدا قسەبکەیت، بەلاّم کە زۆربوون تۆ ناتوانیت؟

بەهار: ئەترسم هەڵەیەك بکەم، لەبەرئەوە هەروەکو بتی ڕەق ڕائەوستم و قسەم بۆ ناکرێت و ئەمەش ناخۆشە بۆ من ئەوان لەوانەیە بڵێن کە ئەم کچە چەند بێئەقڵە.

باوك: ڕاست ئەکەیت بەڕاستی ناخۆشە ئاوا هەست بکەیت.

بەهار: من نامەوێت لەدەرەوەی گروپەکە بم و لەهەمانکاتدا ئەشترسم قسە بکەم.

لەم گفتوگۆ کورتەدا، باوکەکە بیروهەستەکانی خۆی ئەخاتە لاوە بۆ ئەوەی گوێبگرێت و لەهەستونەستەکانی بەهار بگات، سەرنجی ئەوەبدە کە چۆن وەلاّمی باوکەکە بە (تۆ) دەستپێئەکات، هەروەها سەرنجی ئەوە بدە کە چۆن باوکەکە خۆی لە (12) وەلاّمە بەناوبانگەکە ئەپارێزێت، بەهۆی گوێگرتنی ئەکتیڤەوە، هەوڵئەدات کە خۆی بخاتە شوێنی بەهار وە لەهەمانکاتدا بەپرسیاری گرفتەکە ئەداتە دەست بەهار خۆی.

## بۆچی باشە دایکوباوك خۆیان فێری گوێگرتنی ئەکتیڤ بکەن؟

زۆر دایکوباوك بەلایانەوە سەیرە کە بەم شێوەیە لەگەڵ منداڵەکەیان قسەبکەن و بەشتێکی ناخۆشی ئەزانن، ئەمەش شتێکی ئاساییە، چونکە دایکوباوك واڕاهاتوون کە ئامۆژگاری منداڵەکنی خۆیان بکەن، پرسیاریان لێبکەن بڕیاریان بۆ بدەن، هەڕەشەیان لێبکەن، بیانهێننەوە سەرخۆ ئەمیننیان بکەنەوە و .....هتد لەبەرئەمانە ئاساییە کە پرسیار لەخۆی بکات کە بۆچی شێوەی قسەکردنی بگۆڕێت و فێری گوێگرتنی ئەکتیڤ ببێت؟

1. زۆر کەس وائەزانن کە لەهەستەکانی خۆیان ڕزگاریان ئەبێت کاتێك کە باسیان ناکات، لەبەرئەوە ئەیانشارێتەوە و هەوڵ ئەدات لەبیریان بەرێتەوە، بەلاّم بەپێچەوانەوە، مرۆڤ لە هەستونەستەکانی ڕزگاری ئەبێت کاتێك کە هانئەدرێت بۆ ئەوەی باسیان بکات، بۆیە.
2. گوێگرتنی ئەکتیڤ ڕزگار کەرێکە، چونکە یارمەتی منداڵەکە ئەدات کە بەڕاستی هەستەکانی باسبکات، کاتێکیش منداڵەکە هەستەکانی بەڕاستی دەردەبڕی، کاری خۆی بەچاکی ئەکات و ڕێگای پێشکەوتنی بۆ سازئەکات بۆیە گوێگرتنی ئەکتیڤ یارمەتی منداڵەکە ئەدات کەلە هەستە خراپەکانی ئەترسێت، هەستکردن هەرچۆنێك بێت باشە، کاتێك کە دایکوباوك بەهۆی گوێگرتنی ئەکتیڤەوە دەریئەخات کە هەستەکانی منداڵەکەی قبوڵئەکات، منداڵەکەش فێرئەبێت کە هەستەکانی خۆی قبوڵبکات.
3. گوێگرتنی ئەکتیڤ ئەبێت بەهۆی دروستکردنی پەیوەندیەکی گەرم لەنێوان منداڵەکە و دایکوباوکیدا، کاتێك کە هەست ئەکەیت کە کەسێك تێتئەگات و گوێت لێئەگرێت، بەتایبەتی منداڵ، سەبوریەکی ڕۆحی ئەدات بەقسەکەرەکە، هەروەها گوێگرەکەش هەستی خۆشەویستی تێدا پەیدا ئەبێت بەرامبەر بەقسەکەرەکە،

کەبەهۆی گوێگرتنە ئەکتیڤەکەوە باشتر لەقسەکەرەکە ئەگات و تێئەگات کە ئەوچۆن بیر لەژیان ئەکاتەوە بەمانایەکی تر مرۆڤ خۆی ئەخاتە جلەکانی قسەکەرەکەوە و بەمە ئەبێت بەهاوڕێی نزیك و خۆشەویستی لەم کاتە کورتەی پەیوەندیەکەدا.

4. گوێگرتنی ئەکتیڤ، یارمەتی منداڵەکە ئەدات کە خۆی گرفتەکانی خۆی چارەسەر بکات، زانراوە کە مرۆڤ باشتر و چاکتر کا ئەکات، کاتێك کە بیر لەگرفتەکانی خۆی ئەکاتەوە و خۆی چارەسەریان بۆ ئەدۆزێتەوە وەك لەوەی کە تەنها بیریان لێبکاتەوە و بیرەکە لەدەروونی خۆیدا بهێڵێتەوە، چونکە گوێگرتنی ئەکتیڤ وائەکات کە قسەکردن ئاسان بێت و ئاسانتر چاری گرفتەکان بکەیت.
5. هەموو ئەوەمان دیوە کە هاوڕێیەك دێت و داوای لێئەکات کە گوێی لێبگریت، چونکە شتێکی هەیە ئەیەوێت تەنها لەگەڵ تۆدا باسیبکات، ئەمە لەبەرئەوەی کە ئەوکەسە ئەزانێت کە ئەوباسە لای تۆ گرنگە و تۆ گوێرێکی باشیت بۆیە ئەویش ئەیەوێت کە قسەکانت بۆبکات و ئەشزانێت کە ئەم قسەکردنە سوودی هەیە بۆ گوێگرتنی ئەکتیڤ، ئەبێت بەهۆی ئەوەی کە منداڵەکانیش حەزبکەن گوێ لەهەستونەستەکانی دایکوباوك بگرن، شتێکی ئاشکرایە کە ئەگەر کەسێك بیەوێت گوێ لەبیروهەستەکان تۆ بگرێت، ئەوسا بەلای تۆشەوە ئاسانترە کە گوێی لێبگریت، ئیحتمال زیاترە کە منداڵەکان باشتر گوێ لەپەیامی دایکوباوك بگرن ئەگەر دایکوباوك لەپێشدا گوێ لە منداڵەکانیان بگرن، بەمە هەندێك لە تەنگوچەڵەمەی ناوخێزان کەمئەبێتەوە، چونکە دایکوباوك هەندێکجار گلەیی ئەوە ئەکەن کە منداڵەکانیان گوێیان لێناگرن و بەقسەیان ناکەن، ئەمە هۆکەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دایکوباوکەکە گوێ لەمنداڵەکە ناگرن نەك بە پێچەوانەوە.
6. گوێگرتنی ئەکتیڤ، سەری گوریسەکە ئەداتە دەست منداڵەکان خۆیان، کاتێك دایکوباوك یارمەتی منداڵەکان ئەدەن بەگوێگرتنی ئەکتیڤ، ئەبینن کە چۆن منداڵەکان بیر لەچارەسەری گرفتەکەش ئەکەنەوە، چونکە ئەوان خۆیان تاوتۆی گرفتەکە ئەکەن و وردە وردە ئەگەنە ئەوەی کە چارەسەریشی بۆبدۆزنەوە، چونکە گوێگرتنی ئەکتیڤ منداڵەکە هانئەدات کە خۆی بیربکاتەوە و بشگەڕێت بەدوای چارەسەرەکەیدا، ئەمە ئەبێت بەهۆی ئەوەی کە هەستی منداڵەکە بۆ ڕێزگرتنی خۆی زیادبکات، بەلاّم ئامۆژگاری و ڕێنیشاندان و پێشنیارکردن....هتد، هەستی خۆیی بێهێز ئەکات، چونکە لەم کاتەدا دایکوباوکان کە چارەسەری گرفتەکە ئەکەن نەك منداڵەکە، لەبەرئەوە گوێگرتنی ئەکتیڤ یەکێکە لەوشێوە بەکەڵکانەی قسەکردن کە یارمەتی منداڵەکە ئەدات کە خۆی لێپرسراوی کارەکەی خۆی بێت و سەربەست و ئازاد بێت لەبیرکردنەوەدا.

### ئەتیتید کە پێویستە لەکاتی بەکارهێنانی گوێگرتنی ئەکتیڤ دا

ئەم شێوەی گوێگرتنە شتێك نیە کە دایکوباوك لە گیرفانیانی دەرهێنن، بەکاریبهێنن هەرکاتێك منداڵەکان گرتفێکیان هەبوو، ئەمە ڕێگایەکە بۆ ئەوەی بناغەی هەڵسوکەوتێك دابنێت بۆ دایکوباوك، بەبێ ئەم هەڵسوکەوتانە (attitid) ئەم شێوەی کارە سوودی نییە و سەرزارەکی و بێمانا ئەبێت.

لێرەدا هەندێك لەو ڕەوشتانە باسئەکەین کە بەبێ ئەمانە گوێگرتنی ئەکتیڤ نابێت:

1. پێویستە حەز بکەیت کە گوێ لەقسەکانی منداڵەکەت بگریت و کاتی خۆتی بۆتەرخان بکەیت، هەرکاتێکیش کاتت نەبوو، ئەوە بەڕاشکاوی پێی بڵێیت کە کاتت نییە.
2. پێویستە بەڕاستی بتەوێت یارمەتی منداڵەکەت بدەیت لەگرفتەکەیدا، ئەگەر نەتەوێت یارمەتی بدەیت، ئەوە پێی ئەڵێیت کە جارێ ناتوانێت یارمەتی بدەیت و ئەبێت چاوەڕوان بکات تاکو تۆ ئەتوانیت یارمەتیەکەی بدەیت.
3. بەڕاستی قبوڵی هەستونەستەکانی منداڵەکەت بکەیت هەرچیەك بن و هەرچەند لەهەستەکانی تۆوە دووربن و نامۆبن بە تۆ، ئەمە کارێکی درێژخایەنە و زۆری ئەوێت بۆ ئەوەی گەورەکان بیروڕای خۆیان لەمبارەیەوە بگۆڕن.
4. ئەبێت بڕوایەکی تەواوت بە منداڵەکەت هەبێت کە ئەتوانێت لەگەڵ گرفتەکانی خۆی مامەڵە ئەکات و بیریان لێئەکاتەوە و چارەیان بۆ ئەدۆزێتەوە، ئەم بڕوایە لەئەنجامی ئەوە دروست ئەبێت کە ئەبینیت منداڵەکەت وردە وردە خۆی گرفتەکانی خۆی چارەسەر ئەکات.
5. ئەبێت ئەوە بزانێت کە هەستونەست هەمیشە لەگۆڕاندایە و هەمیشەیی نیە، ئەم هەستانە جاری واهەیە لەخۆشەوستیەوە ئەگۆڕێت بۆ ڕق و لەبێهیواییەوە ئەگۆڕێت بۆ هیوا، جابۆیە پێویست ناکات لەم هەستانە بترسێت کە منداڵەکەت دەریان ئەبڕێت.
6. پێویستە منداڵەکەت وەکو تاکە کەسێك جیاواز لەخۆت ببینێت کەسێك کە ژیانێکی تایبەتی خۆی هەیە و کەسایەتیەکی جیاوازی هەیە لەتۆ، ئەم بیرە وائەکات کە ڕێگا بە منداڵەکەت بدەیت هەستونەستی خۆی هەبێت و شێوەی تایبەتی خۆی هەبێت بۆ بینین و چارەسەری گرفتەکانی، تەنها بەوەی کە منداڵەکەت وەکو تاکەکەسێك سەیربکەیت، یارمەتیدەرێکی گەورەیە، کەواتە تۆ لەگەڵ منداڵەکەت بە کاتێك کە هەست بەگرفتەکانی ئەکات، بەڵام هەرگیز خۆت مەتوێنەوە لەناو منداڵەکەداو خۆت مەکە بەبەشێك لەو.

## چۆن قسەئەکەیت بۆ ئەوەی منداڵەکەت گوێت لێبگرێت؟

ئەم گرفتە گرفتی هەموو خێزانێکە و هەمووەمان ئەو پرسیارە لەخۆمان ئەکەین، کەچی هەریەکەمان وائەزانێت کە تەنها هەر ئەوە ئەو گرفتەی هەیە، چونکە منداڵ، هەروەکو بێچوی هەموو ئاژەڵێك زەحمەتیان زۆرە و دایکوباوك تورە ئەکەن، منداڵ بیری بلاوە و گوێ بەخواستی کەسانی دەووروبەر نادەن، دەنگ بەرزن و شت لەماڵەکەدا بلاو ئەکەنەوە شت ئەشکێنن، داواکانیان زۆر لەکاتێکدا کە دایك و باوك کاتی ئەوەیان نییە کە داواکانیان بۆ جێبەجێ بکەن، دایکوباوك هیلاك ئەکەن کاتێك ئەوان هیلاکن، بۆڵەبۆڵ ئەکەن کاتێك کە دایکوباوك سەریان دێشێ، ئیتر لەدایکوباوك بپرسە و ئەوان ئەزانن ئەمانە مانای چی؟

دایکوباوکیش مرۆڤێکە و پێویستی خۆی هەیە، بۆیە باشتر وایە کە ئەو ڕێگایانە بدۆزنەوە کە ئەم گرفتانە کەمئەکاتەوە و سنورێك بۆ هەڵسوکەوتی منداڵەکان دائەنێت، بۆیە گرنگە کە دایکوباوك بزانن کەی ئەتوانن

یارمەتی منداڵەکان بدەن و کەی نایانەوێت و نابێت یارمەتیان بدەن، ئەمە لێرەدا دانانی سنورێکە بۆ پێویستیەکانی دایکوباوك و پێویستیەکانی منداڵ.

هەندێك دایکوباوك واز لە منداڵەکان ئەهێنن کە هەمیشە ئەوانن پێویستیەکانیان جێبەجێ ببێت و واز لە پێویستیەکانی خۆیان ئەهێنن بۆ ئەوەی وەکو ئەوان ئەڵێن (بۆخۆشی خێزانەکە) کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، کە منداڵەکان گەورەتر ئەبن، بارودۆخی ناوخێزان باشتر نابێت، چونکە کاتێك کە دایکوباوك ڕێگایاندا بە منداڵەکە کە ئەوەندە زیاد بڕوات، ئیتر کە گەورەش بوو، هەر منداڵێك دەرئەچێت کە هەمیشە گوێ بەخواستەکانی خۆی ئەدات و خواستی کەسانی دەوروبەر پشتگوێ ئەخات، بەمە منداڵەکە بەناو ڕێگای یەکرێڕەوی ژیاندا ئەڕوات بۆ دابینکردنی خواستەکانی خۆی و شتگوێ خستنی خواستی کەسانی دەوروبەر، بۆیە دایکوباوکی ئەمجۆرە منداڵانە، لەژیان بێزار و هەست بە ناخۆشیەك ئەکەن بەرامبەر بە منداڵەکانیان، چونکە ئەمانە، خۆپەرست و پێنەزانن.

کەواتە دایکوباوك چیبکات کاتێك کە ڕەفتاری منداڵەکە پێقبوڵ ناکرێت؟ چۆن وا لە منداڵەکە بکەن کە گوێ بە خواستەکانی ئەوانیش بدات؟

چارەی ئەمە پێویستی بەجیاکردنەوەی دوو جۆر تەکنیکی گفتگۆ هەیە، یەکەمیان ئەو گفتوگۆیە یە کە دایکوباوکەکە گرفتی هەیە، دووەمیان ئەو گفتەگۆیەی کە منداڵەکان گرفتیان هەیە، ئەمە دوو گرفتی جیاوازن، کەواتە لەحاڵەتی یەکەمدا دایکوباوك گرفتیان هەیە و لەحاڵەتی دووەمدا منداڵەکان، بەمانایەکی تر دایکوباوك ئەبێت جیاوازی بکەن لەنێوان ئەم دوو حاڵەتەدا، ئایا منداڵەکە گرفتێکی هەیە یان دایکوباوك گرفتێکیان هەیە، لێرەدا باسی گرفتی دایکوباوك ئەکەین و ئەو ڕێگایانەی کە پێویستە بۆ دایکوباوکە کە بیگرنەبەر بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکەیان لەگەڵ منداڵەکەیان.

کاتێك دایکوباوك توڕەبن و ڕەفتاری منداڵەکەیان پێناخۆشە مانای ئەوەیە کە گرفتەکە گرفتی ئەوانە و ئەوان ئەبێت چارێك بۆ ئەمە بدۆزنەوە، بەمانایەکی تر گرفتەکە گرفتی ئەوانە، بۆ نموونە:

- منداڵەکە خەریکە یاری بەگوڵانەکە ئەکات.
- قاچی خستۆتەسەر مێزەکە.
- قسەکان بەدایکی ئەبڕێت.
- شتەکانی بڵاوکردۆتەوە بەهەموو ژوورەکەدا.
- داوای حکایەتێکی تر و یەکێکی تر و یەکێکی تر ئەکات.
- یارمەتی نادات لەپاککردنەوەی ماڵەکە، هەرچەندە بەیەکەوە بڕیارتانداوە.
- ئامێری دارتاشیەکانی باوکی بڵاوئەکاتەوە و نایخاتەوە شوێنی خۆی.

هەموو ئەمانە، ئەبێت بەهۆی تووڕەبوونی دایکوباوك و هەست ئەکەن کە ڕەفتاری منداڵەکەیان ناگونجێت لەگەڵ داوای ئەمان و ناچاریان ئەکات کە پێی بڵێن و کەپێشیان ووت ئەو توڕە ئەبێت و ئەبێت بەهۆی ناخۆشی لەنێوانیاندا لەم کاتانەدا دایکوباوك پێویستە یارمەتی خۆیان بدەن نەك منداڵەکە، ئەویش بە هەڵبژاردنی یەکێك لەم ڕێگایانەی خوارەوە:

1. هەوڵدان بۆ گۆڕینی ڕەفتاری منداڵەکە.
2. هەوڵدان بۆ گۆڕینی ژینگەی منداڵەکە.
3. هەوڵدان بۆ گۆڕینی ڕەفتاری خۆی.

هەوڵدان بۆ گۆڕینی ڕەفتاری منداڵەکە

بابزانین دایکوباوك چۆن قسە لەگەڵ منداڵەکان ئەکەن لەهەندێك ڕووداوی ڕۆژانەدا بەوردی لێکیانبدەینەوە و بزانین چۆن ئەم ڕووداوە ئاساییە ڕۆژانە ئەبێت بەهۆی گرفتێکی گەورە بۆ دایکوباوك، چەند نموونەیەك:

1. لەکار هاتویتەوە و هیلاکیت و پێویستت بە حەوانەوە هەیە و ڕۆژنامە دەرئەهێنیت و نانەکەی ئەخوات و شتەکان لەسەر مێزەکە بەجێئەهێڵێت و ئەڕواتە دەرەوە و گوێ بەوە نادات کە تۆ لەبەیانیەوە خەریکی ماڵەکە باکئەکەیتەوە و هیلاك بوویت. لێرەدا باگوێ لەدایکات و باوکات بگرین و بزانین چۆن قسە لەگەڵ منداڵەکانیان ئەکەن، دایکانوباوکان قسەی وائەکەن کە:
   1. منداڵەکان والێئەکەن کە بەرەنگاریان ببنەوە، بەوەی کە ڕەفتاری خۆیان نەگۆڕن.
   2. وا لەمنداڵەکان ئەکەن کە هەست بکەن کە دایکوباوك وا ئەزانن منداڵەکانیان تێنەگەیشتوون.
   3. والەمنداڵەکان ئەکەن کەوا هەست بکەن کە دایکوباوك گوێ بە پێویستیەکانیان نادەن.
   4. وا لەمنداڵەکان ئەکەن هەست بەگوناهباری خۆیان بکەن.
   5. هەستی خۆیی منداڵەکان کەمئەکەنەوە.
   6. واله منداڵەکان ئەکەن کە بەرگری لەخۆیان بکەن.
   7. واله منداڵەکان ئەکەن کە پەلاماری دایکوباوك بدەنەوە و چیان پێوتون ئەوانیش بەوان بڵێنەوە.

دایکوباوك سەری سوڕ ئەمێنێت کاتێك گوێی لەم شیکردنەوەیە ئەبێت، چونکە هیچ دایکوباوکێك نییە کە بیەوێت منداڵەکەی ئاوا ئازار بدت و خراپەی منداڵەکەی بوێت، ئەمەش لەبەرئەوەی کە هەرگیز بیری لە ئەنجامە خراپەکانی قسەکانی نەکردۆتەوە و لەسەر منداڵەکەی، بۆیە لێرەدا بەدوورودرێژی ئەچینەناو قسەکانەوە و یەك یەك باسیان ئەکەین.

تەنگوچەڵەمە سازکەر – پەیامدان بە منداڵەکە چیبکات

لەبیرتە کە جاری واهەبووە ویستەتە کارێکی باش بکەیت لەگەڵ کەسێك و ڕەفتاری خۆت بەرامبەری بگۆڕێت، کەچی ئەوکەسە دێت و داوای ئەوەت لێئەکات کە تۆخۆت ویستوتە بەویستی خۆت بیکەیت؟ ئایا ریاکشونی تۆ چۆنە و لەمکاتەدا چۆن بیرئەکەیتەوە؟ ناڵێیت ئەگەر وات نەوتایە من خۆم وام ئەکرد، نەتئەتوانی هەندێك چاوەڕوان بکەیت

هەست ناکەیت کە ئەم کەسە بڕوای بەتۆ کردەوە بۆیە هاتووە و داوای ئەوەت لێئەکات، هەست ناکەیت کە ئەو شتە باشەی ئەتویست بەناوی تۆوە بێت ئێستا ئەم نەیهێشت و چاکەکەی لێسەندیتەوە؟

کاتێك خەڵکی وا لەگەڵ تۆ ئەکەن، پەیامی چارەسەرکردن ئەدەن بەتۆ، ئەمەش ئەوەیە کە زۆرجار دایکوباوك ئەیکەن لەگەڵ منداڵەکاندا، ئەمان چاوەڕوان ناکەن کە منداڵەکان شتێکی باش لەخۆیانەوە بکەن، ئەمان پێیان ئەڵێن کەچی ئەبێت بکەن و چی باشە بیکەن، هەموو ئەم نمونانەی خوارەوە پەیام ئەدات منداڵەکە چیبکات باشە:

1. ئەمری پێئەکەیت، ڕێی نیشان ئەدەیت، قەدەغەی ئەکەیت کە وائەکات:

- بڕۆ و یاریەکی تر بکە.
- ڕۆژنامەکە چرچ بکە.
- هەرئێستا ئەو قابلەمانە ئەخەیتەوە شوێنی خۆی.
- هەر ئێستا سەرمێزەکە پاکئەکەیتەوە.

2. ئاگاداری ئەدەیتێ، هەڕەشەی لێئەکەیت:

- وازنەهێنیت هاوار ئەکەم.
- توڕەئەبم ئەگەر وازم لێنەهێنیت ڕۆژنامەکە بخوێنمە.
- لەچێشتخانەکە نەچیتە دەرەوە، خۆمئەزانم چیت لێئەکەم.

3. بۆیڕاست ئەکەیتەوە، ئامۆژگاری ئەکەیت، باسی چاکە و خراپەی بۆ ئەکەیت:

- قەد وامەکە کە کەسێك خەریکی ڕۆژانامە خوێندنەوە بێت.
- یاری مەکە لێرە کاتێك دایە خەریکی چێت لێنانە.
- مرۆڤ ئەبێت هەمیشە دوایی نانخواردن مێزەکە پاك بکاتەوە.

4. نەسیحەتی ئەکەیت، پێشنیاری بۆ ئەکەیت، گرفتەکەی بۆ چارەسەر ئەکەیت

- ئاقڵ لەشوێنێکی تر یاری بکە؟
- ناتوانیت بچیتە دەرەوە یاری بکەیت؟
- یاریەکی تر بدۆزەرەوە بیکە؟
- ناتوانیت شتەکان بخەیتەوە شوێنی خۆی هەر جارێك نانت خوارد؟

ئەم پەیامانە باسی چارەسەرکردنی تۆ ئەکات بۆ منداڵەکە، ئەوەی تۆ پێت باشە کە ئەو بیکات، تۆ سەرکردایەتیەکەت گرتۆتە دەست، تۆ کۆنترۆڵی بارودۆخەکەت بەدەستەوەیە، قامچیەکە بەتۆیە، تۆ ئەوت خستۆتە ئەولاوە یەکەم داوای لێئەکات کە چۆن گرفتەکە چارەسەر بکات، دووەم، هەڕەشەی لێئەکات، سێهەم بۆی ڕاست ئەکەیتەوە، چوارەم نەسیحەتی ئەکات.

دایکوباوك پرسیار ئەکات، بۆچی هەڵیە من شتێك پێشنیار بکەم بۆی؟ خۆ ئەوە کە گرفتم بۆ ئەنێتەوە، ئەی پێی نەڵێم چیبکات، ڕاستە کە ئەو بوو بەهۆی گرفتەکە، بەلاّم پێشنیار پێشکەش کردن ئەم ئەنجامەی ئەبێت.

1. منداڵ حەز ئەکات بەربەرەکانێ بکات کاتێك پێیئەوترێت کە پێویستە شتێك بکات، وە ئیحتمال زۆرە کە ڕەفتاری خۆی نەگۆڕێت هەرلەبەرئەوەی کەپێیوتراوە کە کارێك بکات یان نا.
2. پێشکەشکردنی پێشنیارێك بۆ منداڵەکە، پەیامێك ئەدات بە منداڵەکە " من بڕوام بەو نیە کە تۆ بتوانیت ئەم گرفتە خۆت چارەسەری بکەیت" یاخود " بڕواناکەم تۆ گرنگی بە خواستونەستی من بدەیت و یارمەتیم بدەیت لەکارەکەمدا".
3. کاتێك کە چارەسەری گرفتەکە ئەکەیت بۆ منداڵەکەت، ئەو پەیامە ئەدەیت بە منداڵەکە کە پێویستیەکانی تۆ گرنگترن لە پێویستیەکانی منداڵەکە و ئەو ئەبێت ئەوە بکات کە تۆ پێت باشە، ئیتر پێویستیەکانی ئەو گرنگ نین، لەبەرئەوە ئەوەی تۆ ئەیڵێیت باشترین شتە و منداڵەکە پێویستە ئەوە بکات.

بابڵێین کە منداڵی هاوڕێکەت هات بۆ ماڵتان و قاچی خستەسەر کورسیە جوانەکەتان، بابزانین تۆ چۆن قسەی لەگەڵ ئەکەیت و پێی ئەڵێیت کە قاچی بێنێتە خوارەوە، هەرگیز پێیناڵێیت کە:

- ♦ قاچ بێنە خوارەوە خێرا، تۆ کورسیەکەمان ئەشکێنیت.
- ♦ پیاو نابێت قاچ بخاتەسەر مێز بەو شێوەیە.
- ♦ ئەگەر قاچ نەهێنیتە خوارەوە خوا ئەزانێت چیت پێئەکەم.

ئەمە شتێکی سەیرە کە مرۆڤ هەوڵ ئەدات کە منداڵی هاوڕێکەی یان هاوڕێکەی تەریق نەکاتەوە و منداڵی هاوڕێکەی لەو تەریق بونەوەیە ڕزگار بکات و لەجیاتی ئەوە پێی بڵێت:

- ♦ ئەترسم کورسیەکەمان بشکێنیت ئەگەر ئاوا دانیشیت.
- ♦ دڵم نایەت پێت بڵێم، بەلاّم ئەم کورسیەم زۆر خۆشئەوێت و ئەترسم بشکێت.
- ♦ یان جاری واهەیە کە لەمەش زیاتر ئەڕۆن و ئەڵێن قەیناکات وازی لێبهێنە منداڵە.

خەڵکی ئاوا لەگەڵ هاوڕێ و منداڵی هاوڕێکانیدا قسە ئەکەن، بەلاّم هەرگیز بیرلەوە ناکەنەوە کە جارێك لەجاران لەگەڵ منداڵەکەی خۆیان ئاوا قسە بکەن، بەشێوەیەکی ئاسایی واز ئەهێنن لەوەی کە ئامۆژگاری هەڕەشە ڕاست کردنەوەیەك لەگەڵ هاوڕێ و کەسانی تردا بەکاربهێنن، بەلاّم هەر ڕۆژی چەند جارێك ئەمە ئەکەن لەگەڵ منداڵەکانی خۆیاندا.

کەواتە سەیر نییە کە منداڵەکان بەگوێمان ناکەن و بەرەنگارمان ئەبنەوە و بەرگری لەمافی خۆیان ئەکەن، بیرلەوە بکەرەوە کە چەند ناخۆشە بۆ منداڵەکە کە هەموو کاتێك، چاودێری بکرێت، هاواری بەسەردا بکەیت، هەڕەشەی لێبکرێت، تەریق بکرێتەوە، ئاگادار بکرێتەوە و پێیبوترێت کە هیچ نازانێت، کەواتە سەیر نییە کە بێحەیا و ئاژاوەچی دەرچن، سەیر نیە کە زۆربەی منداڵان بەوە گەورە ئەکرێن کە چاوەڕوانی ئەوەبن کە گرفتەکانیان بۆ

چارەسەر بکرێت، دایکوباوك گلەیی ئەوە ئەکەن کە منداڵەکان یارمەتی نادەن لەژیانی خێزاندا و هەر بیر لەپێویستیەکانی خۆیان ئەکەنەوە و بیرێك لە پێویستیەکانی دایکوباوك ناکەنەوە.
چۆن منداڵەکان بتوانن ئەم کارە بکەن کە هەمیشە ئەو شانسەیان لێبسەندرێتەوە کە خۆیان بەهەوەسی خۆیان بیکەن؟

## شکاندن – پەیام کە منداڵەکە ئەشکێنێت

هەموو کەسێك ئەزانێت کە چەند ناخۆشە کە قسەی وای لەگەڵ بکرێت کە مانای شکاندنی تێدا بێت، ڕەخنە، گاڵتەپێکردن، ساردوسڕی لە مامەڵەدا، وەڵامنەدانەوە، دایکوباوك ئەمانە هەمووی ئەکات و بەخۆشی نازانێت و لەڕاستیشدا نەیویستووە مامەڵەی وا لەگەڵ منداڵەکەی بکات، ئەتوانین ئەمجۆرە دەربڕینانە لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:

1. حکمی بەسەردا بدەین، ڕەخنەی لێبگریت، بیشکێنیت.
   - هەقوابوو تۆ چاکتر ئەمە بزانیت.
   - بەڕاستی بێهۆشیت.
   - ئای چەند خراپیت.
   - تۆ زۆر گوێنادەیت بەدەوروبەرت.
   - ئاخری ڕۆژێك ئەمکوژین بەم ڕەفتارانەت.
2. ناو و ناتۆری لێئەنێیت، گاڵتەی پێئەکەیت، خەتاباریئەکەیت.
   - ئەریٚ تۆ شەرمناکەیت؟
   - منداڵێکی بیٚ ڕوویت.
   - وائەزانیت لەهوتێل ئەژیت؟
3. قسەکانی شیئەکەیتەوە، لێیئەبیت بەدەروونشیکەرەوە.
   - تۆ ئەتەوێت هەرخەریکی تۆ بین.
   - تۆ ئەتەوێت ڕم هەڵسێنیت.
   - تۆ ئەتەوێت کە بزانیت من وەڵامت ئەدەمەوە.
   - تۆ هەمیشە لەوێدا یاری ئەکەیت کە من ئەمەوێت ئیش بکەم.
4. دەرسی دائەدەیت، باسی ڕەوشت بەرزی بۆ ئەکەیت:
   - جوان نییە قسە بەخەڵکی ببڕیت.

- چیئەکەیت ئەگەر من والەتۆ بکەم؟
- ناتوانیت جارێك باش بیت؟
- لەماڵی ئێمەدا سەرمێزەکە بەجێناهێڵین بەکۆنەکراوەیی.

هەموو ئەم شکاندنانە کەرەکتیری منداڵەکان ئەشێوێنێت وەکو مرۆڤێك، بڕوابە خۆبوونیان کەمئەکاتەوە، ڕووە بێهێزەکانیان ئەخاتەڕوو، کەسایەتییان هەڵئەسەنگێمێت، پەنجەی گوناهباریان بۆ ڕائەکێشێت، کە ئەمانە هەمووی ئەبێت بەهۆی:

- منداڵەکان هەست بەخەتاباری و گوناه ئەکەن.
- منداڵەکان هەست بەنادادپەروەری دایکوباوك ئەکەن.
- منداڵەکان هەست ئەکەن دایکوباوکیان خۆشیاننناوێن.
- منداڵەکان بەرەنگاری دایکوباوك ئەبنەوە، چونکی وازهێنان لەوەی دایکوباوك هەراسان ئەکات، مانای ئەوە ئەبەخشێت کە ئەوان سەرکەوتوون و ڕاستیانکردووە، بۆیە منداڵەکان ئەوەندەی بتوانن دەست لەڕەفتارەکەیان هەڵناگرن و بەردەوام ئەبن لەسەری.
- منداڵەکان هەڵئەچنەوە بەڕووی دایکوباوکدا و کارەکە ئەبێت بەکاری بۆ میرانج هاوێشتن.
- هەستێك ئەدات بە منداڵەکان کە ئەمان توانایان نیە کە کارەکانی خۆیان بکەن.

لێرەدا ئەمەوێت باسی تایبەتمەندیەکی خۆمان بکەم کە ئەویش ئەکەوێتە ئەم باسەوە و ئاماری خراپ لەسەر منداڵەکان دائەنێت، ئەویش وەشی عەیبەیە.

## عەیبە

دیارە ئێمەش وەکو هەموو گەلانی ئەم جیهانە، کۆمەڵگایەکی تایبەتین و هەندێك دیاردە و تایبەتمەندی خۆمان هەیە و ئێمی کردووە بەبەشێك لەو گەلەی کە خۆمانی پێئەناسێینین، ئێمەش بەشێکین لەو کولتوورەی کە بەمیرات بۆمان ماوەتەوە و لەسەری ئەڕۆین و زۆرجار پێویستمان بەوە نییە کە بیری لێبکەینەوە، بەلاّم جاری واهەیە کە پێویستمان بە گفتوگۆیەك هەیە لەگەڵ خۆمان بۆ ئەوەی بژارێکی گفتوگۆکەمان بکەین و پاکی بکەینەوە لەووشەی زەرەرمەند، یەکێك لەو ووشە زەرەرنەندانە وشەی عەیبەیە کە باری دەروونی منداڵەکانمانی گرانکردووە و ئازاریان ئەدات، بەهۆی ئەوەی کە ئەم ووشەیە لەشوێن و کاتێکدا و بەشێوەیەك بەکار ئەهێنرێت کە جێگای خۆی نیەو دایکوباوك پەنای ئەبەنەبەر لەبەرئەوەی ئەیانەوێت بۆ منداڵەکەی بسەلمێنن کە ئەوکارەی ئەیکات لەبەرئەوەی لەکولتووری گەلەکەیدا نییە باش نییە و ئەبێت ئەو دوای ئەو کولتووورە بکەوێت و لادان لەو کولتووورە بەزەرەری منداڵەکە ئەگەڕێتەوە، کە ئەمە زۆرجار ڕاست نیە و منداڵەکە ئەخاتە گێژاوی بیرکردنەوەیەکی ناهەموار و ناچاری

ئەکات یان دوایکەوێت و بەقسەی دایکوباوکی بکات کە بەمە ڕێگای تاقیکردنەوەیەکی تازەی لێئەبەسترێتەوە یان دوای ناکەوێت و تووشی گێروگرفت ئەبێت لەگەڵ دایکوباوکیدا.

گواستنەوە کولتووری خۆت بۆ منداڵەکەت تەنها لە ڕێگەی هەڵسوکەوت خۆتەوە ئەبێت و باسکردنی چاکە و خراپەی کولتوورەکەت بۆ منداڵەکەت سوودی نیە، منداڵ زۆر زیاتر ئەزانێت لەوەی دایکوباوك ئەیزانن و زیاتر چاوی لەهەڵسوکەوتیانە و هەمیشە بەراوردی قسە و ڕەفتاریان ئەکات و هەوڵئەدات لەڕەفتارەکانیانەوە شت فێرببێت نەك لەقسەکانیانەوە، هەربۆیە لەزۆر گێروگرفتی ناو خێزانیدا دایکوباوك ناچار ئەبن کە توڕە ببن و ئازاری منداڵەکانیان بدەن، چونکە منداڵەکە شتێك ئەڵێت و ئەکات کە دایکوباوك ناتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن و هیچیان بەدەستەوە نەماوە و ناتوانن بەشێوەیەکی لۆژیکی وەلامێك بدەنەوە کە منداڵەکە ڕازی بکات، ئەمە زۆرجار لەلایەن منداڵەوە بەجاپوکی بەکارئەهێنرێت و سەرکەوتنیشی تێدا بەدەست ئەهێنێت، چونکە منداڵەکان هەمیشە ناچار ئەکرێن کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ بەرەنگاری و چونەوە بەگژ دەسەلاتی دایکوباوکدا، کە ئەم بەگژداچونەوەیە و سەرکێی کردن لە فەرمانەکانی گەورەکان لەم تەمەنەدا، بەشێکی زۆری ژیانی منداڵە و گرنگیەکی تایبەتی هەیە، کاتێك کار ئەگاتە ئەوەی کە نەتوانرێت چاری ئەمە بەقسە و گفتوگۆ بکرێت ئەوسا ئەبێت بەگژداچونی دوو خواستی لەیەکجیا و باسەکە ئەگۆڕێت بۆ باسکردنی چارەسەری ئاژاوە لەماڵدا و ئەمە باسێکی ترە و لەبەشی تایبەتیدا باسیئەکەین.

دایکوباوك پێویستە بۆ خۆی و بۆ منداڵەکەی بژی لەهەمان ساتدا، لەوساتەدا بژی کە تێیدایە بۆ ئەوەی کە خۆشترین و لەبارترین ژیان بۆ خۆی و خێزانەکەی مسۆگەر بکات، ئەمە لەوانەیە بەخۆپەرستی لە قەڵەم بدرێت لای ئەوانەی کە ئەڵێن مرۆڤ ئەبێت بۆ کۆمەڵ بژی، بەلام کۆمەڵ چ سودێك لەمرۆڤێکی وائەبینێت کە سوودی خۆی نەزانێت و نەزانێت کە ئەو لێپرسراوی نەوەیەکی تازەیە کە باری سەرشانی قورسکراوە بە (عەیبە) ئایا کۆمەڵ چ سودێك لەمرۆڤێك ئەبینێت کە ڕێگای ژیانی لێدابخرێت و ڕێگای نەدرێت کە خۆی ژیان بۆ خۆی تاقیبکاتەوە و شتی تازە بهێنێتە گۆڕێ و لەشتی کۆنی نابەجێ و خراپ دورکەوێتەوە.

وشەی عەیبە هەمیشە بەکارهێنراوە بۆ مانەوەی مرۆڤ لەبارودۆخی خۆیدا، بەمانای سەرشۆڕکردن بۆ دەسەلاتداران و (پیاو مەعقولان)، ئەمانە بەلایانەوە نەنگە کە خەڵکی ئەوەندە سەربەست و وشیار بن کە لێیان هەڵگەڕێنەوە ئەمانە لەترسی لەدەستچوونی دەسەلاتیان هەمیشە بەرەنگاری شتی تازە و بیری تازەبوونەتەوە و ڕێگایان لێگرتووت بەوشەی (عەیبە).

ئەو هەڵەیەی دایکوباوك تێیئەکەوێت ئەوەیە کە (ئاخر کەس وای نەکردووە تاتۆ وابکەیت) بەمانای ئەوەی ئەمە لەکولتوری ئێمەدا نیە و ئەگەر تۆ بیکەیت ئەوە لەکۆمەڵدا ڕێزت نامێنێت و دوورئەخرێیتەوە، بەلام ئایا کۆمەڵ هەرهەمان دایکوباوك نیە کە وا بەمنداڵەکەی ئەڵێت؟ ئایا کولتوری لەکۆی کولتوری ئەندامەکانی پێکنەهاتووە، ئایا هەر مرۆڤەکانی کۆمەڵ نین کە گۆڕانیان بەسەر کولتوری باو و باپیرانیاندا هێناوە و هەندێکجار ئاواتەخوازن بەگەڕانەوە بۆ ئەو شتە باشانەی باو باپیریان؟ ئەمانەو زۆری تریش بەجێ ئەهێڵم بۆ مرۆڤەکان خۆیان بیری لێبکەنەوە و لەسەری بدوێن، عەیب ئەوەیە شت بشاریتەوە نەك باسیبکەیت.

لەبارەی بەکارهێنانی ووشەی عەیبە لە پەروەردەکردندا ئەتوانین دەست بۆ ئەم خالانەی خوارەوە ڕاکێشین:

- وشەی عەیبە وشەیەکی ئەبستراکتە کە منالْ تێیناگات.
- وشەی عەیبە وشەیەکی سەرلێشێوێنەرە و ئەلْتەرناتیڤێك نادات بەمندالّەکە.
- وشەی عەیبە وشەیەکی ڕوخێنەرە و منااى بێئەقلْ و خراپی ئەدات بەمندالّەکە.
- وشەی عەیبە وشەیەکی ترسناکە بۆ مندالْ و واى لێئەکات کە لەڕەفتاری تریش بترسێت و پاشگەز ببێتەوە کە لەوانەیە تەنها دایکوباوکیش بە عەیبی ئەزانن.

ئەم هەموو شتانەی کە باسمانکرد، کارێکی یەکجار خراپ ئەکەنەسەر کەسایەتیی مندالّەکە و بەسوك و بێفەڕ و بێئەقلْ و پڕوپوچ و لات و بێشەرم خۆی ئەبینێتەوە، وە لەبەرئەوەی کە خۆبەکەمزانین لەمندالّیدا لەمندالّەکەدا دروستبووە، لەبەرئەوە ئەم خەسڵەتە بەگەورەییش هەر ئەمێنێت و بۆ هەموو ژیانی داخی ئەکات.

ئەمانە هەمووی کار ئەکەنەسەر هەستونەستی مندالّەکە و لەپێشکەوتنێکی دەروونی ئاسایی دوایئەخەن، چونکە بیر و کەسایەتیی مندالْ ناسکە و بیر لەمانە هەمووی ئەکاتەوە و خۆی بە شەرمەزار و کەمئەزانێت، جا بۆیە کەمکردنەوەی بەکارهێنانی وشەی (عەیبە) ئەنجامێکی باشی ئەبێت.

لەوانەیە دایکوباوك پرسیار بکەن و بڵێن (ئەی چۆن لە مندالّەکان بەگەیەنین کە شتێك عەیبە و نەیکەن؟) بەتایبەتی دایکوباوك ئەترسن لە ڕەفتاری کچەکانیان و وشەی عەیبە بووە بە بەشێك لەپەروەردەی کچان و هەرچی ئەمان بیکەن، پەیوەندی هەیە بەسەرجەمی ژیانی کۆمەلاّیەتی گشت خێزانەکەوە و هەڵەی کچەکە یان (عەیبە)کانی کچەکە زۆر عەیب ترە لە عەیبەکانی کوڕەکە، ئەمە ئەوەندەی تر باری ژیانی کچانی قورستر کردووە و بووە بەڕێگرێکی سەخت لەپێشکەوتنی دەروونی کچان، بۆیە بەکارهێنانی وشەی عەیبە لەلایەن دایکوباوکەوە رۆژ لەدوای رۆژ ئەبێت بەهۆی شێواندنی کەسایەتیی مندالّەکە.

ئەوەی ڕاستی بێت زۆربەی کات کارەکە (عەیب) نیە، بەڵکو (هەڵەیە) یاخود (نەگونجاو)ە، کاتێك بەمندالّەکەت ئەڵێیت کە کارەکەی ڕاست نیە و هەڵەیە، لەم حالّەتەدا بە مندالّەکە ئەڵێیت کە:

- ڕەفتارێکی کردووە کە ڕاست نیە و ڕەفتارێکی تر هەیە کە ڕاستە.
- بەمە تۆ لەکەسایەتیی مندالّەکە کەمناکەیتەوە و وازی لێئەهێنین کە خۆت ڕەفتارە ڕاستەکەیان بکات.
- بەمندالّەکەت ئەڵێیت کە هەموو ڕەفتارێك دوو ڕووی هەیە ڕوویەکی باش و ڕوویەکی خراپ.
- تۆ لێرەدا قورساییەکی کۆمەلاّیەتی ناخەیتەسەر مندالّەکەت و لێپرسراوی ناکەیت بەشێك لەوانەیە واش نەبێت.
- تۆ دیالۆگێك دائەمەزرێنیت لەگەلْ مندالّەکەت کە زیاتر لەیەکتان نزیك ئەکاتەوە و وەك لەوەی ڕێگای لێببەستیتەوە و بەوەی کە بڵێیت عەیبە.
- تۆ ڕێگای مندالّەکە ئەدەیت کە هەستونەتی خۆی دەرببڕێت و تۆش لەوە بگەیت کە مندالّەکەت بۆچی وایکرد.

## ڕێگای کاریگەر بۆ قسەکردن لەگەڵ منداڵدا

ئەو قسانەی دایکوباوك ئەیکەن لەگەڵ منداڵەکانیان چۆن ڕوخێنەر و شکێنەرە، بەهەمان شێوە لەوانەیە دروستکەر بێت، لەبەرئەوەی کە هیچ دایکوباوکێك نییە کە خراپەی منداڵەکەی بوێت و بیەوێت زەرەری لێبدات، بۆیە کاتێك کە دایکوباوك ئەزانن کە شێوەی تر هەیە بۆ بەرەنگاربوونی رەفتاری منداڵەکە، ئەوا هەر زوو خۆیان فێر ئەکەن و سوودی لێوەرئەگرن، بەتایبەتی کاتێك تێئەگەن کە ئەو پەیامانەی ئەیدەن بە منداڵەکەیان پەیامێکی (تۆییە) نەك (ئەمنی).

### پەیامی تۆیی ---------------- و ----------- پەیامی منی

ڕێگایەکی ئاسان بۆ ئەوەی جیاوازی بکەیت لەنێوان گفتوگۆی باش و خراپدا ئەوەیە کە بزانیت ئایا پەیامی تۆیی ئەنێریت یان پەیامی منی، کاتێك کە دایکوباوك سەرنجی ئەو وەلاّمانە ئەبن کە ئەیدەن بە منداڵەکانیان، ئەبینن کە زۆربەی زۆریان پەیامی (تۆییە) ئەمەش مانای ئەوەیە کە وەلاّەکان بەووشەی تۆ دەست پێئەکات یان مانای تۆ ئەگرێتەوە هەموو ئەم وەلاّمانە وەلاّمی تۆیین:

- واز بێنە.
- هەق نەبوو وابکەیت.
- جارێکی تر وابکەیت.
- بۆ واناکەیت وەکو من پێتئەلێم؟
- بێحەیایت.
- وەکو منداڵ وایت.
- ئەتەوێت هەرخەریکی تۆ بین؟
- بۆ جارێك لەجاران شتێکی باش ناکەیت؟

بەلاّم کاتێك دایکوباوك بۆ منداڵەکە باسئەکەن کە هەستیان چۆنە بەرامبەر بەکاری منداڵەکە، بەمانایەکی تر پەیامی می ئەدەن بە منداڵەکە، ئەوە شێوەی وەلاّمەکان ئاوای لێدێت:

- ناتوانم پشوبدەم کاتێك کە یەکێك خۆی بە قاچمدا هەڵواسێت.
- حەز ناکەم یاری بکەم کاتێك هیلاکم.
- تانوانم چێشتەکە لێ بنێم کاتێك کە هەربەسەر مەنجەڵ و قاپدا باز بدەم.
- ئەترسم نتوانم خواردنەکە ئامادە بکەم بۆ میوانەکان.
- بەڕاستی تورە ئەبم ئەگەر ئەبینم کە چێشتخانەکە وا دراوە بەسەریەکدا.

لێرەدا بەئاشکرا جیاوازی نێوان پەیامی (تۆیی) و پەیامی (منی) ئەکرێت، کاتێك کە منداڵێك شتێك ئەکات کە دایکوباوك پێیان ناخۆشە، لەبەرئەوەی دژی پرنسیپی ئەوانە، لەمکاتەدا گرفتەکە گرفتی (ئەوانە) ئەوان توڕەن، ئەوان ڕقیان هەڵساوە، خەفەتبارن، ئەوان هیلاکن، ئەوان..... هتد.

بۆ ئەوەی منداڵەکان بزانن کە دایکوباوك چۆن لەناخی دڵیانوە هەست ئەکەن، پێویستە دایکوباوك کۆدێکی راست بەکاربهێنن بۆ ئەوەی ئەم راستیە بۆ منداڵەکە دەربخەن بەوشێوەیەی کە منداڵەکە تێبگات، چونکە ئەو باوکەی دێتە ماڵەوە و هیلاکە و ئەیەوێت نەختێك ڕاکشێت و بحەوێتەوە و ناتوانێت جارێ یاری لەگەڵ منداڵەکەی بکات و ئەڵێت ( دلاچۆ، ئەڵێت منداڵی خۆتم پیا هەڵئەواسیت) لە ڕاستیدا بە منداڵەکەی ناڵێت کە ئەو چۆن هەست ئەکات و ئەو پەیامە نادات بە منداڵەکە کە ئێستا باوکەکە هیلاکە و ناتوانێت یاری لەگەڵ بکات، بەڵکو ئەو پەیامە ئەدات بەمنداڵەکە کە (بێحەیایە و بێکەڵکە) ئەگەر وێنەی ئەمە بکێشین بەشێوەی دیاگرام ئاوا ئەبێت:

باوك (هیلاکە )،------------ کۆد ( من هیلاکم) ------- (من)

بابە هیلاکە

باوك (هیلاکە)،------------ کۆد (تۆ بێکەڵکی) ------- (تۆ)

خراپم

کەواتە ئەگەر باوکەکە پەیامی تۆیی بدات بەمنداڵەکە، ئەم پەیامە تۆییە بەتەواوەتی ناگونجێت لەگەڵ ئەوەی کە باوکەکە هەستی پێئەکات و منداڵەکەش ناتوانێت لەڕاستی هەستی باوکی بگات و وازی لێبهێنێت، وە لەبەرئەوەی مانای بێکەڵك و بێحەیایی ئەدات بەم منداڵە ئەوە لەجیاتی ئەوەی واز لەباوکی بهێنێت، زویر ئەبێت و مانئەگرێت و بەگژیدا ئەچێتەوە و ناخۆشی دروست ئەکات لەماڵەکەدا، کەواتە پەیامێکی منی ڕون و ئاشکرا کە هەم بە منداڵەکە بڵێت کە من هیلاکم و یاریت لەگەڵ ناکەم و هەم هەستونەستی باوکەکەش بە ڕاستی دەربڕێت ئەوەیە کە پێی بڵێیت بۆ نمونە (من هیلاکم) یان (من ناتوانم یاریت لەگەڵ بکەم) (من پێویستم بە حەوانەوە هەیە).

## بۆچی پەیامی منی سوود بەخشترە؟

پەیامی منی بەکارترە بۆ گۆڕینی ڕەفتاری منداڵەکە، هەروەها باشترە بۆ بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان دایکوباوك و منداڵەکە، هەروەها پەیامی منی وا لەمنداڵەکە ناکات کە خۆی بخاتە سوچی پارێزگاری لەخۆکردن و دژایەتی بکات بەڕاستوڕەوان بۆ منداڵەکەی باسبکەیت کە کارە نارەواکەی چەند کاریکردەسەر تۆ باشترە لەوەی پێیبڵێیت کە ئەو منداڵێکی خراپە، بۆ نموونە:

(بەرزۆ) شەقێکی هەڵدا لەقاچی باوکی، لێرەدا بزانە (بەرزۆ) چۆن بیرئەکاتەوە کاتێك باوکی ئەم دوو وەڵامەی ئەداتەوە:

1. باوك: ئای، بەڕاستی قاچم ژانیکرد، من نامەوێت ئاوا شەقم تێهەڵدرێت (پەیامی منی).

2. باوك: بەڕاستی منداڵێکی کەری، جارێکی تر نەکەیت شەق لەکەس بدەیت (پەیامی تۆیی).

وەلأمی یەکەمیان (باسی باوکەکە خۆی ئەکات، من) بە (بەرزۆ) ئەڵێت کە شەقەکەی چەند ئازاری هەبوو، ئەمە راستیەکە کە (بەرزۆ) ناتوانێت نکۆڵی لێبکات، وەلأمی دووەم (باسی بەرزۆ ئەکات، تۆ) بە (بەرزۆ) ئەڵێت کە چەند خراپە و ئاگاداری ئەکاتەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر وانەکات، کە ئەمە وا لە (بەرزۆ) ئەکات کە نارەزایی خۆی بەرامبەر دەبرێت و بڵێت کە ئەمە ڕاست نیە و ئەو منداڵێکی خراپ نیە.

پەیامی منی زۆر بەهێزترە و لێپرسراوی کارەکە ئەداتە دەست منداڵەکە خۆی کە ڕەفتارەکەی خۆی بگۆڕێت باوکەکە تەنها بە (بەرزۆ) ئەڵێت کە ئەو چەند ئازاری پێگەیشت و دوایی واز لە (بەرزۆ) ئەهێنێت، کە خۆی ڕەفتارەکەی خۆی بگۆڕێت ئەمە یارمەتی منداڵەکە ئەدات کە پێشبکەوێت و بتوانێت لێپرسراوی کارەکەی خۆی بێت، بە مانای ئەوەی کە من بڕوام بەتۆ هەیە کە ئەتوانیت چارەسەری گرفتەکە بکەیت و ڕێزی پێویستیەکانی کەسانی تریش بگریت، کەواتە ڕێگا بە منداڵەکە ئەدات کە کارێکی باش بکات و ئەو شانسەی لێناسەنێتەوە.

لەبەرئەوەی کە پەیامی منی پەیامێکی ڕاست و بێ پێچوپەنایە لەبەرئەوە، وا لەمنداڵەکانیش ئەکات کە هەرکاتێك شتێکیان لەدەروونداُ بوو، بەبێ پێچوپەنا دەریببڕن و پەیامی ڕاستی منی بەکاربهێنن، چونکە ئەوەی پەیامی منی بدات پەیامی منیش وەرئەگرێتەوە، ئەمە لە پەیوەندیەکی نارێکدا بەئاسانی ئەبینرێت، کاتێك کە کەسانی ناو گرفتەکە یەکتر دائەگرنەوە بە (تۆ) واتکرد و ئەویتریان ئەڵێت کە (تۆ) واتکرد، ئەمە وایان لێئەکات کە نەتوانن گوێ لەیەکتری بگرن و پەیوەندیان خراپتر ببێت، کەواتە کاتێك کە گلەییان بە (تۆ) دەست پێئەکات، ئەوە بێگومان بەناخۆشی ئەنجامەکەی دوایی دێت، بۆیە پەیامێکی منی ئەم ترسناکیە کەمتر ئەکاتەوە، ئەمە مانای ئەوە نییە کە شەڕوشۆڕی ناومالْ بەجارێك ون ئەبێت و نامێنێت، هەر لەبەرئەوەی کە پەیامی (منی) بەکارئەهێنرێت، بەلأم بەیکەمەوە کەمتری ئەکاتەوە.

ناردنی پەیامی (منی) پێویستی بە ئازایەتی هەیە، چونکە دەربڕینی ئەوەی کە بەڕاستی هەستی پێئەکەیت لە پەیوەندیەکی کۆمەلأیەتیدا، مانای ئەوەیە کە ناخ و دەروونی خۆت بەکەسێك ئەڵێیت، لەبەرئەوە ئەبێت ئەوکەسە ئەوەندە لەخۆی سەرپشك بێت کە نەترسێت لەوەی کە خەڵکی هەستە ڕاستەکانی لەترس و خەفەت و پەژارە و لاوازی و تورەیی و هەست ناسکی و زۆری تر بزانن و بەتەواوەتی بیناسن، ئەمە مانای ئەوەیە کە کەسانی دەوروبەر ئەڵێن چی؟ چۆن بیر لەو کەسە ئەکەنەوە؟ ئایا وەریئەگرن بە ئەندامێکی ئاسایی و ڕێزی هەستەکانی ئەگرن؟ یاخود بەچاوێکی سوك سەیری ئەکرێت، بەتایبەتی دایکوباوك بەلایانەوە زەحمەتە کە خۆیان دەرخەن بۆ منداڵەکانیان چونکە ئەمان ئەیانەوێت کە بێ هەڵە و نمونەیی بن بۆ منداڵەکان، هەندێك دایکوباوك بەلایەوە ئاسانترە کە خۆی لەژێر پەردەی (تۆ) دا بشارێتەوە و خەتاکە بخاتەسەر منداڵەکە وەك لەوەی دانبنێت بە هەڵەکەیدا، بەلایەوە ئاسانترە کە خۆی بەبێهەڵە نیشان بدات وەك لەوەی دان بەهەڵەکانیدا بنێت و خۆی وەکو مرۆڤێکی ئاسایی دەرخات کە ئەویش مرۆڤە و هەڵە و ناتەواوی خۆی هەیە.

بەلأم ئەم خۆکردنەوەیە و دانی پەیامی ڕاستی (منی) و دەربڕینی هەستونەستەکان وەکو خۆی، پاداشتێکی بەکەڵکی هەیە، ئەویش دروستبوونی پەیوەندیەکی گەرموگوڕە لەگەڵ منداڵەکاندا، منداڵەکانمان ئەمان بینن وەکو

خۆمان هەین و ئەوانیش خۆیان وەکو خۆیان هەن دەرئەخەن بۆ ئێمــە، لــەجیاتی ئــەوەی کــە نــامۆ بــین لــە یــەکتری بەیەکەوە پێئەگەین و پەیوەندیەکی گەرم گەشە پێئەکات، بەمە پەیوەندیەکی ڕاست دائەمزرێنن لە نێوان لەنێوان دوو مرۆڤی سەربەستدا بەمە دایکوباوك خۆشی دایکوباوکایەتی خۆی دەست ئەکەوێت و مندالەکانیشی خۆشی مندالێەتی خۆیان دەست ئەکەوێت و گەشە ئەکەن، لــەم کاتــەدا چارەســەرکردنی گرفتــەکان ئاســانتر ئــەبێت و ئــەبێت بــەهۆی پێشکەوتنی کەسایەتیی مندالەکان و بەهێزکردنی پەیوەندی ناوخێزان نەك لاوازکردنی.

چارەسەری گیرگرفتەکان ئەتوانن کاربکەنەسەر ڕەفتاری مندالەکان بەگۆڕینی ژینگەی ناومالْ، زۆرجار هەولْ ئــەدەن کە مندالەکان ڕازی بکەن بە ژینگەی مالەوە و ڕایان بهێــنن لەســەری لــەجیاتی ئــەوەی کــە ژینگەکــە بگــۆڕن بــۆ مندالەکان کە ئەمەیان گەلێك ئاسان و سود بەخشترە، ئەم گۆڕینانە بۆ نموونە:

1. ژینگەی مالەکە دەولەمەندتر بکە و هەولبدە کەیاری زیاتر بۆ مندالەکان پەیدا بکەیت.
2. سنوری ژینگەکە دیاری بکە، ئەویش بەوەی جار جار بژاری یاریەکانی بکەیت.
3. باری قورس و گران لەبەردەست لابەرن.
4. هەولبدەن کە لەگەلْ مندالەکاندا پلانی شتکڕین بدەن.
5. هەولبدەن کە ئەو شتە خەتەرناکەی کە لەمالەکاندان لەشوێنی تایبەتی دایان بنێن.
6. کاتی ڕوودانی گۆڕانکاری لەمالەکەدا، مندالەکان ئاگاداربکەرەوە پێش ئەوەی گۆڕانکاریەکە بکرێت.

ئیتر لەمبارەیەوە دایکوباوك ئەتوانن کاری زۆر بکــەن کــە ببێــت بــەهۆی گــۆڕینی ڕەفتــاری مندالــەکان و گرفــت کەمکردنەوە.

پێویستیان بەوەیە کە بەشێوەیەکی تایبەتی ڕەفتار بکەن، هەرچەندە ئەزانن کە دایکوباوك بەمــە ڕازی نیــە و دژی خواســتی ئەوانــە، ئەمــە نــەك تــەنها ناتوانرێــت خــۆی لیّ لابــدرێت، بــەلکو زۆرجــاریش ڕووئــەدات و بەشــێکە لەپێکهاتووەکانی پەیوەندی نێوان دایکوباوك و مندالەکان، ئەمە گرفتی هەردووکیانــە، چــونکە هــەردوولا بەشــدارن لەگرفتەکەدا، ئەمە گرفتی پەیوەندیە، ئەمە ئەو گرفتانەیە کــە دایکوبــاوك نــاتوانن ڕەفتــاری مندالــەکان بگــۆڕن و ناشتوانن ڕەفتارەکان قبولْ بکەن.

حالەتی گیروگرفت سەنگی محەکە بۆ پێوانی پەیوەندی نێوان بەشداربووەکان، ئێستا پەیوەندیەکە تاقیئەکرێتەوە ئایا پەیوەندیەکە پەیوەندیەکی ڕاست و دروستە یان پەیوەندیەکی ساختەو ســەرزارەکیە؟ ئــەم گرتــە پەیوەندیەکــە بــەهێز ئەکات یان بێهێزی ئەکات؟ ئامارێکی خراپ یان چاکە دائەنێت لەسەر بەشداربووەکان؟ گرفت لەوانەیــە کــە خــەلکی لەیەك دووربخاتــەوە و لەوانەشــە خــەلکی لەیــەك نزیــك بکاتــەوە، لەوانەیــە بێــت بــەهۆی تاقیکردنەوەیــەکی بــاش لەپەیوەندیەکەدا و کەسانی ناو گرفتەکە زیاتر لەیەکتری بگەن.

چۆن گیروگرفت چارەسەر ئەکرێت، بە گرنگترین خالّی ناو پەیوەندی نێوان دایکوباوك و مندالەکان دائــەنرێت، کــەم دایکوباوك ئەوە ئەسەلمێنێت کە گیروگرفت بەشێکە لەژیان و مەرج نییە کە هەر مانای خراپی هەبێت، زۆربەی زۆری

دایکوباوك هەوڵئەدەن بەهەموو شێوەیەك  خۆیان لەگیروگرفت دووره پەرێز بگـرن، هـەم لەگـەڵ منداڵەکانـداو هـەم لەنێوان گەورەکاندا، هەندێك شانازی بەوەوە ئەکەن کە هەرگیز بیروڕای جیاواز نەبووە لەنێوانیاندا.

زۆر دایکوباوك تووشی سەغڵەتیەکی زۆر ئەبن کاتێك گیروگرفتێك دێتە ڕێگایان و نازانن چۆن چارەسەری گرفتەکـە بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ بکەن، کاتێك کە دوو خواستی جیاواز بەرەو ڕووی یەکتری ئەبنەوە، مانای ئەوەیە کە (ناکۆکی دروست ئەبێت) ئەمەش شتێکی ئاساییە لەهەموو پەیوەندیەکی کۆمەلاّیەتیدا، ئەو کۆمەڵەی کە ناکۆکی تێدا نەبێت زۆر نائاساییی ترە لەو کۆمەڵەی کە ناکۆکی تێدایـە، چـونکە هەرلایـەی خواسـت و ئـارەزووی جیـاوازی هەیـە کـە هەندێکجار ناگونجێت لەگەڵ خواست و ئارەزووی ئەویتر، نمونەی پەیوەندی بێ ئاژاوە ئەو خێزانەیە کەلایـەك هـەموو بڕیارەکانی ژیانی هەموو خێزانەکە ئەدات و گوێ بە خواست و ئارەزووی ئەندامانی تـری خێزانەکـە نـادات، لەگـەڵ ئەوەشدا کە ئاژاوە نابینرێت و نابیسترێت، بەلاّم تەندروستی خێزانەکە لەو خێزانە باشتر نیە کە دەمەقاڵێ و گفتوگۆی گەرمی تێدا ڕووئەدات و بەلای کەمەوە ڕێگا ئەدرێت بـە منداڵـەکان کـە بـزانن گرفـت چـۆن چارەسـەر ئـەکرێت و ئامادەبن بۆ گرفتی گەنجایەتی و ژیانی گەورەیی و سەریان سوڕ نەمێنێت لەڕوودانی گرفت لەدوا ڕۆژدا.

ئەمە گرنگە لەهەموو پەیوەندیەکی کۆمەلاّیەتیـدا (چـۆن گیروگرفـت چارەسـەر ئـەکرێت) چـەندایەتی گرفتـەکان گرنگیەکی کەمتری هەیە، لەبەرئەوە ئەتوانین بڵێین کە چارەسەرکردنی گرفتەکان پێوانەیەکی ڕاستەقیەیە بۆ ڕاسـتی و دروسـتی پەیوەندیەکـە، بـۆ هـارمۆنی یـان نـا هـارمۆنی پەیوەندیەکـە، خۆشـگوزەرانی پەیوەندیکـەرەکان  یـان ناخۆشگوزەرانییان بۆ گەرموگوڕی پەیوەندیەکە یان سارودسڕی.

دایك و باوك زۆرجار وائەزانن، کە گرفت حاڵەتێکە کە یەکێك ئەیباتـەوە و ئـەویتر ئەیـدۆڕێنێت، ئـەم چـاوەڕوانی بردنەوە یان دۆڕاندانە، سەرچاوەی ئەو ئێش و ئازارەیە کـە دایکوبـاوك هەیـەتی، ئایـا توندوتیـژی بـن (دایکوبـاوك بیباتەوە) یان نەرمونیان بن (منداڵەکان بیبەنەوە).

زۆر دایکوباوك گرفتی دسپلین لەمنداڵ پەروەردەکردندا بەوە لێکئەداتووە کە ئایا ڕەق بێت یان نـەرم، زۆردار بێـت یان زۆرلێکراو، جا لەبەرئەوەی کە کەوتونەتە ئەم بازنەی (یان) ەوە، لەبەرئەوە پەروەردە بەململانێك ئەبینن لە نێوان خواستەکاندا ململانێك بـۆ ئـەوەی دەربخـەن کـێ ئەیباتـەوە بـەکورتی شـەڕ ئـەم دایکوباوکانـە لەشـەڕدان لەگـەڵ منداڵەکانیاندا.

- ♦ باوکێك ووتی:

پیاو ئەبێت هەر لەزووەوە نیشانیان بدات کێ بڕیار ئەدات، ئەگینا سبەینێ گەورە ئـەبن و وجـودی ئێمـە نـازانن ئەمە گرفتی من و ژنەکەمە کە هەموو جارێك وازیان لێئەهێنێت کە ئەوان بیبەنەوە.

- ♦ دایکێك ووتی:

من گوێ نادەم بەوەی ئەو ئەڵێت چی و خەڵکی ئەڵێن چی، بەخوا نایهێڵم هـیچ کامیـان لەکچـەکان، ئـەو کۆاسـە کورتە لەبەربکەن، جائیتر چی ئەبێت بابیێت، سوێندێکە و خواردومە، ئەم شەڕە ئەبێت شـەڕی مـن بێـت و نـایهێڵم بدۆڕێم، هەروەها منداڵەکانیش پەیوەندیەکە بەشێوەی شەڕ لێکئەدەنەوە.

◆ کچێکی 12 ساڵان کە دایکوباوکی تورە ئەکرد بەوەی قسەیان لەگەڵ نەکات ووتی:

(سوودی چیە قسەیان لەگەڵ بکەیت، خۆ ئەوان هەر ئەیبەنەوە، چیان بوێت پێم ئەکەن و ئەبێت بەقسەی ئەوان بکەم، ئیتر ئەوان دایکوباوکان و ئەبێت هەر ئەوان بیبەنەوە، ئەوان وا ئەزانن کەلەسەر هەقن، جا بۆچی دەمی خۆم هیلاك بکەم، ئەزانم تورە ئەبن کەقسەناکەم، بەلاّم من گوێ نادەمێ).

◆ کورێك کە قوتابی ئامادەیی بوو ئاوای کرد:

(ئەگەر شتێك بێت ئەوا هەرگیز ناچم بۆلای دایکم، ئەو هەرلەخۆیەوە ئەڵێت (نا) لەبەرئەوە ڕائەوەستم تاکو باوکم دێتەوە ئەو بەئاسانتر ڕازی ئەکرێت و بەئاسانی ئەوەی بمەوێت پێیئەکەم).

بەداخەوە دایکوباوك هەوڵئەدەن کە گیروگرفت بەدوو ڕێگە چارەسەربکەن، کە هەردووکیان زەرەری هەیە بۆ کەسایەتیی منداڵەکان و پەیوەندییان لەگەڵ دایکوباوکدا و هەردوو ڕێگاکەش ئەو ئەنجامە باشە نادات بەدەستەوە کەواتە کاتێك کە گرفتێك ڕووئەدات، هەندێك دایکوباوك گرفتەکە بەبردنەوەی خۆیان و دۆڕاندنی منداڵەکان چارەسەر ئەکەن، هەندێکی تر بەپێچەوانەوە، بۆ ئەوەی بێدڵی منداڵەکان نەکەن و لەترسی گیروگرفت، وا ئەکەن کە منداڵەکان بیبەنەوە و خۆیان بدۆڕێن، ئەم دوو شێوەیە ناوئەبەین بە: ڕێگای یەکەم و ڕێگای دووەم.

◆ ڕێگای یەکەم: ئەم ڕێگایە وا کارئەکات:

باوکێك لەگەڵ منداڵەکەی تووشی گرفتی خواست ئەبن، باوکەکە بڕیار ئەدات چۆن گرفتەکە چارەسەر بکرێت بۆ منداڵەکە باس ئەکات کە چیبکات و هیوادارە کە منداڵەکە ڕازی بێت، ئەگەر منداڵەکە ڕازی ئەبوو، ئەوا ناچار پەنا ئەباتە قەناعەت پێکردن، ئەگەر ئەمەش دادی نەدا ئەوە ناچار پەنا ئەباتەبەر دەسەلاّتی باوکایەتی و هەڕەشەکردن.

◆ ڕێگای دووەم: ئەم ڕێگایە وا کارئەکات:

دایکێك تووشی گرفتی خواست ئەبێت لەگەڵ منداڵەکەی، دایکەکە پێشنیارێکی ئامادەی پێیە بۆی، کاتێك کە دایکەکە پێشنیارەکە ئەدات بە منداڵەکە، ئەوا ئەویش هەوڵ ئەدات دایکی ڕازی بکات بەشتێکی تر کە خۆی ئەیەوێت، ئەگەر دایکەکە بەوە ڕازی نەبوو، ئەوا منداڵەکە پەنا ئەباتە بەر دەسەلاّتداری خۆی و والە دایکەکە ئەکات کە ڕازی بێت و واز لە بیرەکەی خۆی بهێنێت.

بۆچی ئەم ڕێگای یەك و دووە سەرکەوتوو نییە؟

ئەو دایکوباوکەی ڕێگای یەکەم ئەگرێتەبەر، قوربانیەکی زۆر ئەدات، یەکەم منداڵەکە بەدڵی نیە کە بڕیارەکە جێبەجێ بکات، دووەم ڕق هەڵساندنی لە دایکوباوکی، سێهەم زەحمەتە بۆ دایکوباوك بتوانن بڕیارەکە بەمنداڵەکە جێبەجێ بکەن، چوارەم، ڕشێگا لەمنداڵەکە ئەگرێت کە خۆی بەخواستی خۆی بتوانێت دەست بەسەر خواستەکانی خۆیدا بگرێت.

کاتێك کە دایکوباوك، پێشنیارێکی ئامادەی پێیە بۆ چارەسەرکردنی گرفتی منداڵەکە، منداڵەکە موتیڤێکی زۆری ئەوێت بۆ ئەوەی کە ئەم کارە بکات، لەبەرئەوەی خۆی لەبڕیارەکەدا بەشدار نەبووە، منداڵەکە گوێی لێنەگیراوە،

لەوانەیە ئەم کارە بکات لەترسی دایکوباوك و سـزادانیان کەواتـە، منداڵەکـە نایـەوێت ئـەم بڕیـارە ئـەنجام بـدات، منداڵەکە هەست ئەکات کە بەزۆر ئەم کـارەی پێئەکـەن، هەرلەبـەر ئەمەیـە کـە زۆرجـار منـداڵ خـۆی ئەدزێتـەوە لەئەنجامدانی کارێك کە بەڕێگای یەکەم چارەسەر کرابێت، ئەگەر هەر زۆریشـیان لێبکـەیت، ئـەوە ئەوەنـدە کارەکـە ئەکەن کە پێویست بێت و یەك بست زیاتری نەکەن.

منداڵ بەربەرەکێی دایکوباوکی ئەکات کاتێك کە بەمشـێوەیە ناچـار بکرێـت کـە قبـوڵی چارەسـەری گرفتەکـەی بکرێت، منداڵەکان دایکوباوك بە نادادپـەروەر و ناهـەق لەقەڵـەم ئـەدەن، کەواتـە ڕاسـتە کـە دایکوبـاوك ئـەتوانن منداڵەکان ناچار بکەن کە بەگوێیان بکەن و ڕازیان بکەن بە ئەو چارەسەرەی کە ئەوان بۆ گرفتەکـەیان دانـاوە، بـەڵام ئەمە لەسەر حیسابی تێکچونی پەیوەندی نێوانیانە و لەجیاتی پەیوەندیەکی خۆشەویستیە.

هەروەها دایکوباوك پێویستە کاتێکی زۆر سەرف بکات بۆ ئەوەی بزانێـت کـە فەرمانەکـە جێبـەجێکراوە یـان نـا هەروەها ئەبێت کۆنترۆڵی بکەن و بیری بهێننەوە.

ئەو دایکوباوکەی ئەڵێت:

"هەرچەندە بەمنداڵەکەم ئەڵێم بەلام سودی نیە، دەنگم دەرئەهێنێت و ناچارم ئـەکات کـە دانیشـم بەدیاریـەوە بـۆ ئەوەی ئەوەی پێی ئەڵێم بیکات" ئەم دایکوباوکانە ڕێگەی پەروەردەی یەکەم بەکارئەهێنن و هـۆی یارمـەتی نـەدانی منداڵەکە لەکارەکانی خێزاندا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە منداڵەکە ڕێگەی نەدراوە کە بەشداری ژیانی سادەی خێزانەکە بکات و بەشێك بێت لە خێزانەکە، بەڵکو هەمیشە کارەکانی بەسەردا سەپێندراوە و ناچارکراوە کە جێبەجێیان بکات بەپێی خواستی دایکوباوك.

ئەنجامێکی تری ئەم شێوەی پەروەردە نیە، ئەوەیە کە ڕێگانـادات بـە منداڵەکـە کـە خـۆی فێـری دەسـت بەسـەر خۆداگرتن و هەست بە لێپرسراوی بکات و ئەم هەستانە پێشـبخات، چـونکە ئـەم هەسـتانە بـەهۆی بەشـداربوونەوە دروست ئەبێت و کارێکی پەروەردەیی ڕۆژانەی ئەوێت.

یەکێك لە هەڵە دێرینەکانی پەروەردە ئەوەیە کە ئەگەر منداڵەکە ناچار بکرێت کە شـتێك بکـات هـەر لەئێسـتاوە ئەوە فێر ئەبێت کە بەگەورەیش بیکات، ڕاستە منداڵی دایکوباوکی توندوتیژ بەدەسەڵات، گوێڕایـەڵ تـر و بەئاسـانی مامەڵەی لەگەڵ ئەکرێت، بەڵام ئەمجۆرە منداڵانە هەست بە لێپرسراوی ئەکەن و کارەکانیان ئەبەن بەڕێوە کاتێـك کـە کۆنترۆڵ ئەکرێن لەلایەن کەسێکی ترەوە، کەواتە ئەمانە ناتوانن کۆنترۆڵی ڕەفتاری خۆیان بکەن و هەمیشە پێویستیان بە کۆنترۆڵی دەرەوەیی هەیە، ئەمە ناچاریان ئەکات کە هەمیشە بگەڕێن بەدوایی کەسێکدا کـە ئـەم کۆنترۆڵـەیان بـۆ بکات بەبێ ئەم کۆنترۆڵە منداڵەکان سەریان لێتێکئەچێت و نازانن چۆن ڕەفتار بکەن، چونکە هەرگیز ڕێگایان نەدراوە کە خۆیان کۆنترۆڵی خواست و ڕەفتاری خۆیان بکەن.

کەواتە هەرجارێك کە دایکوباوك منداڵەکەی ناچار ئەکات کە شتێك بکات، ئـەوە هـەلێکی لەدەسـت ئـەدات کـە فێری دەست بەسەر خواداگرتن و لێپرسراوی خۆی بێت.

ڕێگای دووەم کەڵکی نیە

چی ئەبێت ئەگەر منداڵێك هەمیشە بەخواست و ئارەزووی خۆی بکات؟ چی ئەبێت کاتێك کە منداڵ هەمیشە خواستەکانی وەکو خۆی ئەیەوێت بۆی ئەچێتەسەر؟

شکی تێدانیە کە ئەم منداڵە لەمنداڵی ڕێگەی یەکەم جیاوازترە، ئەو منداڵەی هەمیشە ئەیباتەوە و بەقسەی ئەکرێت، ئەوەندە مانگر نابێت و ئەوەندە دوژمنایەتی ناکات، ئەوەندە ئیعتماد ناکاتەسەر خەڵکی لە چارەسەرکردنی گرفتەکانی، شەڕانی نابێت و بەئاسانیش کۆنترۆڵی ناکرێت، ساختەچیەتی و درۆ و دەلەسە ناکات بۆ ئەوەی داواکانی بۆ جێبەجێ بکرێت، چونکە ئەم منداڵانە پێویستیان بەوە نەبووە کە هۆ بهێننەوە بۆ ئەوەی خۆیان لە دەسەڵاتداریەتی و زوڵمی دایکوباوك ڕزگار بکەن، ڕێگای دووەم منداڵ هانئەدات کە دەسەلاتی خۆی بەکاربهێنێت بۆ سەرکەوتن بەسەر دایکوباوکدا، ئەم دەسەلاتە بەهۆی توڕەبوونەوە بەکارئەهێنێت، ئەم منداڵانە ئەزانن کە چۆن گوناهباری بخنەسەر دایکوباوکیان و ئەوان گوناهبار بکەن، ئەمانە فێربوون چۆن بەڕەخنەو بێشەرمانە قسە لەگەڵ دایکوباوکیاندا بکەن، ئەمانە زۆرجار هارن و لەپڕ هەڵئەچن، هاوڕێیەتی کردنیان گرانە، ئەمانە واتێگەیشتوون کە پێویستیەکانی ئەمان لەپێش هەموو کەسێکەوەیە و ئەمان لەهەموو کەسێك گرنگترن، ئەمانە فێرنەبوون کۆنترۆڵی ڕەفتاری خۆیان بکەن و خۆپەرستن و داوایان زۆرە، ئەم منداڵانە کەمجار ڕێزی هەست و خواستی کەسانی دەوروبەر ئەگرن، ژیان بەلایانەوە بریتیە لە وەرگرتن و بردن، ئەمانە یاریەتیدەر نین و خۆیان لەبەرپرسیاری نەدزنەوە، زۆرجار تووشی گیروگرفت دێن لە پەیوەندیدا لەگەڵ دەوربەر، هاوڕێکانیان خۆشیان ناوێن، چونکە هەڵسان و دانیشتن لەگەڵ ئەمجۆرە منداڵانەدا خۆش نیە، لەبەرئەوەی لەدەرەوەش هەمان ڕەفتار ئەکەن، لەبەرئەوە تووشی ئازار و ناخۆشی دێن.

ناخۆشترین ئەنجامی ئەم پەروەردەیە ئەوەیە کە منداڵەکان وردە وردە شك لە خۆشەویستی دایکوباوکیان ئەکەن بۆیان لەڕێگەی یەکەمدا ڕقی دایکوباوك بەسەر منداڵەکەدا ئەشکێتەوە و لەڕێگەی دووەمدا ڕقی منداڵ بەسەر دایکوباوکدا ئەشکێتەوە، چونکە منداڵەکان هەست ئەکەن کە دایکوباوکە زۆرجار توڕە و ڕقاوین کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هیچ ناکەن، سەیرنیە کە هەمان هەستیان هەیە لەناو هاوڕێکانیاندا و هەست ئەکەن کە بەڕاستی خۆشەویست نین، دایکوباوك منداڵی ئاوا هەستەکانی بەم شێوەیە دەرئەبڕێت.

ئەو بەهەوەسی خۆی شت ئەکات، پیاو ناتوانێت قسەی لەگەڵ بکات ئەو هەڵئەچێت، بۆیە حەزئەکەم لەمەکتەب بێت، من هەرئەوکاتەم خۆشە کە ئەو لەماڵ نیە.

## هەندێك گرفتی تر

- کەم دایکوباوك هەن کە ڕێگەی یەك یان دوو بەتەنها بەکاربهێنن، بەشێوەیەکی گشتی یەکێکیان ڕێگەی یەکەم و ئەویتریان ڕێگەی دووەم بەکارئەهێنن، ئەمە هۆیەکی گرنگە بۆ ئەوەی کە هەندێك منداڵ سەر لێشێواو

دەرئەچن، لەوانەیە نەبوونی سوربوون لەسەر بڕیارێك بۆ پەروەردەی منداڵ، خراپتر بێت لـە پەروەردەیـەکی سەخت.

- هەندێك دایکوباوك ڕێگـەی دوو بەکائـەهێنن و وردە وردە کاتێـك کـە منداڵـەکان گـەورەتر ئـەبن و نـاتوانن بەئاسانی مامەڵەیان لەگەڵ بکەن، ئەوسا ئەیگۆڕن بۆ ڕێگەی یەك زۆر ئاشکرایە کە وازهێنان لەمنداڵ کـە بەئارەزووی خۆی ڕەفتار بکات و دوایی کە دایکوباوکەکە نەیانتوانی کۆنترۆڵی بکەن، ڕێگـای یـەك بـەکار بهێنن، زەرەرێکی زۆری هەیـە لەپـەروەردەدا، هەنـدێکی تـر دەسـت ئـەکات بەڕێگـەی یەکـەم و دوایـی ئەیگۆڕێت بۆ ڕێگەی دووەم ئەمە لەگەڵ منداڵی ڕقاویدا بەکار ئەهێنرێت، هەتاکو وایلێدێت کە دایکوباوك ناتوانن لەسەر ئەم ڕێگەیە بڕۆن و ئەیگۆڕن بۆ ڕێگەی دووەم، بەمەش منداڵەکە هەتاکو بێت دڵخوازیەکانی زیاد ئەکات.
- دایکوباوکی واهەن کەڕێگەی یەکەم لەگەڵ منداڵی یەکەم و ڕێگەی دووەم لەگـەڵ منـداڵی دووەم بەکارئـەهێنن بەهیوای ئەوەی کە ئەم ڕێگەیان باشتر بێت، لەمجۆرە خێزانانەدا هەمیشە گوێت لـە منـداڵی گەورەیـە کـە بەخراپی باسی منداڵی بچوك ئەکات و ڕقی لێیئەبێتەوە. بۆیە جاری واهەیە کە ئەڵێت " ئەو بـۆی هەیـە هەموو شتێك بکات، ئەمە وا نیشان ئەدات کە دایکوباوك هەمیشە لایـەنی منـداڵی بچـوك ئـەگرن یـان ئەویان زیاتر خۆشئەوێت.
- شێوەیەکی باو، بەتایبەتی لەنێوان ئەو دایکوباوکانەی کـە گوێیـان نـەداوە منداڵەکـە بـۆ ماوەیـەکی زۆر کـە هەرچی ئەکات بیکات هەتاکو منداڵەکە شـتێکی وائـەکات کـە ئـەمان پێـی ڕازی نـابن و ئەوسـا پـەنا ئەبەنەبەر شێوەی یەکەم، ئەوسا کارەساتی شەڕوشۆڕ لەناومالّدا دەست پێئەکات.

## باوكێك ووتی:

" من وازی لێئەهێنم چی ئەکات بیکات، تاکو ئەو کاتەی من توڕە ناکات، بەلاّم لەوە زیاتر بـڕوات خـوا ئـەزانێت چی پێئەکەم".

زۆر دایکوباوك بەندە بەڕێگەی یەك یـان دووەوە، دایکوباوکێـك لەوانەیـە لـە لایـەنگیرانی ڕێگـەی یەکـەم بێـت، لەبەرئەوەی کەبڕوای پێیەتی یان وافێربووە، بەلاّم کاتێك کەبۆی دەرئەکەوێت کـە ئـەم ڕێگەیـە ڕاسـت نیـە، ئـیتر ڕووئەکاتە ڕێگەی دووەم و واز لە منداڵەکەی ئەهێنێت کە چیئەکات بیکـات، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە ئـەزانێت کـە ئەمەش ڕاست نیە.

دایکوباوکی وا هەیە کەڕێگەی دووەم هەڵئەبژێرن، لەبەرئەوەی کـە ڕێگـەی یەکـەم لەگـەڵ ئایدۆرلۆجیـەتی ئـەوان ڕێکناکەوێت یان بڕوای کە ڕێگەی یەکەم لەگەڵ ئایۆدلۆجیەتی ئـەوان ڕێکناکـەوێت یـان بـڕوای بـە ئـەکتوریتێتی باوکایەتی نیە یاخود ئەوەندە توانای نیە کـە بـەرەنگاری گرفتـەکانی نـاو خێـزان ببێتـەوە و بەشـێوەیەکی ڕاسـت چارەسەریان بکات.

## ڕێگەی سێهەم ------------- هەردوولا ئەبیەنەوە

ڕێگەیەکە کە مرۆڤ لەژیانی کۆمەڵایەتی ڕۆژانەیدا بەکاری هێناوە و بەکاری ئەهێنێت، کەچی کاتێك باس دێتەسەر پەروەردە مرۆڤ ئەم ڕێگە بەکەڵکە لەیاد ئەکات و بەکاری ناهێنێت، ئەم ڕێگەیە لەچارەسەری ناکۆکی نێوان کارکەر و خاوەنکاردا بەکارئەهێنرێت، لە چارەسەرکردنی ناکۆکی نێوان گەلانی شەڕکەردا بەکارئەهێنرێت، لەنێوان کڕیار و فرۆشیاردا بەکارئەهێنرێت، لەچارەسەرکردنی ناکۆکی نێوان دوو هۆزدا بەکارئەهێنرێت، ئەم ڕێگەیە ڕێگەی بەکارنەهێنانی هێزە ئەم ڕێگەیە ڕێگەی بەکارهێنانی مساوەمەیە کەواتە لەم ڕێگەیەدا هیچ لایەك نایدۆڕێنێت و خۆی بە سەرکەوتوو ئەزانێت، وە لەراستیشدا باشترین چارەسەر بۆ گیروگرفتێك ئەوەیە کە هیچ لایەك هەستی دۆڕاوی تێدا دروست نەبێت و خۆی بە ژێرکەوتوو ئەزانێت، چونکە زۆربەی جار وا ئەبێت کە منداڵ بەرەنگاری پێشنیارێك یان چارەسەرێك ئەبێتەوە لەبەرئەوەی خۆی بە ژێرکەوتوو و دۆڕاو ئەزانێت کەواتە ڕێگەی سێهەم ڕێگەیەکە کە هەردوولا ئەیباتەوە یان ڕێگەیەکە کەهیچ لایەك راست یان هەڵە نیە و هەرلایەی بەوشێوەیەی کە خۆی سەیری باسەکە ئەکات، ڕاستەو پێویستە ڕێزی خۆی هەبێت شێوەی بەکارهێنانی ئەم ڕێگەیە ئاوایە:

دایکوباوك توشی گرفتی خواست ئەبن لەگەڵ منداڵەکەیان، دایکوباوکەکە پێشنیاری ئەوە ئەکەن کەبەیەکەوە گرفتەکە چارەسەربکەن، بۆ ئەمش داوای پێشنیار لەمنداڵەکە و خۆشیان پێشنیاری خۆیان پێشکەش ئەکەن، هەردوولا پێشنیارەکان هەڵئەسەنگێنن و بەچاوی ڕەخنەو سەیریان ئەکەن تاکو بەهەردوولا پێشنیارێك ئەدۆزنەوە کە هەردوولا پێی ڕازی بن و لەسەری ڕێکبکەون، دوای ئەوەی کە چارەیەکیان دۆزیەوە کە هەردوولا پێیڕازی بن ئیتر پێویست بەوە ناکات کە هیچ لایەکیان زوڕنای سەرکەوتن لێبدات و خۆی بەسەرکەوتوو بەرامبەرەکەی بە ژێرکەوتوو لەقەڵەم بدات.

بالێرەدا نمونەیەك بهێنینەوە کە لەژیانی ڕۆژانەی هەموو خێزانێکی منداڵداردا ڕوودەدات و هەموو جارێك هەمان ئەنجامی هەیە و هەموو جارێك بەهەمان ئەنجام ئەگات، ئەویش منداڵ و جل لەبەرکردنە کە لەساڵانی یەکەمی ژیاندا و بەتایبەتی لەساڵانی دوو تا حەوتساڵیدا دووبارە ئەبێتەوە و ئاژاوە ئەخاتە ژیانی خێزانەکەوە.

بابڵێین منداڵەکەت نایەوێت پاڵتۆی بارانەکەی لەبەربکات و سورە لەسەرئەوەی کە بەبێ پاڵتۆ بچێتەدەرەوە، تۆش ئەترسیت کە نەخۆش بکەوێت و داوای لێئەکەیت کە ئەبێت هەرلەبەری بکات، ئیتر شەڕی جل لەبەرکردن ئامادەیە و باقیەکەی دایکوباوك خۆیان ئەزانن چی ئەبێت، یان ئەوەتا زۆری لێئەکەن و هەڕەشەی ئەوەی لێئەکەن کە تۆڵەی لێبکەنەوە یان وازی لێئەهێنن چۆن ئەکات بیکات و ئاژاوە نەنێتەوە، بەمانایەکی تر ڕێگەی یەکەم یان ڕێگەی دووەم بەکارئەهێنن، بەڵام بە بەکارهێنانی سێهەم کارەکە ئاوای لێدێت.

بینایی: خواحافیز، وامن ڕۆیشتم.

باوك: ڕۆڵە بارانە و تۆش پاڵتۆی بارانەکەت لەبەر نیە.

بیانیی: پێویستم بە پاڵتۆی باران ینە.

باوك: ئاخر باران زۆر ئەبارێت و جلەکانت تەڕئەبن و نەخۆش ئەکەویت.

بینایی: من ئەو پاڵتۆی بارانە لەبەرناکەم و بڕایەوە.

باوك: لەوە ئەچێت بە مقاشیش نەتەوێت ئەو پاڵتۆیە بگریت؟

بینایی: بەڵێ من ڕق م لەو پاڵتۆیەیە.

باوك: بۆچی ئەوەندە ڕقت لەو پاڵتۆیەیە.

بینایی: لەبەرئەوەی سەوزی خەت خەتە.

باوك: کەواتە لەبەرئەوەی سەوزی خەت خەتە بۆیە حەزی لێناکەیت؟

بینایی: تەنها کەسێك نیە لەهەموو قوتابخانەکەماندا کە جلێکی وای لەبەربێت من نەبێت.

باوك: تۆ ناتەوێت تەنها کەسێك بیت لەقوتابخانەکەدا کەشتێکی لەبەربێت کە کەس لەبەری نەبێت؟

بینایی: نەخێر نامەوێت هەموو ئەوانی تر پاڵتۆی یەك ڕەنگیان لەبەرە.

باوك: ئەها، ئێستا تێگەیشتم، ڕاست ئەکەیت ناخۆشە ئیتر چی بکەین، تۆ ناتەوێت پاڵتۆکە لەبەربکەیت، چونکە سەوزی خەتەو منیش نامەوێت تۆ بەبێ پاڵتۆ بچیتەدەرەوە و نەخۆش بکەویت، ئەی باشە چیبکەین؟ چارێکت هەیە بۆ ئەمە؟

بینایی: (هەندێك بیرئەکاتەوە) بابزانم هینەکەی دایە قەرز ناکەم؟

باوك : کامەیان؟ سپیەکە؟

بینایی ئا:

باوك: لەو بڕوایەدای کە دایە پێویستی پێی نیە؟

بینایی: باپرسیاری لێبکەم، کە دێتەوە پاڵتۆکەی دایەی پێیە و ئەڵێت کە دایە ووتی باشە.

باوك: ئێستا باشترە؟

بینایی: ئا زۆر باشترە، خواحافیز.

باوك: خواحافیز و ئاگات لەخۆت بێت.

کەواتە لێرەدا هەردوو، بینایی و باوکی گرفتەکەیان بەشێوەیەك چارەسەر کردکە هەردووکیان ڕازیبوون و بەزووتریش گفتەکە چارەسەرکراو باوکەکە پێویستی بەوەنەبوو کە خۆی توڕەبکات و هەوڵبدات کە منداڵەکەی ڕازی بکات یان هەڕەشەی لێبکات، بینایش پێویستی بەوە نەبوو کە باوکی ڕازی بکات یان هەڕەشەی ئەوە بکات کە لەدەرەوە دایئەکەنێتەوە و لەبەری ناکات، کەواتە هیچ لایەکیان دەسەلآت و هێزیان بەکار نەهێناو لەگرفتەکە ڕزگاریان بوو بەبێ ئەوەی کەهەست بە ژێرکەوتوویی بکەن یان ئالآی سەرکەوتن و خۆ بەباشتر هەڵکەن و باوکەکە بەدڵ بە بینایی ووت کە خواحافیزت بێت و بینایش بەدڵێکی خۆشەوە ماڵەکەی بەجێهێشت.

ئەم ڕێگەی سێهەمە، شتێکی گرنگی تێدایە کە زۆرجار دایکوباوك لەبیرئەکات ئەویش ئەوەیە کە هەر خێزانەی بەشێوەیەك هەمان گرفت چارەسەر ئەکات، کەواتە ڕێگەی سێهەم ڕێگەیەکە بۆ دۆزینەوەی چارەیەك بۆ گرفتەکە و

ڕێگەیەك نیە بۆ دۆزینەوەی باشترین چارە کە باش بێت بۆ هەموو خێزانەکان یاخود ئەتوانین بڵێین کە ڕێگەی سێهەم ڕێگەیەکە بۆ ئەوەی یارمەتی دایکوباوکێکی تایبەتی و منداڵە تایبەتەکەیان بدات کە گرفتێکی تایبەتی بە شێوەیەکی تایبەتی چارەسەر بکەن کە هەردوولا پێیڕازی بن.

کەواتە خێزانێکی تر هەمان گرفتی پاڵتۆکە بەشێوەیەکی تر چارەسەر ئەکات، لەوانەیە خێزانێکی تر چەترێك بدات بە منداڵەکەی و خێزانێکی ر بە ئوتومبیل منداڵەکەی بەرێت بۆ قوتابخانە و خێزانێکی تر پەیمانی بداتیَ کە سبنەینیَ پاڵتۆیەکی بۆ بکڕێت بەدڵی خۆی و بەم شێوەیە.

هەندێك پەروەردەکار و شارەزایانی منداڵ چارەسەری (ڕاست) و مادەکراو ئەدەن بە دایکوباوکە کە ئەمەوە وا ئەکات دایکوباوك بترسن لەوەی چارەسەرەکانی ئەوان ڕاست نەبێت و نەگونجێت لەگەڵ چارەسەری شارەزاکەدا و بکەونە شکەوە لە چارەسەری هەموو گرفتەکانی تریشد وەك کاتی چوونە سەر جێگا، ڕەوشتی نانخواردن پەنجە مژین، میزکردن لەناو جێگادا، سەیرکردنی تەلەفزیۆن و..... هتد.

## بۆچی ڕێگەی سێهەم ئەوەندە کاریگەرە؟

منداڵەکان خۆیان فێرئەبن حەز لەدۆزینەوەی چارە و جێبەجێکردنی بن:

ئەم ڕێگەیە سوود لە پرنسیپی بەشداربوون وەرئەگرێت لە چارەسەرکردنی گرفتەکان کە ئەمە ئەبێت بەهۆی ئەوەی منداڵەکە زیاتر ئامادەبێت بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکان، چونکە مرۆڤ باشتر ئامادەیە کارێك بکات کە خۆی بەشداری لەدانانیدا کردبێت، هەرچەندە هەمیشە وانابێت وەکو دایکوباوك ئەیەوێت و منداڵەکە کارەکان وەکو خۆی ناکات لەگەڵ ئەوەشدا ئیحتمالی کردنی زیاترە کاتێك کە بەم شێوەیە لەسەری ڕێككەوتبن، چونکە منداڵەکان وا هەست ئەکەن کە خۆیان لەبڕیارەکەدا بەشداریان کردووە وەکو دایکوباوکیان، لەبەرئەوەی هەست بەلێپرسراویەك ئەکەن، هەروەها منداڵەکان هەست بە چاکیەك ئەکەن لەوەی کە دایکوباوکیان وازی لەوە هێناوە کە بەئاسانی ئەیتوانی بەسەریاندا سەرکەوێت و خۆی بڕیاری خۆی بدات بەبیَ ئەوەی ئەوان بەشدارب بکات، هەروەها ئەو چارەسەرانەی کە دایکوباوك و منداڵەکان لەسەری ڕێکئەکەون، زۆرجار چارەسەری منداڵەکانە، بۆیە ئەوانیش بەئاسانی ئەیبەنبەڕێوە باوکێك گێڕایەوە.

هەموو ڕۆژێك کە ئەهاتمەوە ماڵەوە منداڵەکەمان کە چوار ساڵان بوو، خۆی پێمدا هەڵئەواسی، منیش لەڕاستیدا زۆر هیلاك ئەبم لەکار و ڕێگایەکی دووریش ئەبڕم لەنێوان ماڵەوە و کاردا و ئەمەوێت هەندێك ڕاکشێم و سەرخەوێك بشکێنم، لەڕاستیدا هەردوو شێوەی پێشوم بەکارهێنابوو و هیچ ناچار نەبوو نەشمئەویست دڵی منداڵەکە ئەوەندەی تر بریندار بکەم، نەشمئەزانی کە ئەگەر زۆری لێبکەم، ئەوە ئەوەندەی تر کارەکە خراپتر ئەبێت، ڕۆژێکیان بانگم کرد و هەموو ئەمانەم بۆ باسکرد و وتم تۆ ئەڵێیت چی چیبکەین؟ زۆری نەخایان ئەو وتی کە ئەگەر وازت لێبهێنم تۆ نانەکەت بخۆیت و پشویەك بدەیت، یاریم لەگەڵ ئەکەیت دوایی؟ منیش ووتم باشە و لەسەرئەوە ڕێككەوتین، ئیتر

دوایی ئەم ڕووداوە ئەگەر کەسێك بیویستایە خەبەرم بکاتەوە یان نەهێڵێت بە ئاسـودەیی نانەکـەم بخـۆم، ئـەوە ئـەو ئەیوت کە ئێستا وەختی نییە و بابە پشو ئەدات و دوایی کە هەڵسا یاریم لەگەڵ ئەکات.

ئەم نمونەیە دەریئەخات کە چەند بەلای منداڵەکەوە گرنگە کـە پەیمانەکـە جێبـەجێ بکرێـت کـە خـۆی بەشـداری تێداکردووە، لەبەرئەوە ئەم ڕێگەیە والە منداڵـەکان ئـەکات کـە پـەیڕەوی بـەڕێوەبردنی پەیمانەکـە بکـەن و هەسـت بەوەبکەن کە دایکوباوك بڕوای پێیانە، کاتێکیش منداڵەکان زانیان کـە گـەورەکان بڕوایـان پێیانـە، ئـەوە ئیحتمـال زۆرترە کە ڕەفتاریان بگۆڕن.

## بەشی دووەم

### پرسیاری 1 منداڵەکەم سێ ساڵانە و فێری ئەوە بووە کاتێك ئەچین بۆ میوانی شت ئەخاتـە گیرفانیـەوە ، هەرچەند هەوڵمدا لەگەڵیدا، بەڵام سوودی نەبوو، ناچاربووم گوێچکەیم گرت و لێـی تـووڕە بـووم، بـەڵام سوودی نیە و ئێستا نازانم چیبکەم.

بۆ ئەوەی بە دوور و درێژی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە باشتر وایـە بـەم پرسـیارە دەسـت پێبکـەین و لـەخۆمان بپرسین ویژدان چیە و چۆن دروست ئەبێت؟

### ویژدان چیە و چۆن دروست ئەبێت؟

بۆ ئەوەی باسی ویژدان بکەین و دروستبوون و پێشکەوتنی ویژدان جیاکەینەوە لە پێشکەوتنی فیزیۆلۆجی لـەش و لارەوە باشتر وایە لەپێشا ئەوە بسەلمێنین کە هەمـوو پێشکەوتنێکی فیزیۆلـۆجی ڕوو ئـەدات بەشـێوەیەکی عەفـەوی ئەمە شتێکی بۆماوەیە و بەرۆخێکی تایبەتی خۆیدا ئەڕوات، بەڵام دروستبوون و پێشکەوتنی ویژدان پەیوەنـدی بـەو پەروەردەیەوە هەیە کە منداڵ وەریئـەگرێت لـە دایکوباوکیـەوە، ئەمـە بۆیـە گرنگـە چـونکە هەنـدێك ئـەڵێن کـە منداڵەکەیان گەورە بوو ئیتر ئەویش ویژدانی بۆ دروسـت ئـەبێت، کـە ئـەم بـیرە هەڵەیـەیان وایـان لێ ئـەکات کـە کەمتەرخەمی بکەن لەم بارەیەوە و لە دواڕۆژیشدا منداڵێکیان بۆ دروست ببێت کە تەنها بە ئارەزووی خۆی بکات و نەزانێت ویژدان چیە، کەواتە پێشکەوتن و فێربوونی هەڵسوکەوت و ڕەفتـاری کۆمەڵایـەتی بەسـتراوە بـە فێربـوون و فێرکردنەوە و لەخۆیەوە ڕونادات، منداڵێکی بچوك ناتوانێت کۆنترۆڵی خواستی خۆی بکات ئەگەر ئێمە فێری نەکەین چونکە ئەم منداڵە جارێ هیچ ئامێرێکی کۆنترۆڵی بەدەستەوە نیە کە کۆنترۆڵی خواستی خۆی پێبکات و (منداڵێکی گوێڕایەڵ و ئاقڵ) یاخود (بیر لەکەسانی تریش بکاتەوە) ئەم ئامێری کۆنترۆڵە دایکوباوك ئەیدات بە منداڵەکـەی کـە دوایی ئەویش ئەیکات بەهینی خۆی.

کاتێك منداڵێکی (20) ساڵان ئەیەوێت ڕەفتارێك بکات، دایکوباوك داوای لێ ئەکەن کە نەیکات و پێی ئەڵێن (مەکە) یاخود پێیان خۆشەو بۆی (پێئەکەنن) ئەم ڕازیبوون یان نەبوونەی دایکوباوك یەکەم بەردی بناغەی دەستوور و یاسایەك دا ئەنێت بۆ منداڵەکە کە لەدەستور و یاسای دایکوباوکەوە هاتووە و لەبەر خۆشەویستی وپشت بەستنی بە دایکوباوك، منداڵەکە فێر ئەبێت بزانێت ئەوان چیان پێ باشە و چیان پێ باش نیە، بەمانایەکی تر چی بۆ هەیە و چی بۆ نیە بیکات یان نەیکات، ئەم پێخۆشبوونە یان نەبوونە بناغەی سیستمێکی کۆنترۆڵ دائەنێت لەویژدانی منداڵەکەدا.

بەلاّم تێگەیشتنی منداڵەکە خۆی لەویژدان و کردنی بەبەشێك لەکەسایەتیی خۆی زۆرتر ئەخایەنێت، هەربۆیە کاتێك بەمنداڵێکی دووساڵانە ئەڵێت کە کارێك ئەکات ئەو هەر ئەیکات و بەگوێت ناکات، چونکە ئەم منداڵە جارێ ئەم سیستمی کۆنترۆڵەی بۆ دروست نەبووە و چەند ساڵێکی تری ئەوێت بۆ ئەمە، بەلاّم منداڵێکی (3-4) ساڵان ئەتوانێت هەندێك لەو سیستمە تێبگات و لەسەری بڕوات، لەتەمەنی (5-6) ساڵاندا منداڵ بەباشی ئەتوانێت دەست بەسەر خواستی خۆیدا بگرێت و بەپێی ئەو پەروەردەیە ڕەفتار بکات کە دایکوباوك داوایانەتێ و لەتەمەنی باڵقیدا مرۆڤ ئەم ڕەفتارانە ئەکات بە بەشێك لەکەسایەتیی خۆی و لەسەریان ئەڕوات.

لێرەدا ئەبینین کە ویژدان پەیوەندی هەیە بە پەروەردەکردنەوە و شتێکی بۆ ماوە نیە لەگەڵ مرۆڤدا بێت لەکاتی لەدایك بووندا، هەر لە بەرئەمەیە کە باسی ویژدان ئەکەین کاتێك باسی منداڵی ساوا ئەکەین.

ئەم سیستەمی کۆنترۆڵەی کە باسی ئەکەین تاکو تەمەنی (3) ساڵیش پەیوەندی بە دەرەوەی منداڵەکە هەیەو هەتاکو ئێستا منداڵ ئەم کۆنترۆڵەی بۆ دروست نەبوو، جابۆیە کاتێك منداڵێکی دوو ساڵان ئەیەوێت هێلکەیەك بدات بەزەویدا و بیشکێنێت ئەوە لەبەرئەوەیە کە ناتوانێت بەرهەڵستی خواستی خواستی خۆی بکات، ئەم منداڵە نازانێت بۆ وائەکات، بەمانایەکی تر ناتوانێت دەست بەسەر خواستی خۆیدا بگرێت، بەلاّم کاتێك دایکی لەوێ بێت ئەوا سەیری ئەکات بۆ ئەوەی بزانێت ئەو پێی خۆشە یان نا، پێخۆشی و پێناخۆشی دایکوباوك ئەبێت بە نیشانەیەك بۆ منداڵەکە کە کارەکەی بکات یان نا، ئەگەر ئەمان توانای ئەوەیان هەبێت کە بەبێ توڕەبوون بۆ منداڵەکەی ڕونبکەنەوە کە بۆی نیە ئەم کارەبکات ئەوە بە چەند جارێك منداڵەکە تێئەگات و کارەکە ناکات، بەلاّم کاتێك کە توڕە بوون بێت بەوەی منداڵەکە کارەکەی نەکات، ئەمە مانای ئەوەیە کە ئەم منداڵە پێویستی بەوە هەیە کە هەرجارێك ویستی شتێك بکات ئەبێت کەسێك هەبێت پێی بڵێیت ئەو کارە نەکات، چونکە خۆی ناتوانێت ئەم بڕیارە بدات.

ئەگەر پرسیار لە خۆمان بکەین و بڵێین کە ئایا ئەم منداڵە چ ئامێرێکی بەدەستەوەیە بۆ ئەوەی ڕەفتارێك بکات یان نەکات، وەلاّمەکەی ئەوە ئەبێت کە ئەم منداڵە ئامێری خۆشەویستی و پێویستی بە دایکوباوکی بەدەستەوەیە بۆ کردن یان نەکردنی، پێخۆشبوون یان نەبوونی ئەوان کار ئەکاتەسەر ڕەفتاری منداڵەکە.

دایکوباوکی وا هەن ئەڵێن (چەندی پێ ئەڵێین سوودی نیە، ئەو هەر بەقسەمان ناکات) لەڕاستیدا ئەمە تاکو ئەو کاتەی کە منداڵەکە زمانێکی بۆ دروست ئەبێت و ئەتوانێت بەهۆی قسەکردنەوە لەگەڵماندا کۆنترۆڵی خواستەکانی خۆی بکات ئەخاینێت و تا ئەو کاتە پێوتنەوە و دووبارە کردنەوە و بەردەوامبوون و کۆڵنەدان لەدەربڕینی ڕازیبوون و

ڕازی نەبوونمان لە کردەوەکانی پێویستە، تاکو ئەبینین کە منداڵ لەتەمەنی دوو ساڵ و دووساڵ و نیودا ئیتر هەوڵ ئەدات یارمەتیمان بدات و لەنیوەڕێ بەیەك ئەگەین و منداڵەکە بەشتێکی تر ڕازی ئەبێت، ئەمە مانای ئەوەیە دایکوباوك پێویستە ڕێگای (ئەڵترناتیڤ) بەکاربهێنن لەگەڵ منداڵەکەیان.

ئێستا لەوانەیە دایکانوباوکان بڵێن کە ئەمە ووتنی لەکردنی ئاسانترە و کێ ئەتوانێت منداڵێك ڕازی بکات بەیاریەکی تر کاتێك کەڕقی هەڵساو پێی لێداگرتیی و وتی من ئەو یاریەم ناوێت و هەر یاریەکەی خۆمم ئەوێتەوە لە وەڵامی ئەو دایکوباوکانەدا ئەبێت بڵێین کە بەڵێ ئەمە ئەکرێت و کارێکی نامومکین نیە، بەڵام ئەمە کارێکی درێژخایەنە و توانای ئەوێت کە بتوانێت دووبارە و سەدبارەی بکەیتەوە بەبێ ئەوەی کۆڵبدەیت و بەبێ ئەوەی تووڕە ببیت، ئەنجامی ئەم پەروەردەیە باشترە وەك لەوەی تەنها بە منداڵەکەت بڵێیت (نەء).

فێرکردنی منداڵ لەئێستاوە کە زۆر ڕێگای جیاواز هەیە بۆ چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمە سوودێکی تری ئەم پەروەردەیە.

هەروەها سوودێکی تری ئەم پەروەردەیە ئەوەیە کە منداڵ فێری (مساوەمە) ئەکات نەقسەی من نەقسەی تۆ بەڵکو قسەی هەردووکمان، کە ئەمە خاڵێکی گرنگە لەژیانی مرۆڤدا بۆ ئەوەی بتوانێت بە هاوتەریبی بژی و بتوانێت بەکاری هەرەوەزی هەڵسێت لەگەڵ مرۆڤانی دەوروبەریدا.

هەموو ئەمانە لەجیاتی ئەوەی کە بەهۆی نەزانینەوە وا لەمنداڵ بکرێت کە نەزانێت ڕاست و درۆ چیە، لەوەخت و ناوەختدا بیەوێت داخوازیەکانی بۆ جێبەجێ بکرێت و فێرنەبێت کە ویژدان ڕێگا نادات کە هەندێك شت نەکات هەرچەندە بەلای ئەویشەوە باشە.

هەندێك لەوانەی سزادان بە چاری هەموو شتێك ئەزانن لە پەروەردەکردندا ئەڵێن کە منداڵ پێویستە لەئێستاوە فێر بکرێت کە دەست لە شت نەدات و نەبێت بەتوندی بۆی ڕونبکرێتەوە ئەگینا هەرگیز فێرنابێت.

ڕاستە کە ئەم منداڵە ئەبێت بۆی ڕونبکرێتەوە، بەڵام کە جارێ ئەو ئامێرێکی بەدەستەوە نەبێت کە بەکاری بهێنێت ناتوانێت لەکردن و نەکردنی کارەکە تێبگات و هەرکاتێکیش کە نەیکرد ئەوە لەبەرئەوە نیە کە تێگەیشتووە بەڵکو لەترسانایە، ئەمە مانای ئەوەیە کە مرۆڤ ئەبێت کۆنترۆڵکردنی بۆ دانێت بۆ ئەوەی هەرجارێك شتێکی کرد خێرا پێی بوترێتەوە کە بۆی نیە بیکات، ئەمە ئەو پۆلیسەیە کە لەبەردەرگا دانیشتووە و پاسەوانی ویژدانی ئەکات، لەبەرئەوە مرۆڤێکی وا هەرگیز بڕوای پێناکرێت.

وەکو دایکوباوك ئەبێت ئەوەمان لەبیرنەچێت کە لەیەك کاتدا داوامان زۆرە لەمنداڵەکانمان، لەلایەکەوە ئەمانەوێت کە پیسایی نەکەن بەخۆیاندا، ئەمانەوێت کە دەستکاری شت نەکەن، یاری منداڵەکانی تر نەبەن، لەشوێنی خۆیان دانیشن ونەگرین و چاوەڕوانی خواردنەکەیان بکەن و ..... هتد. ئەمانەش کەمنین بۆ منداڵێکی (2-3) ساڵان جا بۆیە وەکو پەروەردەکار پێویستە:

1. کە چاوپۆشی لە هەندێك ڕەفتاری منداڵ بکەین.
2. داوا لە منداڵەکانمان بکەین لە جیاتی هەندێك لەو ڕەفتارانە ڕەفتاری تر بکەن کە هەردوولامان پێی ڕازیبین، بەمانایەکی تر شتێك لەجیاتی شتێکی تر بەکاربهێنن.

3. هەندێك ڕەفتاریان بەتوندی قەدەغە بکەین و ڕێگایان نەدەین.

## کەموکوڕی ئەم سیستەمی کۆنترۆڵە

لێرەدا ئەبینین کە شتێك خەریکە دروست ئەبێت کە لەسیستەمێکی کۆنترۆڵ ئەچێت، کاتێك کە منداڵ زمان ئەگرێت ئیتر هەندێك لەم خواستانە بەهۆی زمانەوە دەرئەبڕێت و هەندێکی تر بەهۆی ئەڵتەرنەتیڤەوە ڕازی ئەکرێت و هەندێکی بۆ ئەچێتەسەر و هەندێکی ڕێگای پێنادرێت، بەڵام سیستەمێکی کۆنترۆڵێکی تەواو جاریٚ چەند ساڵێکی تریش ئەخایەنێت تاکو بەتەواوەتی دروست ئەبێت لەویژدانی منداڵەکە و تاکو ئەو کاتە ئەم کۆنترۆڵە ناتەواوە زۆر تەنگوچەڵەمە بۆ منداڵەکە دروست ئەکات کە زۆر ئاسان نیە بۆی کە چارەسەریان بکات بۆ نموونە:

هەرجارێك کە خواستی منداڵەکە ناگونجێت لەگەڵ ئەم کۆنترۆڵەدا، منداڵەکە زۆر هەوڵ ئەدات کە بیگونجێنێت و داوا لەخۆی ئەکات کە بەپێی کۆنترۆڵەکە بکات و بەخۆی ئەڵێت (نەء، نەکەیت) ئەمە زۆر گرانە بۆ منداڵەکە و ئازارێکی زۆر ئەدات، چونکە جاری واهەیە کە ئەم ئاگادارکردنەوەیەی منداڵ بۆ خۆی دوا ئەکەوێت و جاری واهەیە کە لەبیری ئەچێت و جاری وا هەیە کە خواستی منداڵەکە بەهێزترە و منداڵەکە نایەوێت بەگوێی ئاگادارکردنەوەکە بکات هەموو ئەمانە بەیەکەوە بۆ منداڵەکە گرانە، ئەگەر بەراوردی ئەم کۆنترۆڵە لەم تەمەنەدا بکەین لەگەڵ ئەو کۆنترۆڵەی لەتەمەنی (5-6) ساڵیدا هەیە ئەتوانین یەکەمیان بە ئاڵەتێکی دەستی دابنێین و دووەمیان بە ئاڵەتێکی ئۆتۆماتیکی لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێت کە چەند ئاسانترە بۆ منداڵێکی (5-6) ساڵان کە کۆنترۆڵی هەست و نەستی خۆی بکات چونکە زۆربەی ئەم کۆنترۆڵانە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئەکات و منداڵ پێویستی بەوە نیە کە خۆی ماندو بکات، بەڵام بۆ منداڵێکی (2-3) ساڵان وانیە و پێویستی بەوە هەیە کە خۆی ئەم کۆنترۆڵە بخاتەکار و بەراوردی خواست و کۆنترۆڵەکە بکات، بۆ نموونە:

کاتێك منداڵێکی (5-6) ساڵان چاوی بە سەبەتەیەك هێلکە ئەکەوێت لە چێشتخانەکە دانراوە، پێویستی بەوە نیە کە بەخۆی بڵێت کە ئایا چی ئەبێت ئەگەر ئەم هێلکانە هەڵگرێت و بیدات بەزەویدا، ئەمە لەبەرئەوەی کە داخوازیەك یان خواستێك یان قەدەغەکردنێکی وانیە کە پێی بڵێت ئەمە بکات یان نا وە هەرکاتێکیش خواستێکی وابێتە پێشەوە ئەوا هەر لەشوێنی خۆیدا کۆنترۆڵ ئەکرێت و پێویست بەوە ناکات منداڵەکە لەگەڵ خۆیدا باسی بکات، بەمشێوەیە چەندەها خواستی وا لەڕۆژێکدا چارەسەر ئەکرێت و نابێت بە گیروگرفت بۆی، بەڵام منداڵێکی (2-3) ساڵان پێویستی بەم باسە هەیە و هەرجارێك خواستێکی وای هاتە بەردەم پێویستە زۆرانبازی لەگەڵ خۆی بکات بۆ ئەوەی نەیکات، کەواتە سیستەمێکی کۆنترۆڵێکی منداڵێکی وا جاریٚ تەواو نەبووە و منداڵەکە تووشی ناخۆشی و گیروگرفت ئەکات، بەتایبەتی کاتێك کە ئەم خواستانە جاری وا هەیە تێکەڵ و پێکەڵ و ئاڵۆز ئەبن و سەر لەمنداڵەکە تێکئەدەن و منداڵەکە ئەم کارە قورسەی بۆ ناچێتەسەر و هەست و بەژێرکەوتویی خۆی ئەکات و ناچار ئەبێت ئەم ژێرکەوتنەی خۆی بخاتەسەر کەسێکی تر و خەتای ئەو بگرێت، جا بۆیە جاری واهەیە کە دایکوباوك وا ئەزانن کە منداڵەکەیان درۆزنە و لەوانەیە لێی تورە بن، بەڵام ئەم ڕەفتارەی منداڵ نیشانەیەك بۆ پێشکەوتن بەرەو داننان

بەهەڵەی خۆیدا و نیشانەیەکە بۆ ئەوەی کە منداڵەکە ئەزانێت کە ئەم خواستانە خواستی خۆیەتی و ئەبێت خۆی کۆنترۆڵی بکات، بەڵام لەبەرئەوەی کۆنترۆڵەکە تەواو نەبووە لەبەرئەوە منداڵەکە ئەم چارەیەی بۆ گیروگفتەکە دۆزیوەتەوە و ئەمەش نیشانەی پێشکەوتنی مێشکی منداڵەکەیە، پلەیەکە بۆ ئەوەی کە خواستی خۆی بگونجێنێت لەگەڵ ئەو سیستەمی کۆنترۆڵەی کە خەریکە دروست ئەبێت لەویژدانیدا.

هەندێك منداڵ هەن کە تاکو گەورەش ئەبن ئەم گیروگرفتانەیان بۆ چارەسەر ناکرێت و خەتای ژێرکەوتنەکانیان ئەخەنە پاڵ کەسانی تر و ناتوانن دان بە هەڵەکانی خۆیاندا بنێن و لێپرسراوی ڕەفتاری خۆیان بن.

کاتێك باسی منداڵێکی (2-3) ساڵانمان کرد و بەراوردمان کرد لەگەڵ منداڵێکی (5-6) ساڵیدا بۆمان دەرکەوت کە منداڵە بچوکەکە جاریٚ ئەم کۆنترۆڵەی بۆ دروست نەبووە، بەڵام کاتێك منداڵێکی (5-6) ساڵان ئەم کۆنترۆڵەی نەبوو ئەوە مانای ئەوەیە کە شتێك بووە بەهۆی دواکەوتنی ئەم نەبوونی کۆنترۆڵە و پێویستە پرسیار لە خۆمان بکەین کە ئەو شتە چییە کە ڕێگای لەم پێشکەوتنەی گرتووە؟ بۆچی ئەم منداڵە لە پێشکەوتنی کەسایەتیی ئاسایی خۆی دواکەوتووە و ناتوانێت بەرپرسیاری ڕەفتاری خۆی بێت و دان بەهەڵەکانیدا بنێت؟ ئەم گرفتە ئەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆی جیاواز:

1. گوێ نەدانی بێسنوری دایکوباوك بە ڕەفتاری منداڵ وا لە منداڵەکە ئەکات کە گوێ نەداتە ئەنجامی کارەکانی خۆی و هەست بە لێپرسراوی نەکات، ئەگەر دایکوباوك بێباك بن و چاوەڕوانی ئەوە نەکەن کە منداڵەکەیان بەرپرسیاری ڕەفتاری خۆی بێت، ئەوا منداڵەکەش هیچ موتیڤێکی نیە کە بەرپرسیاری ڕەفتارەکانی بێت، ئەگەر منداڵکە هەستی کرد کە هیچ لە خۆشەویستی دایکوباوکی نادۆڕێنێت کاتێك کە بەزەوقی خۆی و خواستی خۆی ڕەفتار ئەکات ئەوە هیچ هۆیەك نیە بۆ منداڵەکە کە دەست بەسەر خواستی خۆیدا بگرێت و ڕەخنە لە ڕەفتارەکانی خۆی بگرێت.
2. لەلایەکی ترەوە ئەو منداڵەی بەتوندی دەستی بەسەردا بگیرێت و دایکوباوك توندوتیژ بن لەگەڵی هەرهەمان کەسایەتیی ئەبێت بەڵام مەرج نیە وەکو منداڵی یەکەم وابێت، ئەم منداڵە لەترسی لە دەستچونی خۆشەویستی دایکوباوکی و لەترسی ئەوەی سزی نەدرێت هەنگاوی یەکەم ئەنێت و خەتای ڕەفتارەکەی ئەخاتەسەر کەسێکی تر، بەڵام هەرگیز ناتوانێت هەنگاوی دووەم بنێت و ئەم ڕەفتارە بە بەشێك لەکەسایەتی خۆی بژمێرێت و بەرپرسیاری ڕەفتارەکانی خۆی بێت و ڕێگایەك بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی دەست بەسەر ڕەفتارەکانیدا بگرێت، بەمانایەکی تر منداڵێکی وا دوو هۆی بەدەستەوەیە کە ئەم ڕەفتارە خراپانەی خۆی بخاتەسەر کەسێکی تر، یەکەم لەترسی سازو دووەم لەترسی لەدەست چوونی ڕیزی دەوروبەری، لەڕووکەشدا ئەم منداڵە لە منداڵی یەکەم ئەچێت کە خەباتێکی سەختی لەبەردەمدایە بۆ ئەوەی بەسەر ئازاری دەروونی خۆیدا سەرکەویت، بەڵام ئەم منداڵەیان هیچ ئالەتێکی بەدەستەوە نیە کە کۆنترۆڵی خواستی خۆی پێبکات و هیچ هەستێکی گوناهباری نیە کە کارێکی نابەجێی کردووە.

کاتێك کە باسی ئەم دوو جۆرە دایکوباوکەمان کرد و بۆمان دەرکەوت کە ئەمانە تەنگوچەڵەمە بۆ خۆیان و بۆ پێشکەوتنی کەسایەتیی منداڵەکانیان دروست ئەکەن و ناهێڵن کە ئەم پێشکەوتنە بە سروشتی تایبەتی خۆیدا

بڕوات، ئینجا پرسیار ئەکەین و ئەڵێین چی بکەین؟ چۆن منداڵ فێری ئەوە بکەین کە بتوانێت دەست بەسەر خواست و نەستی خۆیدا بگرێت؟

ئەوەی بۆمان دەرئەکەوێت لەم دوو جۆرە کەسایەتیەی کە باسمانکرد ئەوەیە کە دایکوباوك نابێت نەزۆر نەرم بن نە زۆر توند بن لەڕەفتاریاندا لەگەڵ منداڵەکانیان، چونکە هەردوو جۆرەکە هەمان کەسایەتیمان بۆ دروست ئەکات و ئەبێت بەهۆی شێواندنی گەشەکردنی ویژدانی منداڵ و منداڵێکمان بۆ دروست ئەبێت کە نەتوانێت کۆنترۆڵی خواستەکانی خۆی بکات.

لەسەرنجدانی پێشکەوتنی ڕەفتاری منداڵدا دەرئەکەوێت کە هەندێك لەم ڕەفتارانە وون ئەبن، هەندێکی تریان شێوەیان ئەگۆڕێت، هەندێکی تریان زیادی کردووە و بووە بەهۆی ناڕەحەتی بۆ دایکوباوك و منداڵەکە، هەموو ئەم گۆڕانانە ئەتوانرێت بەهۆی یارمەتی دایکوباوکەوە بەرەوپێش ببرێت کە ئەمەش پێویستی بەتێگەیشتن هەیە لەڕەفتاری منداڵەکە، چونکە کاتێك لە ڕەفتاری منداڵەکە گەیشتین ئەوها ڕەفتاری خۆمان و هەڵسوکەوتمان بەرامبەر بە منداڵەکە ئەگۆڕین و ئەزانین بۆچی وا ئەکات و ئەم زانیاریە ئەبێت بەهۆی دروستکردنی پەیوەندیەکی باشتر لەبەینماندا و هێنانەکایەی سایەیەکی هێمن و لەسەرخۆ کە منداڵەکەی تێدا ئەحەسێتەوە.

بۆ نموونە:

کاتێك منداڵ لە تەمەنی پێش دووساڵیدایە حەز ئەکات بچێتە ناو ئاو و خۆی بشوات وە هەرکاتێکیش دایکی ویستی لەناو ئاوەکە دەریبهێنێت ئەوا توڕە ئەبێت و لەقەفرتێی پێئەکەوێت، بەڵام هەر هەمان منداڵ لەدوای تەمەنی دوو ساڵیەوە ئەو زەوقەی نامێنێت و ئەترسێت کە بچێتەناو ئاوەکەوە و لەحەمامەکەدا خۆی بشوات، جا دایکوباوك پرسیار ئەکەن و ئەڵێن کە بۆچی منداڵەکەیان وای لێهاتووە؟ ئایا لەبەر ئەوەیە کە سەرپێچی لە قسەکانی ئەوان بکات؟ ئایا منداڵەکەیان حەز لەپیس و پۆخڵی ئەکات و ئەیەوێت ڕقی ئەوان هەڵسێنێت؟ ئەگەر دایکوباوك هۆی ئەمە نەزانن ئەوا ئاسانە کەتوشی هەڵەبن و بە هەڵەیە لەمنداڵەکەیان بگەن، بەڵام کاتێك هۆی ترسەکە گەیشتن ئەوسا ئاسانە بۆیان کە ڕەفتاری ڕاست بکەن لەگەڵ منداڵەکەیان و خۆشیان و منداڵەکەش لە ناخۆشی بپارێزێت.

ئەم منداڵە بۆی دەرکەتووە کە کونێك لەحەمامەکەدا هەیە کە ئاوەکە هەڵئەلوشێت و دیویەتی کە چۆن ئاو دەستەکە پیساییەکەی هەڵئەلوشێت، جا بۆیە منداڵەکە ئەترسێت، چونکە وا ئەزانێت کە ئەمیش هەڵئەلوشێت لەبەرئەوەی ئەم منداڵە هەتاکو ئێستاش بەتەواوەتی لە بوونی خۆی نەگەیشتووە و هیچ شتێك لەبارەی قەبارەوە نازانێت، ئەوە نازانێت کە قەبارەی ئەو گەورەترە لەکونی حەمامەکە، ئەو ئەوە ئەزانێت کە ئەیبینێت، جا ئەمە ئەبێت بەترسێکی گەورە بۆی و ناوێرێت بچێتە حەمامەکە نەك لەبەرئەوەی سەرپێچی بکات لە دایکوباوکی، جا ئەگەر زۆری لێبکەن کە ئەبێت هەر بچێتە حەمامەکە ئەوا ترسکەی زیاتر تێدا ئەچەسپێنن و لەوانەشە کە تەشەنە بکات بۆ ڕووی تری ژیانی و ئاڵۆزی بخاتە دەروونیەوە.

لێرەدا لەوانەیە کە بۆ دایکوباوك ئاسان نەبێت کە هەموو جارێك ئەم هۆیانە بزانن و بتوانن هەڵسوکەوت و ڕەفتاری منداڵەکە شیبکەنەوە، بـەڵام وەکـو دایکوبـاوك توانایـەکی سـحراویان هەیـە بـۆ دڵنـەوایی کردنـی منداڵەکـە و دڵخۆشی دانەوەی.

## پرسیاری 2

**منداڵەکەمان سێ ساڵە و لەئێستاوە وای لێهاتووە بەقسەمان ناکات، باوکی ئەڵێت لەوانەیە شێت بوویێت و ئەیەوێت بیبات بۆلای دکتۆر، منیش دڵم نایەت ئازاری بدەم و ناچارم بەدزی باوکیەوە دڵنەوایی ئەکەم و ئامۆژگاری ئەکەم، ئایا چیبکەم؟ منداڵەکە بەرین بۆلای دکتۆر یان نا؟**

## کەسایەتی و سەرپێچی

نیشانەیەکی دیاری تەمەنی دوو ساڵی ئەوەیە کە منداڵ خەریکە خۆی ئەناسێت و تێئەگات کە ئەو ئێستا کەسێکی جیاوازە لەکەسانی دەوروبەری، هەروەها بەم بۆنەیەوە ڕەفتارێکی زیـادکردووە کـە ئـەویش ئەوەیـە کـە سەرپێچـی ئەکات و ئەڵێت (نەء) لەبەرئەوە ئەم قۆناغە قۆناغێکی سەخت و ناخۆشە هەم بۆ دایکوباوك هەم بۆ منداڵەکە ئەم قۆناغە پێی ئەوترێت قۆناغی سەرپێچی.

منداڵێك کە تاکو ئێستا گوێڕایەڵ و لەسەر خۆ بووە و بەقسـەی کـردوین، ئێسـتا دەسـت ئـەکات بەسەرپێچـی و ئەیەوێت کە خواستەکانی خۆی بهێنێتەدی، وە لەبەرئەوەی کە ئێستا فێری هەندێك وشە بووە و ئـەتوانێت بـەکاریان بهێنێت، لەبەرئەوە پێمان ئەڵێت (نا) ئەم ڕەفتارەی منداڵ وردە وردە دەستی پێکردووە و شتێکی تـازە نیـە، جـاران نارەزایی بوایە لەشتێك یان هیلاك بوایە یان لەبەر هەرهۆیەکی تر، ئەم ڕەفتارانەی منداڵ یەکسەرە و لەکاتێکدا بـوو کە تووشی ناخۆشیەکە ئەبوو، بەڵام ئێستا منداڵەکە دەسەڵاتی زیـاترە و زیـاتر خـۆی ئەناسـێت و ئـەتوانێت ببێـت بەهۆی ڕوودانی شت، ئەیەوێت بیسەلمێنێت کە ئەمیش دەسەڵاتی هەیە، هەر بۆیەشە کە مـرۆڤ کـۆنترین ڕووداو کـە بیتەوەبیری ڕووداوی ئەم تەمەنەیە، لێرەوە منداڵ هەنگاو ئـەنێت لەمنـداڵی سـاواوە بـۆ نـاو ژیـان زۆر دایکوبـاوك بەلایانەوە گرانە کە مامەڵە لەگەڵ ئەم گۆڕانە و ئەو تەنگوچـەڵەمانەی کـە لـەم گۆڕانـەوە دێـت بکـەن و خۆیـان و منداڵەکانیان تووشی بارێکی نالەبار ئەکەن، بەتایبەتی لـەدوای ئـەوەی کـە منداڵەکـەیان لـە دووسـاڵی ڕابـوردودا منداڵێکی گوێڕایەڵ و ئاقڵ و لەسەرخۆ بووە و ئێستا وا پاداشتی ئـەو هـەموو شـەونخونی و هیلاکیـەیان ئەداتـەوە ئەوەی کارەکە زیاتر نالەبار ئەکات ئەوەیە کە لەوە ئەچێت کە منداڵەکە بۆ هەموو شتێك ئەڵێت (نا) و لەوە ئەچـێت کە بیەوێت ڕقیان هەڵسێنێت و سەرپێچی بکات، ئەمە تارادەیەك ڕاستەو منداڵەکـە ئێسـتا بـۆی دەرکـەوتووە کـە ئەتوانێت ڕەتی شتبکاتەوە و نەیکات، نەك لەبەرئەوەی پێی ناخۆشـە یـان نـا بـەڵکو لەبەرئـەوەی کـە ئـەم وشـەیە وشەیەکی سحراویە بۆ سەلماندنی خۆی کە ئێستا خەریکە دروست ئەبێت و ئەم هەستی بەمەکردووە.

شتێکی سەیر نیە کە دایکوباوك هەندێکجار نازانن چیبکەن، ڕەفتاری منداڵەکە وایان لێئەکات کە سەریان لێتێکبدات و کاری وا بکەن ئەوەندەی تر ڕقی منداڵەکە هەڵسێنێت و وێنەیەك دروست بکات کە هەموو دایکوباوکێك ئەم وێنەیە ئەناسێتەوە، کێ هەیە نەزانێت کە چەند ناخۆشە کاتێك منداڵێك لەچەقی ڕێگادا مانئەگرێت و خۆی ئەگەوزێنێت و داوای شتی وا ئەکات کە ناکرێت لەوکاتەدا، خۆئەگەر هەڵی بگریت و بتەوێت لەباوەشی بکەیت ئەوە مەحاڵە چونکە خۆی ئەکات بەچیلکە ڕەق لەزەویەکە نابێتەوە، یاخود شتومەك فڕێ ئەدات بەدەوری خۆیدا و شت ئەشکێنێت، یاخود قاچی ڕەق ئەکات و نایەوێت جلەکانی لەبەربکات، لەهەمووی ناخشتر ئەوەیە کە منداڵەکە کاتێك ئەمانە ئەکات کە دایکوباوك پێیان ناخۆش بێت کە منداڵەکەیان شتێکی ناشیرین بکات و وایان لێبێت شەرم لەخۆیان بکەن، هەروەکو ئەم منداڵە سەرۆکی لەشکرێکی گەورە بوبێت لە ژیانی پێشویدا و بزانێت چۆن شوێن و کات هەڵئەبژێرێت بۆ چەنگەکانی، هەربۆیەشە کە هیچ بەرتیل و قسەکردن و ماچکردن سوودی نیە و ئەوەی تۆ ڕزگار ئەکات لێرەدا تەنها تێگەیشتنی ئەم ڕەفتارە و هەڵسوکەوت کردنە بەو پێیە ئەوەی کە پێویستە بەپلەی یەکەم بیری لێبکەینەوە، ئەوەیە کە هەرچەندە توند و تیژیەکی کەمیش وا لەمنداڵەکە بکات کە بەقسە بکات بەڵام زەرەری لە قازانجی زیادترە، چونکە ڕەفتاری منداڵەکەت هەوڵدانێکە بۆ سەربەخۆیی، هەوڵدانێکە بۆ سەربەستی بەدەست هێنان، هەوڵدانێکە بۆ فێربوونی بڕیاردان، ئەگەر ئەم هەوڵدانە بەژیری و تێگەیشتوویی مامەڵەی لەگەڵ نەکرێت و نەخرێتە قاڵبێکی ڕێك و پێکەوە لەلایەن دایکوباوکەوە، ئەوا منداڵەکە زەرەری لێئەکەوێت، منداڵێك ئەبێت کە شك لەخۆی بکات کە ئەتوانێت یان بۆی هەیە کە مرۆڤێکی سەربەست بێت و کەسایەتیی خۆی هەبێت، شك لەوە ئەکات کە بتوانێت کۆنترۆڵی ئاوات و خواستەکانی خۆی بکات و وەکو مرۆڤێکی سەربەست بەرپرسیاری ڕەفتارەکانی خۆی بێت، بەکورتیەکەی منداڵەکە پەیوەندیەکی خراپی ئەبێت لەگەڵ خۆی، سەرلێشێواو هەست بەخەتاو شەرمن ئەبێت.

ئەمە مانای ئەوە نیە کە منداڵ بۆی هەیە هەرچی ویستی بیکات، بەڵکو مانای ئەوەیە کە پێویستە هاوسەنگیەك هەبێت کە لەم هاوسەنگیەدا منداڵەکە بتوانێت خۆی ئەو شتانەی ئەیەوێت هەڵی بژێرێت و دایکوباوك بۆی ڕونبکەنەوە کە بۆچی ئەبێت ئەمە بکات و بۆچی ئەبێت ئەمە نەکات، ئەم قۆناغی سەرپێچیە پێویستە بۆ منداڵ کە پێیدا بڕوات و پێویستی سەرشانی دایکوباوکە کە هەلومەرجی ئەم پێشکەوتنەی بۆ ئامادە بکەن، چونکە لەم قۆناغەدا منداڵ بناغەی پێگەیشتنێکی فراوانتر دائەنێت، پشکنین دەریخستووە کە ئەو منداڵانەی ڕێگایان نەدراوە بەم قۆناغەدا بڕۆن ئاسانتر هەڵئەخەڵەتێنرێن و خشبڕوان و کەسایەتیان لاوازە، کەواتە ئەو قۆناغەی کە بە قۆناغێکی ناخۆش و پڕ لەتەنگوچەڵەمە ناو ئەبرێت و دایکوباوك هیلاك ئەکات ئەنجامێکی باشی ئەبێت و ڕووی بەهێزی منداڵەکەت دەرئەخات لەدوارۆژدا.

## چۆن ڕەفتار ئەکەین لەگەڵ ئەم سەرپێچیەدا

یەکەم پرسیاری دایکوباوك لەمکاتەدا ئەوەیە (چیبکەم؟) ئەوەی بەپلەی یەکەم گرنگە ئەوەیە کە هەتاکو ئـەتوانیت وابکەیت کە منداڵەکەت تا ئەو شوێنەی ئەتوانێت بڕیارەکـان خـۆی بیـدات، دووەمـیش هـەوڵ بـدەیت بزانیـت لـە پراکتیکدا چی بکەیت.

ڕێگادان بەمنداڵ کە خۆی بڕیار بدات مانای ئەوەیە کە وای لێئەکەیت کە سەرەتای بەرپرسیاریەکە ئەدەیتە دەست خۆی و وای لێئەکەیت کە تام و چێژی سەربەستی بنۆشێت، بەمە بە منداڵەکە ئەڵێیت کە تۆ ڕێزی ڕاو بۆچـوونەکانی ئەگرێت و ئەتەوێت گوێی لێبگرێت، بۆ نموونە:

جل لەبەرکردن و جل هەڵبژاردن گێروگرفتێکی گەورەی منداڵ و خێزانە لەم تەمەنەدا، هەموو دایکوباوکێك ڕۆژێـك لە ڕۆژان تووشی سەر ئێشە بووە و ئەزانێت چەند ناخۆشە کە منداڵەکەی مانئەگرێت و خۆی ئەکات بە چیلکەی ڕەق و نایەوێت جلەکانی لەبەربکات، ئەمە ئەتوانرێت بەوە چاربکرێت کە هـەر لـەکڕینی جلەکـەوە منداڵەکـە بەشـداری خێزانەکە بکات و لەگەڵیاندا بێت، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تـرەوە پرسـیار لەمنداڵەکـە بکرێـت کـە ئـەوێت چـی لەبەربکات پێش چوونە دەرەوەکە، ئەمە مانای ئەوەیە کە ئەبێت دایکوباوك کاتیـان هـەبێت بـۆ قسـەکردن لەگـەڵ منداڵەکانیان و بۆی ڕوونبکەنەوە کە بۆچی ئەم جلە باشترە لەبەری بکات و بۆچی ئەوی تریان باش نیە، بۆچـی لێـرە ئەم جلە لەبەر ئەکەین و بۆچی لەوێ ئەو جلە، بۆچی ئەبێت لەڕۆژێکی زستانی سـاردا جلـی گـەرم لەبـەر بکـەین و ئەگەر کراسێکی تەنك لەبەر بکەین ئەوا سەرمامان ئەبێت، خۆ ئەگەر هەرپێی داگرت و ویستی جلە تەنکەکە لەبـەر بکات ئەوە باشتر وایە جلە گەرمەکان لەگەڵ خۆت بەریت و وازی لێبهێنیت کە جلە تەنکەکان لەبـەربکات، چـونکە زۆرنابات کە لەدەرەوە سەرمای ئەبێت و داوایان ئەکات.

بەمە منداڵەکە تاقیکردنەوەیەکی کرد و بۆشی دەرکەوت کە تۆ ڕاست ئەکەیت، چونکە منداڵەکە وا ئەزانێت کـەتۆ ڕقەبەرایەتی ئەکەیت و ئەویش زیاتر ئەیەوێت سەرپێچی بکات، بەلاّم کاتێك بۆی دەرکەوت کە تـۆ ڕاسـت ئەکـەیت لەگەڵی ئیتر ئاسانتر ئەبێت کە بۆ جارێکی تر بەقسەت بکات، هەروەها کـاری خـۆت ئاسـان بکـە بـەوەی کـە ئـەو جلانەی بەکەڵکی نایەت لەبەردەستدا لایان بەرە، بەلاّم ئەم دەستەیان زوو ئەخرێتە ڕوو و منداڵەکە مانئـەگرێت کـە هەر ئەو جلەی ئەوێت کە ئێستا دیار نیە، ئەمە بۆ دایکوباوك ناخۆشە و توڕەیان ئـەکات، لـەجیاتی ئـەوەی دڵیـان خۆشبێت بەوەی کە منداڵەکەیان ئەوەندە زیرەکە کەشتی دێتەوە یاد و شتی لەبیرناچێتەوە، کە ئەمەش خەسـڵەتێکی باشە لەمرۆڤدا، کەواتە ئەمە ئەتوانرێت بەکار بهێنرێت بۆ گەیشتن بەئەنجامێکی باشتر کە لەوانەیە هەردووکتان پێـی ڕازیبن، ئەویش بەستایش کردنی منداڵەکەت کە ئەوەندە زیرەکە و شتی لەبیرە و منداڵێك ئەوەندە زیرەك بێت جلێـك لەبەرناکات کە سەرمای لێوە بێتە ژوورەوە و سەرمای ببێت و نەخۆش بکەوێت و نەتوانێت یاری لەگـەڵ هاوڕێکـانی بکات، بەلاّم ئەگەر ئەم کوڕە زیرەکە هەر سوورە لەسەر قسەی خـۆی ئـەوا باشـە بـا جلـە تەنکـەکان لەبـەر بکـات بەمەرجێك جلێکی ئەستوریش بەسەر ئەواندا لەبەر بکات، ئەمە مانای ئەوە نیە کە تۆ کۆڵت داوە و بەقسەی ئەوت کردووە، ئەمە نیشانەیەکە کەتۆ ئەتوانیت بگەیتە چارەسەرێك کە هەردووکتان ڕازی بکت.

بەلاّم بەداخەوە هەموو جارێك ئەوەندە ئاسان نیە وەکو لێرەدا باسی لێوە ئەکەین، جاری واهەیە کـەتۆ ڕازی ئـەبیت بەوەی کراسە شینەکەی بدەیتێ و مەسەلەکە ببڕێنیتەوە، بەلاّم ئەو بڕیاری خۆی گۆڕیوە و ئەو کراسەی ناوێت بـەڵکو

بلوسێکی سوری ئەوێت کە چڵکنە و بەلای تۆوە ناشیرینە ئەوە لەبەربکات، جائیتر دەستەوسـان لێـی دائەنیشـێت و نازانی چیبکەین، بیرلەوە ئەکەیتەوە کە ئەم منداڵە هەر بەخۆڕایی وائەکات و ئەیەوێت تۆ تورە بکات، بەلاّم ئێسـتا ئەو فێری شتێکی تازە بووە، ئەویش ئەوەیە کە (بیری خۆی بگۆڕێت) و زۆری بەلاوە سەیرە کە تۆش وەکو ئـەم، ئـەم شتە تازەیەت بەلاوە سەیر نیە، لەجیاتی ئەوەی کە هەوڵ بدەیت کە بەزۆر کراسەکەی بکەیتەبەر کە زۆر ئاسـان نیـە باشتر وایە ئەم هەلە بقۆزێتەوە بۆ یاری و جلەکان بخەیتە پشتەوە و داوای لێبکەیت کە کامیان هەڵئەبژێرێت (ڕاسـت یان چەپ)، وە کاتێك یەکێکیانی هەڵبژارد ستایشی بکەیت پێش ئەوەی ئەو شتێکی تازەت بۆ بدۆزێتەوە.

هەوڵبدە کە هەمان ڕێگا بەکار بهێنیت بۆ نان خواردن، ڕێگای بـدە هەنـدێکجار بڕیـار بـدات کـە لـەنێوان چـەند خواردنێکدا خواردنێك هەڵبژێرێت و یارمەتیت بدات لەکاتی ئامادەکردنی خواردنەکـەدا، بـەلاّم کاتێـك خواردنەکـە دانرا ئەوە ئیتر چی هەیە هەرئەوە ئەخورێت و ئەگەر ڕازیش نیە ئەتوانێت بەبێ خواردن بێت کەس ڕێگای لێناگرێت و خۆی بڕیاری خۆی ئەدات، کەواتـە بـۆی دەرئەکـەوێت کـە هەڵبـژاردن بەتـەنها نیـە و مانـای بەرپرسـیاری لەگـەڵ هەڵبژاردندا دێت و ئەم دووانە بەیەکەوەن، بەمانایەکی تر هەرکاتێك مرۆڤ ویستی بەخواستی خۆی شـت هەڵبـژێرێت ئەوا ئەبێت بەرپرسیاری ئەنجامەکەشی بێت، ئەم خاڵە زۆرگرنگە بۆ هەموو ژیانی دوارۆژیشی.

وەکو ئەبینین مامەڵەکردن لەگەڵ سەرپێچی منداڵدا ئەوەندە گران نیە، منداڵەکە بۆی هەبێت کە هەڵبژێرێت کاتێك ئەم هەڵبژاردنە بکرێت و ئەگەر ئەو شتەی خۆی هەڵیبژارد پێـی ڕازی نـەبوو ئـەوا بـۆی ڕوون بکەینـەوە کـە ئەمـە ئەنجامی کاری هەڵبژاردنی خۆیەتی و جارێکی تر پێویستە زیاتر و زۆرتر بیر بکاتـەوە لـەپێش ئـەوەی بڕیـار بـدات، لەوکاتانەدا کە ناتوانرێت ڕێگا بە منداڵەکە بـدرێت کـە هەڵبـژێرێت لـەنێوان چـەند جۆرێکـدا ئـەوا تۆخـۆت بـۆی هەڵئەبژێریت و بۆی ڕونئەکەیتەوە کە بۆچی وایە و داوای لێئەکەیت کە لـەم هەڵبژاردنـە لانـەدات و تـۆش سـووربیت لەسەر بڕیارەکەت، بەبێ دەمارگیری و بەخۆشیەوە بۆی باس بکەیت کە هەندێك جار لەژیانمدا شتی وا دێتـەپێش کـە گەورەکان ناتوانن چاوەڕوانی ئەوە بکەن کە بڕیارەکان لەگەڵ ئەوانی تردا باس بکەن و ئەبێت خۆیان ئـەم لێپرسـراویە بخەنە ئەستۆی خۆیان و ئـەوانی تـر لەسـەری بـڕۆن کاتێـك کـەزانیان دادپەروەرانەیـە و ڕاسـتەو ئـەگونجێت لەگـەڵ بیروڕای ئەواندا.

لەهەموو ئەم بارودۆخانەدا زۆر گرنگە لەسەرخۆ و هێمن بیت و ڕێگا نەدەیت بە منداڵەکە وابزانێت کە تـۆ ڕێگـای نادەیت نارەزایی خۆی دەربڕێت یاخود ڕاوبۆچوونی ئەو گرنگ نیە و ئەگەر ئەو ئەم ڕاوبۆچـوونانە دەربڕێـت ئـەوا تـۆ تورە ئەبیت، هەرچەندە لەقە فرتێ ئەکات و تورە ئەبێت، بەلاّم وا هەست ناکات کە زوڵمی لێکـراوە و ئاسـانترە کـە لەگەڵی ڕێککەویت، هەندێك ئەڵێن کە پیاو چۆن تورە نابێت کاتێك ئەبینێت کـە منـداڵ خـۆی ئـەدات بەزەویـدا و مانئەگرێت بۆ شتێك کە ناکرێت، بەتایبەتی لەبەرچاوی خەڵکی و لەسەر جادە، تورەبوون هەق دایکوباوکـە و بۆیـان هەیە کە تورەبن و هەست ونەستی خۆیان بەڕاستی بۆ منداڵەکە دەربخەن، بەلاّم توورەبوون دەسـتور و سـنوری خـۆی هەیە، تورەبوون ئەتوانرێت بەکار بهێنرێت، بۆ فێرکردن ، هەروەها دایکوباوکایـەتی مانـای ئەوەیـە کـە تـۆ ئێسـتا مرۆڤێکی تری وەك لەجاران، ئێستا پێویستە تۆ زیاتر هەوڵ بدەیت باشـتر خـۆت بناسـیت و بزانیـت ڕووی بـەهێز و بێهێزی خۆت لەکوێدایە و هەوڵ بدەیت ڕەفتاری خۆت بگۆڕیت بۆ ڕەفتاری دایکوباوکایەتی، چونکە دایکوباوکایـەتی

لێپرسراویەکە بەرامبەر کەسانێکی تر و مرۆڤ ناتوانێت خۆی لێبدزێتەوە و ئەو لێپرسراویە بخاتەسەر کەسێکی تر، ئەمە مانای ئەوەیە کە مرۆڤ پێویستە خۆی بگۆڕێت بۆ مرۆڤێکی باشتر و بەکەڵك تر، بیرکردنەوە لەتووڕەبونەکە و زانینی هۆ و ئەنجام و باش و خراپی و باسکردنی لەگەڵ کەسانی دەوروبەردا و دانانی ڕێگای تازە بۆ جاری داهاتوو و خۆ ئامادەکردن بۆ ئەوەی ئەگەر هەمان گرفتمان تووش بوو چیبکەین و چۆن ڕەفتار بکەین، لەجیاتی ئەوەی دانیشین و سەرزەنشتی خۆمان یان منداڵەکە بکەین، یان هەوڵ بدەین بۆ خەڵکی بسەلمێنین کە گوناهەکە گوناهی ئێمە نەبووە.

کاتێك کە بیر لەتوڕەبوونەکە ئەکەیتەوە ئەبینیت لەبەرئەوە بووە کە منداڵەکەت ویستویەتی سەرپێچی لەقسەکانت بکات، وەکو گەورەیەك ئەترسێت لەدوارۆژیشدا منداڵەکەت لەقسەکانت دەرچێت و بەقسەت نەکات، یاخود منداڵەکە بووە هۆی ئەوەی کە سەرت لێبشێوێنێت و نەهێڵێت ئەو کارەی بەدەستەوەیە تەواوی بکەیت، یاخود داوای شتێك ئەکات کە ناکرێت، بەڵام لەڕاستیدا منداڵەکەت نایەوێت لە گەورەیی تۆ کەمکاتەوە و سەرپێچیەکەی بۆ ئەوە نیە، لەلایەکی ترەوە ئەو تەنها بیرو لەو کاتە و لەو کارە ئەکاتەوە کە ئەیەوێت و ناتوانێت بیر لەتۆ و لەبارودۆخی تۆ بکاتەوە، ئەمە کاتێکی تری ئەوێت کە فێری ببێت، تۆ لەوە ئەترسیت کە کەسانی دەوروپشت ڕەخنەت لێبگرن و بڵێن چۆن ڕەفتاری وا ئەکات یاخود چۆن ڕێگا بەمنداڵەکەی ئەدات کەوا بکات، لەوانەیە ئەوانەی دەوروپشت ئەگەر خۆیان لە شوێنی تۆبن ئەتوانن لەوە باشتر بکەن، ڕەنگە ئەمانە خۆیان منداڵیان نەبێت و ئەزانن کە پەروەردەکردنی منداڵ ئاسان نیە، یان لەکات و شوێنێکی تردا منداڵیان پەرورەردە کردووە کە جیاوازە لەبارودۆخی ئێستا، جا بۆیە تۆ ئەبێت خۆت خۆت بیت و گوێ بەدەوروبەر نەدەیت، خۆت بڕیاری خۆت بدەو لەسەری بڕۆ، چونکە تۆ لەهەموو کەس باشتر خۆت ئامادە بکەیت بۆ جاری داهتوو، ئەمانە هەمووی یارمەتیت ئەدات کە وردە وردە فێری ئەوە ببیت کە دەست بەسەر توڕەبوونی خۆتدا بگریت و ڕەفتاری منداڵەکەت بەشتێکی ئاسایی و پلەیەکی پێشکەوتن ببینیت کە لەماوەی داهتاوودا بەسەر ئەچێت و خۆت و منداڵەکەت شتی زۆر فێربوون لەم ماوەیەدا کە سوودی لێوەرئەگرن بۆ هەموو ژیانتان.

ئەگەر منداڵەکەت بەهیچ ڕازی نەبوو و بەردەوام بوو لە سەرپێچی و لەقەفرتێ، ئەوا خۆت مەخەرە داوێکی خراپترەوە و شتی سەیر و سەمەرە بدۆزیتەوە یان خۆت توڕە بکەیت، باشترین شت ئەوەیە کە پشتگوێی بخەیت و وازی لێ بهێنیت لەقەفرتێی خۆی بکات و تۆ بچیت بەلای کارەکەی خۆتەوە، ئەم لەقەفرتێیە باشترە بۆ تەندروستی منداڵەکەت لەوەی کە بەهەڕەشەکردن بێدەنگی بکەیت، منداڵەکەت دڵخۆش ئەبێت بەوەی کە تۆ توڕەبوونەکەی قبوڵ ئەکەیت بەبێ ئەوەی توڕەببیت و نیشانەیەکە بۆ ئەوەی کە ئەو بۆی هەیە وەکو خۆی بێت و هەستونەستی خۆی دەربڕێت و پێویستی بەوە نەبێت کە درۆ بکات یان بترسێت لەسزادان، لەگەڵ ئەوەشدا دەربڕینی ڕق و توڕەبونەکە هێن و لەسەرخۆ ئەکاتەوە و فێر ئەبێت کە لەقەفرتێ نایگەیەنێتە ئامانجی خۆی و فێر ئەبێت سوری خۆی بزانێت.

هەرچی ئەکەیت وا مەکە بە بەرتیل منداڵەکەت ژێربکەیتەوە و دەست بکەیت بەکڕینی شیرینی و پارەدان پێی، ئەمە ئەنجامی باش نیە، بەمە منداڵەکەت فێر ئەکەیت کە هەرجارێك شتێکی بۆ نەچووە سەر ئیتر ئەو خۆی بدات بەزەویدا و لەقەفرتێ بکات، لەجیاتی ئەوە هەوڵبدە کە سەرنجی ڕاکێشیت بۆ لایەکی تر و داوای لێبکەیت کە شتێك

بکەن بەیەکەوە کە ئەوپێی خۆش بێت، کە منداڵ زۆرجار حەز ئەکات ئەم کارانە بکات، بەلاّم ڕێگای نادرێت یارمەتیت بدات لەچێشت لێناندا یان ماڵ پاککردنەوە یان پەنجەرە پاککردنەوە یان هەرکاتێکی تر کە منداڵەکە پێی خۆش بێت، بەمە منداڵەکە دڵخۆش ئەبێت کە شتێك بکات وەکو گەورەکان، ئەگەر بەوەش ڕازی نەبوو ئەوا شانێکی بۆ بلەقێنە و وازی لێبهێنە، بەلاّم بەهیچ جۆرێك باسی سەرپێچیەکە و توڕەبونەکەی لەگەڵ مەکە، کاتێك منداڵەکە ژێر بووەوە و توڕەبونەکەی نەماو بۆی دەرکەوت کە توڕەبوونەکەی سودی نەبوو، ئەوە کاتی ئەوە هاتووە کە قسەی لەگەڵ بکەیت و باسی هەموو ڕووداوەکەی بۆ بکەیت و دەست بۆ ڕووی باش و خراپی ڕووداوەکە ڕابکێشیت و ئەو شتانەی لێوەی فێربوون دەست نیشان بکەیت، وە پێشنیاری ئەوەی بۆ بکەیت کە شتێکی خۆش بکەن بەیەکەوە.

هەندێك منداڵ هە لەکاتی ڕق هەڵسانەکەدا وا خۆیان دەرئەخەن کە خەریکن ئەخنکێن و هەناسە لەخۆیان ئەبڕن و هەناسە نادەن، ئەمە تەنها تیاترە و پێویستە بەخۆ سەغڵەت کردن ناکات، ئەگەر زۆریش ترسایت باشتر وایە ختوکەی بدەیت و بیخەیتە پێکەنین و ناچاری بکەیت هەناسە بدات.

ئەگەر منداڵەکەت لەناو بازاڕ و لەسەر جادە مانیگرت و خۆی دا بەزەویدا، ئەتوانیت پێی بڵێیت کە ئەو ئەتوانێت خۆی بدات بەزەویدا و پاڵکەوێت، بەلاّم تۆ ڕاناوەستیت و کاتی ئەوەت نیە و ناتوانیت دڵنەوایی بکەیت، خۆی ئەتوانێت بڕیاری خۆی بدات، ئینجا وازی لێبهێنە و بڕۆ و ئاوڕی لێ مەدەرەوە، زۆر ناخایەنێت کە بەڕاکردن دێتەوە بۆلات، ئەم ڕەفتارەی منداڵ ئەتوانرێت چاربکرێت ئەگەر لەماڵەوە و پێش چوونە دەرەوە قسە لەگەڵ منداڵەکەدا بکرێت و باسی چوونە دەرەوەکەی لەگەڵ بکرێت و مەرجی هەڵسوکەوتی بۆ دەستنیشان بکرێت، بەلاّم هەوڵ مەدە بە هەڕەشە ئەمە بکەیت، چونکە منداڵەکە ئەم هەلە لەدەست خۆی نادات و لە ناوەڕاستی بازاڕدا شانۆکەت بۆ ئەڕازێنێتەوە، دوای ئەوەی کە لەبازاڕ هاتنەوە پاداشتی هەڵسوکەوتی باشی منداڵەکەت بدەرەوە بەوەی باسی بکەیت و ئەگەر توانیت و هەبوو دیاریەکی بچکۆلەی بدرێتێ.

کاتێك منداڵەکەت هەمان ڕەفتار ئەکات کاتێك لەمیوانی ئەبن یان میوانتان هەیە، ئەمە لەبەرئەوەیە کە پشتگوێ خراوە و ئەیەوێت گرنگی پێبدرێت، لەم حاڵەتەدا باشتر وایە کە خێرا هەڵیگریت و بیبەیتە ژورێك یان شوێنێك کەسەی لێنەبێت و لەوێ قسەی لەگەڵ بکەیت، بەمە وای لێئەکەیت کە ئەو تەماشاکەرانەی ئەو ئەیەوێت شانۆیان بۆ بگێڕێت لەوێ نەبن و ئەویش ناچار ببێت کە شانۆکە نەکات، بۆیە ئاسانترە قسەی لەگەڵ بکەیت کاتێك کە تەنها خۆتان ئەبن.

ئەم ڕاستیە ئەمان گەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە بڵێین: کاتێك منداڵ ڕەفتارێکی ناگونجاو ئەکات بۆ ئەوەیە کە سەرنجی گەورەکان بەلای خۆیدا ڕابکێشێت و وایان لێبکات کە گرنگی پێبدەن، هەتاکو کەسایەتیی منداڵەکە بەهێزتربێت و باشتر بناسێت ئەوا داخوازیەکانی بەهێزتر ئەبن و زیاتر ئەیەوێت ئەم ڕێگایە بەکار بهێنێت، چونکە منداڵەکە بەتاقیکردنەوە بۆی دەرکەوتووە کە تاکو شانۆگەریەکەی ڕێکی نەخات گەورەتر بێت ئەوا گرنگی زیاتر پێئەدرێت.

ئەمە مانای ئەوە نیە کە هەموو کات هەروابێت و ئەم ڕەفتارەی منداڵ بۆ ئەوە بێت کە گرنگی پێبدەن و دایکوباوکی لەوەوپێش گرنگیان پێنەداوە.

دایکوباوکی وا هەن کە ڕێگا بە منداڵەکەیان ئەدەن کە هەموو شتێك بکات و گوێی نادەنێ ئەگەر کاری خراپیش بکات، لەبەرئەوەی وەکو خۆیان ئەڵێن ئەوەندە منداڵەکەیان خۆشئەوێت دڵیان نایەت دڵی منداڵەکە بشکێنن، ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە بەناوی خۆشەویستیەوە ئەکرێت و منداڵ ئەوەی پێ باشترە کە کەسێك هەبێت لەماڵەوە زۆرانی لەگەڵ بگرێت و خۆی پێ تاقی بکاتەوە وەك لەوەی کە کەس نەبێت لێی بپرسێتەوە جا بۆیە منداڵ لەم کاتەدا کاری ناگونجاو ئەکات بۆ ئەوەی گەورەکان ببینن و گرنگی پێبدەن.

لەدوایدا ئەبێت هەندێك بیروڕای هەڵە ڕاست کەینەوە کە کەسانێکی نەزان ئەیڵێن و کەسانێکی لەوانە نەزانتر دووبارەی ئەکەنەوە کاتێك کە ئەڵێن سەرم بووە بەڕیشی خۆمەوە و منداڵمان بووە، یاخود ئەگەر خوا منداڵی بەلاوە باش بوایە منداڵی بۆخۆی دروست ئەکرد، یاخود پیاو کەژنی هێناو منداڵی بوو ئیتر لەپیاوەتی ئەکەوێت، خۆزگە ژنم نەهێنایە و منداڵیشم نەبوایە، ئەم قسانە کەسایەتیی ئەو کەسانە دەرئەخات کە ئەیکەن، باشتر وابوو کە ئاقڵتر بونیایە و لەپێشدا بیریان لەکارەکە بکردایەتەوە، بەلام کاتێك کە دایکوباوك منداڵیان بوو ئیتر ئەبێت ئەوە بزانن کە منداڵەکانیان تەنها سەروەت و سامانی ئەوان نین، بەڵکو ئەم منداڵانە سەروەت و سامانی هەموو گەلن و ئەوان لێپرسراوی ئەم ئەمانەتەن و ئەو مرۆڤەی ئەتوانێت ئەم لێپرسراویە بخاتە سەرشانی خۆی پێویستیش ناکات منداڵ دروست بکات بۆ خۆشی خۆی، چونکە هەروەکو ئەمجۆرە کەسانە بیرئەکەنەوە و ئەڵێن کە منداڵەکانیان بۆئەوە ئەوێت کە خزمەتیان بکات و ئەمانە بەکاری بهێنن بەو جۆرەی خۆیان ئەیانەوێت، ئەمانە ئەبێت ئەوەندە بزانن کە کاتێك منداڵ فێر ئەکرێت کە ئاو بکات بەدەستدا ئەوە ئەو منداڵە لە دوارۆژیشدا کەسێك دەرئەچێت کە ئاو بکات بەدەستی هەموو کەسێکدا و سەرشۆڕی فرمانی هەموو کەسێك بێت، بەلام ئەگەر مرۆڤ لەئێستاوە منداڵەکەی فێری ئەوە بکات کە ئاوی بەدەستدا بکرێت ئەوا ئاشکرایە کە کەسایەتیەکی بەهێزی ئەبێت و لەبەرئەوەی بەمنداڵی ڕێزی گیراوە ئیتر ئەویش ڕێزی دەوروبەری ئەگرێت و ئەزانێت کە خۆشی ڕێزی هەیە، منداڵێکی وا چاوەڕوانی باشتری لێئەکرێت وەك لەمنداڵێکی ژێر دەستە.

**پرسیاری 3**

**منداڵێکمان هەیە تەمەنی ( 5 ) ساڵە و منداڵێکی زۆر ڕێك و پێکە و زۆر لێی ڕازین، تەنها یەك شت هەیە ئەویش ئەوەیە کە درۆ زۆر ئەکات، چیبکەین بۆ ئەوەی حەیامان نەبات؟**

## خەیاڵ و ڕاستی

تاکو خەیاڵی منداڵەکەت فراوانتر بێت، ئەوە مانای ئەوەیە کە زیاتر ئەزانێت و زیرەکترە، هەتاکو خەیاڵی فراوانتر بێت ئەوە زیاتر سوود لە سەرگوزشتە و حکایەت وەرئەگرێت و زیاتر شتی تازە ئەدۆزێتەوە و مێشکی خۆی پێوە

خەریك ئەكات، ئەگەر دایكوباوك هەست بەوە بكەن كە منداڵەكەیان خەیاڵی فراوان نییە و بیانەوێت یارمەتی بدەن باشترین شت ئەوەیە كە سەرگوزشتەی بۆ بگێڕنەوە و باسی ژیان و ڕابردووی خۆیانی بۆ بكەن و پرسیاری وای لێبكەن كە مێشكی بخاتەكار وەكو (چی ڕوو ئەدات ئەگەر.....؟) ، (چی ئەبێت ئەگەر.....؟)، (چی ئەكات ئەگەر....؟) وە زۆریتر لەم پرسیارانە ئەوەندە هەیە كە هەر منداڵەی بەشێوەی جیاواز خەیاڵی خۆی بەكار ئەهێنێت، ئەمیان حەز ئەكات یاری تازە بدۆزێتەوە ئەویان ئەیەوێت كتێب بخوێنێتەوە، ئەویتریان حەز لەحكایەت ئەكات لە كاتێكدا منداڵێكی تر حەز ئەكات بزانێت چۆن شتومەك ئیش ئەكات، لێرەوە ئەتوانێت خواست و حەزی منداڵ بزانین.

جاری واهەیە كە دایكوباوك خۆیان سەغڵەت ئەكەن بەوەی منداڵەكەیان خەیاڵی سەیری هەیە و باسی شتی وا ئەكات كە دوورە لە ڕاستیەوە بەتایبەتی لەكاتێكدا كە شتێكی كردووە كە بۆی نیە بیكات و ئەیەوێت خەتاكەی بخاتەسەر كەسێكی تر و باسی هاوڕێ خەیاڵیەكەی ئەكات و خەتای ئەو ئەگرێت جا دایكوباوك ئەترسن كە منداڵەكەیان فێری شتێكی خراپ بووە و لێی توڕە ئەبن.

ئەم خەیالأنەی منداڵ لەم تەمەنەدا (3-5) ساڵی، زۆرجار دایكوباوك تووشی هەڵە ئەكات و سەریان لێتێك ئەدات و وا ئەزانن كە هەڵەیان كردووە بۆچی منداڵەكەیان وای لێ هاتووە؟ بەڵام لەڕاستیدا ئەم پەیوەندی بە پێشكەوتنی مێشكی منداڵەوە هەیە و خەتا خەتای كەس نیە، ئەم منداڵە جاریٚ ناتوانێت جیاوازی بكات لەنێوان خەیاڵ و ڕاستیدا، ئەم منداڵە ناتوانێت جیاوازی بكات لەنێوان ڕاست و درۆ، جاریٚ فێر نەبووە بزانێت هینی من و هینی تۆ، ئەم منداڵە حەز لە حكایەتی خەیالأوی ئەكات و لە خەیاڵی خۆیدا دروستیان ئەكاتەوە، ئەیانگێڕێتەوە، جا بۆیە توڕە بوون سەری لێئەشێوێنێت و وای لێدێت كە ئەوەندی تر بڕوا بە حكایەتەكەی خۆی بكات و زیاتر سووربێت لەسەر بیری خۆی، بۆیە باشتر وایە لەسەرخۆ و بەبیٚ توڕەبوون گوێی لێبگرێت بەبیٚ ئەوەی بڕوای پێبكەیت.

هەندێك دایكوباوك دەست ئەكەن بە گاڵتەپێكردنی منداڵەكەیان بەناوی ئەوەی گاڵتەی لەگەڵ ئەكەن و دەست ئەكەن بەقسەی وەكو (ئیٚ چیبوو؟ بەڕاستە....؟ ئەی دوایی چی بەسەرهات؟.....هتد) وە وا پیشانی منداڵەكە ئەدەن كە بڕوای پێئەكەن چونكە وا ئەزانن كە دڵی منداڵەكە ئەشكێت ئەگەروا نەكەن، ئەمە ڕاست نیە و زیانی هەیە بۆی، لەبەرئەوەی وا لەمنداڵەكە ئەكات كەبڕوای بەسەرگوزشتەكەی بێت و ئەوەندەی تر ڕاستی و خەیاڵ تێكەڵ بكات، باشتر وایە دایكوباوك تەنها گویٚ لە منداڵەكەیان بگرن بەبیٚ ئەوەی دەست بخەنە كاری پەیوەندی نێوان منداڵەكە و خەیاڵەكەی، ئەمە ئەگەر باسەكە لەخەیاڵەوە هاتوو وە پەیوەندی نەبوو بە ڕووداوێكی واوە كە منداڵەكە بیەوێت شت لەدایك و باوكی بشارێتەوە و پەیوەندی نەبوو بە درۆكردنەوە، بەڵام ئەگەر منداڵەكە ویستی درۆ بكات ئەتاونیت پێی بڵێیت كە تۆحەز ئەكەیت كە ئەو راستی مەسەلەكەت بۆ بگێڕێتەوە، لەبەرئەوەی ئێوە یەكترتان خۆش ئەوێت باشتر وایە بەڕاستی قسە لەگەڵ یەكتری بكەن.

كاتێك منداڵ ئەترسێت لەوەی ئەگەر ڕاستیەكەی گێڕایەوە سزا نەدرێت ئەوە خۆشت و منداڵەكەشت لەزۆر ناخۆشی و تەنگوچەڵەمە ڕزگار ئەكەیت و منداڵێك پەروەردە ئەكەیت كە ڕاستگۆ بێت و بڕوای پێبكرێت و بڕوا بەكەسانی دەوروبەری بكات، بەمە منداڵەكەت فێر ئەبێت كە ڕاستی گرنگە لە پەیوەندیەكی ڕاستیدا و پێویست ناكات كە بترسێت لەگێڕانەوەی ڕاستی و دەربڕینی هەستونەستی سوككردنی باری سەرشانی خۆی و بەرەوپێشچوون و گەڕان

بەدوای ڕاستی تردا، هەروەها فێر ئەبێت کە بزانێت کە کەسێك هەیە کە بتوانێت جێگـای متمانـەی بێـت و گـوێی لێبگرێت کاتێك کە پێویستی بەقسەکردن بێت و ویستی تەنگوچەڵەمەکانی بۆ باس بکات، کە ئەمە ئەبێت بـەهۆی دڵنیایی و سەرپشك بوون لەخۆ و بەرەو پێشەوە چوون.

جاری واهەیە منداڵەکەت کە لەتەمەنی (3-5)ساڵیدایە دێتەماڵەوە و لەگەڵ خۆی یاری و شتومەکی هێناوەتەوە یان خستویەتیە گیرفانیەوە و ئەڵێت کە داویانەتیێ یان دۆزیویەتیەوە یان هەر بیانویەکی تر، ئەمە ڕاسـت نیـە و زۆر جار منداڵەکە لەگەڵ خۆی بردوویەتی، ئەمەش لەبەرئەوەی کە ئەم منداڵە بەتەواوەتی جاریێ جیـاوازی هینـی مـن و هینی تۆ ناکات و هەموو شتێك بەهینی خۆی ئەزانێت، چونکە ئەم منداڵە خۆی بە چەقی هەموو شتێك ئـەزانێت و تەنها بـیر لـەخۆی ئەکاتـەوە و بـەلای ئـەوەوە کەسـێکی تـر نیـە، بەمانایـەکی تـر ئـەم منداڵـە (لەتەمـەنی بـیر لەخۆکردنەوەدایە) و ئەمە شتێکی تایبەتە بەم تەمەنەوە و ئەگەر یارمەتی بدرێت بەسەر گیروگرفتـی ئـەم قۆناغـەدا ئەتوانێت سەرکەویت.

لەکاتێکی وادا پێویستە بەبیێ دەمارگیری مەسەلەی بۆ ڕونبکرێتەوە و تێی بگەیەنیت کە بۆی نیە شـتی کەسـێکی تر ببات و بیخاتە گیرفانیەوە، چونکە ئێستا لەوانەیە ئەویش بەدوایدا بگەڕێت و ئەگـەر نەیدۆزێتـەوە دڵـی نـاخۆش ئەبێت، وە تۆ ئەزانی کە ئەو نەیویستووە کە شتی ئەو ببات و تێکەڵی کردووە لەگەڵ شتەکانی خۆیدا و ئەمە جـاری واهەیە ڕووئەدات لەهەموو کەسێك .

بەڵام گرنگ ئەوەیە کە شتەکە بەرینەوە بۆی بۆ ئەوەی بەدوایدا نەگەڕێت، وە بۆی باس بکەیت کە تۆ توڕە نەبوویت و هەرئەوت خۆشئەوێت ئەگەر ئەم جاری دووەم ڕویداوە بەهەمان شێوە ڕەفتاری لەگەڵ بکەیت و دەمـارگیری نیشـان نەدەیت و تێی بگەیەنیت کەتۆ ڕێگای نادەیت هەڵەی وا بکات چونکە تۆ ئەوت خۆشئەوێت، هەموو ئەمانە لـەنێوان تۆ و منداڵەکەدا ئەبێت و ناکرێت بەدەنگوباس لەخێزانەکەدا.

ئەوەی پێویستە لێرەدا جیای بکەینەوە ئەوەیـە کـە منداڵەکـەت هاوڕێیـەکی گاڵتـەی بۆخـۆی پەیـداکردووە کـە هەندێکجار گوناهەکان ئەخاتەسەر ئەو لەگەڵ ئەوەی کە ئەم هـاوڕێ گاڵتەیـە بـۆ شـتی تـریش بـەکار ئـەهێنرێت و پێویستیەکی دەروونی گەورە بۆ منداڵەکەت ئەنجام ئەدات.

کاتێك منداڵەکەت باسی هاوڕێ گاڵتەکەی ئەکات هەروەکو ڕاستی بێت پێویست ناکات بـەدرۆی بخەیتـەوە و پێـی بڵێیت کە ئەمە ڕاست نیە، باشتر وایـە لەگـەڵی بچـیتە نـاو دنیـای خەیاڵـەوە و گرنگـی بـدەیت بـەم هاوڕێیـەی، لەهەمانکاتدا بۆی ڕونبکەیتەوە کە تۆ (دایکوباوکە کە) ئەزانێت بۆ ئەو گرنگە کە ئەم یارییە بکات.

کاتێك منداڵەکەت ئەیەوێت خەتای گوناهەکانی بخاتە سەر ئەم هاوڕێ گاڵتەیە ئەبێت پێی بڵێیت کەتۆ ئەزانیت کە ئەمە ڕێگایەکی ترە کە ئەو شتێکی کردووە کە تۆ ڕێگای نادەیت، یاخود پێی بڵێیت کە تۆ ئـەزانیت ئـەو نایـەوێت ڕاستیەکەی بڵێت و ئەیەوێت خەتاکەی بخاتەسەر هاوڕێ گاڵتەکەی، هەوڵ مەدە کە زۆری لێبکەیت کەوازی لێبهێنێت یان گاڵتەی پێبکەیت، ئەمە ڕاست نیە و ئەبێت بەهۆی ئەوەی کە منداڵەکەت سەری لێبشێوێت و زەرەری لێبکەوێت چونکە ئەم هاوڕێ گاڵتەیە ماوەیەکی تر لە دەوروبەری (5-6) ساڵیدا وون ئەبێت.

زۆر ڕوونکردنەوەی دەروونی هەیە بۆ ئەم هاوڕێ گاڵتەیە، هەندێکجار ئەم هاوڕێ گاڵتەیە، هەندێکجار ئەم هاوڕێ گاڵتەیە وەکو هاوڕێیەکی ڕاستی وایە بۆ منداڵ بەتایبەتی منداڵی ئەم تەمەنە، جاری وا هەیە کە توندوتیژی دایکوباوك بەرامبەر بە منداڵەکانیان وا ئەکات کە منداڵەکە بەهۆی ئەم هاوڕێ گاڵتەیەوە ئەتوانێت خۆی لەم توندوتیژیە بپارێزێت و خۆی ڕزگار بکات، ئەویش بەوەی کە ئەو هەستی گوناهبارییەی کە هەیەتی بیدات بەسەر ئەم هاوڕێ گاڵتەیەدا و گوناهی ئەو بگرێت کە دایکوباوکی لەگەڵ ئەم توندوتیژیەن و بەم شێوەیە لەهەستی گوناهباری خۆی کەمکاتەوە.

جاری وا هەیە کە ئەم هاوڕێ گاڵتەیە بۆ ئەوە بەکار ئەهێنرێت کە لەخۆ منداڵەکە بێهێزترە و لاوازترە و کەمتر ئەزانێت، بەمە منداڵەکە دڵی خۆی خۆشئەکات کە کەسێکی تر هەیە لەو بێهێزترە و لاوازترە و کەمزانترە و ئەم باڵای خۆی بەباڵای ئەو بێهێزە ئەپێوێ.

هەندێکجار بەکار ئەهێنرێت بۆ بەکارهێنان لەجیاتی شتومەك کە منداڵەکە ئاواتەخوازیەتی بەلام لەڕاستیدا بۆی ناکرێت، لەم کاتانەدا هاوڕێ گاڵتە بەهێزترە و ئاقڵترە و باشترە.

هەندێکجار ئەم هاوڕێ گاڵتەیە بەکار ئەهێنرێت بۆ فراوانتر کردنی خەیاڵی منداڵەکەو دروستکردنی سەرگوزشتە و گێڕانەوەی ڕووداو لەخەیاڵی خۆیدا و گێڕانەوەی بەسەر هاتەکانی خۆی بۆی، چونکە کەس نیە کە گوێی لێبگرێت و تێیبگات، لەم کاتەدا ئەم هاوڕێ گاڵتەیە دڵنەوایکەری منداڵەکەیە و هاوڕێیەکی بێدەنگی ئەبێت کە ئەم قسەی لەگەڵ ئەکات هەم گوێی لێئەگرێت و بڕوای پێئەکات و نهێنیەکانی ئەپارێزێت.

بەزانینی ئەو ڕاستیەی کە بووە هۆی ئەوەی کە بۆچی منداڵەکەت هاوڕێی گاڵتەی هەڵبژاردووە ئەتوانیت بزانیت چۆن ڕەفتاری لەگەڵ ئەکەیت، ئەگەر منداڵەکەت ئەم هاوڕێ گاڵتەیەی هەڵبژاردوو بۆ ئەوەی دڵنەوایی خۆی پێبکات ئەوە ئاسانە کە دڵنەوایی منداڵەکەت بکەیت، خۆ ئەگەر منداڵەکەت دەستی کرد بەتوڕەبوون لە بوکەکەی و لێدانی و هەڕەشەکردن لێی کە بۆچی دەستی یان دەموچاوی نەشتووە و هەردەم داوای لێئەکات کە بەگوێی بکات، ئەوە ئەیەوێت دەریخات کە هەمان شت لەخۆی داواکراوە و بۆی ناکرێت یاخود بەناهەقی ئەزانێت یان بەهەر شێوەیەك کاری تێکردووە و ئەیەوێت ئەم بارە قورسەی سەرشانی خۆی سوك کات، لەمکاتەدا پێویستە لەسەر دایکوباوك کە بەزوویی فریای منداڵەکانیان بکەون و دانیشن قسەی لەگەڵ بکەن، هەروەها هەوڵ بدەن ڕەخنەکانیان کەمکەنەوە و چاوێك بەپەیوەندی بەینی خۆیان و منداڵەکانیاندا بخشێننەوە، چونکە کاتێك کە منداڵەکە گەیشتە ئەوەی کە گلەییەکانی خۆی بخاتەسەر کەسێکی تر و ڕەخنە لەو بگرێت ئەوە مانای ئەوەیە کە منداڵەکە پڕبووە و ئەیەوێت خۆی بەتاڵ بکاتەوە لەبەرئەوە ئەم ڕێگایە ئەگرێت و خۆی ئەپارێزێت، بەمە فێری ئەوە ئەبێت کە بەردەوام بێت و لەدوارۆژیشدا هەمان ڕێگا بگرێتەبەر.

**پرسیاری 4**

**ئەگەر منداڵەکەمان شتێکی کرد سزای نەدەین ئەوەی چیبکەین، ئایا بۆی هەیە هەرچی ئەکات بیکات؟ ئایا هەموو جۆرە سزایەك خراپە؟**

## بۆچی منداڵەکانمان سزا ئەدەین

مرۆڤ لەپەرەوەردەکرندا جاری وا هەیە تووشی بارودۆخی وا ئەبێت کە ناچاری ئەکات منداڵەکەی سزابدات، لەبەرئەوەی گوێی لێنەگرتووە، کارێکی خراپی کردووە، کارێکی ترسناکی کردووە، شتێکی خراپی کردووە بەرامبەر کەسێکی تر.... هتد، ئێمە ئەمانەوێت منداڵەکەمان فێری ڕاست و چەوت بکەین، ئێمە ئەمانەوێت منداڵەکەمان لەشتی ترسناك بپارێزین.

هۆی دووەم لە هەموویان گرنگترە کە بیزانین، کاتێکە کە سزادانی منداڵ بۆ ئەوە بوو کە تۆڵە لە منداڵ بکرێتەوە ئەوە بێگومان ئەو دایکوباوکانە لە مانای منداڵ پەروەردەکردن نەگەیشتوون و هەرکاتێك کە توانیان و تێگەیشتن کە سزادان بەکاربهێنن وەکو یارمەتی بۆ تێگەیشتنی منداڵ و تێگەیشتن کە ڕێگای باشتر هەیە بۆ ئەم یارمەتیە، یارمەتیەك کە بریتیە لە ڕێگا نیشاندان و بەهێزکردنی پەیوەندی بەینیان لەجیاتی ئەوەی تێکی بدات، یارمەتیدانێك کە کەسایەتیی منداڵ خۆی بەهێز ئەکات لەجیاتی ئەوەی هەرجارەی هەڵەیەکی کرد نەختێك لە کەسایەتیی کەل بکرێت.

سزادان زۆر شێوەی جیاوازی هەیە و ناتوانرێت بە تەواوەتی دەست بۆ هەموویان ڕابکێشرێت، چونکە ئەوەی لەلای کەسێك بە سزا دائەنرێت لەوانەیە لەلایەکی تر وانابێت، ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ پەروەردەی دایکوباوك خۆی و ڕادەی خۆشەویستی بۆ منداڵەکەی و تێگەیشتنی لەخۆشەویستی، جا بۆیە لێرەدا هەر هەندێك نموونە دەهێنینەوە:

1. لێدان.
2. ناردنی منداڵەکە بۆ ژووری خۆی.
3. ڕۆژانە نەدان بەمنداڵەکە.
4. پەیمانێك کە داوتەتێ بۆی نەبەیتەسەر.
5. نەهێڵیت نان بخوات.
6. نەهێڵیت لەگەڵت دانیشێت.
7. تووڕەبوون و چاو مۆڕکردنەوە.

هەموو ئەم سزا دانانە کارئەکەنەسەر منداڵەکە بەشێوەی جیاواز و پلەی جیاواز، ئەوەی کە گرنگە ئەوەیە کە سزاکە بگونجێت لەگەڵ گوناهەکەدا و سزاکە پەیوەندی ڕاستەوخۆی هەبێت بەگوناهەکەوە و ئەنجامێکی ڕاستەوخۆ بێت بۆ خەتاکە، تاکو منداڵەکە تێبگات کە بۆچی سزای ئەدرێت.

ئەو ئەنجامە خراپانەی کە ئەتوانرێت لێرەدا دەستی بۆ ڕابکێشرێت و کە پەیوەندی هەبێت بەباسەکەمانەوە ئەمانەن:

1. بەهۆی سزاوە منداڵ فێر ئەکەین کە گەورە بۆی هەیە لە منداڵ بدات و بەهێز لە بێهێز بدات.
2. بەهۆی سزادانەوە فێری ئەکەین کە بەگوێمان بکات لە ترساندا نەك لەبەرئەوەی کە ڕێزمان بگرێت.

منداڵەکەت بەشێکە لەتۆ و ئێوە یەکتریان خۆشئەوێت، ئەمە لەلایەك و لەلایەکی ترەوە تێگەیشتنی منداڵەکەت لەڕاستی و هەڵە لەتۆوە وەریگرتووە و فێری بووە، جا بۆیە لەبەر ئەم دووڕاستیە، باشترین ڕێگا بۆ گەیشتن بە ڕاستی و پەروەردەیەکی ڕاست، ڕوونکردنەوەی هەستونەست و بیری خۆتە بۆی بۆ ئەوەی منداڵەکەت بزانێت چی بکات باشە و چی خراپە نەیکات، ئەگینا زۆر ئاسانە کە بەهەڵە لەیەکتری بگەن، کە زۆرجار ئەمەیە بناغەی گیروگرفتەکە، دایکوباوك وا ئەزانن کە منداڵەکەیان باش ئەناسن لەبەرئەوەی منداڵی خۆیانە و منداڵەکەش وا ئەزانێت کە باش لە دایکوباوکی گەیشتووە و بەگوێی ئەوان ئەکات کەچی لەڕاستیدا وانیە و بەهەڵە تێیان گەیشتووە، بۆیە قسەکردن و ڕوونکردنەوەی هەستونەست و ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕاتان بۆ یەکتری هەردوولا لەم هەڵەیە ئەپارێزێت.

ئەوەی گرنگە دەستی بۆ ڕاکێشین لێرەدا ئەوەیە کە جیاوازی بکەین لەنێوان ڕەخنەگرتن لە منداڵەکە و ڕەخنەگرتن لە ڕەفتاری منداڵەکە، چونکە جیاوازی هەیە لە نێوان منداڵەکە و ڕەفتاری منداڵەکە، لەبەرئەوە هیچ پێویست ناکات وا لەمنداڵەکەت بکەیت کە شەرم لەخۆی بکات لەبەرئەوەی ڕەفتارێکی کردووە و زەرەر لە کەسایەتیی منداڵەکە بدەیت، تۆ ئەوت خۆشئەوێت و ئەتەوێت ئەو خۆی بڕیاری خۆی بدات وەکو مرۆڤێکی سەربەست، باشتر وایە بڵێیت (کارێکی خراپت کردووە) وەك لەوەی بڵێیت (تۆ منداڵێکی خراپیت)، (دەنگت زۆر بەرزە) لەجیاتی (تۆ چەند منداڵێکی دەنگ بەرزیت) چونکە جیاوازی هەیە لە نێوان هەڵسوکەوت و کەسایەتیی منداڵەکەت، ئەوەی تۆ ڕەخنەی لێئەگریت و ڕەفتارێکی منداڵەکەیە کە ئێستا کردوویەتی نەك منداڵەکە خۆی، ئەمە وا ئەکات کە منداڵەکە جیاوازی بکات لەنێوان خۆی و ڕە فتارەکانیدا و بتوانێت ڕەفتارەکانی بگۆڕێت، وا ئەزانێت کە ئەم ڕەفتارانە بەشێکن لە کەسایەتیی خۆی و بەو ناگۆڕدرێت وە وا لێکبداتەوە کە (من شتی خراپ ئەکەم لەبەرئەوەی من منداڵێکی خراپم).

## سزادانی دەروونی

شکی تێدانییە کە دایکوباوك زۆر شێوەی سزادان بەکار ئەهێنن لە منداڵ پەروەردەکردندا، ووشەی سزا زۆرجار بەکار ئەهێنرێت بەمانای (لێدان) بەڵام لێدان زۆر شێوەی هەیە و تەنها لێدان ناگرێتەوە، کاتێك کە منداڵێك بۆی نیە بچێتە دەرەوە لەبەرئەوەی بەقسەی دایکی نەکردووە بەسزا دائەنرێت، کاتێك کە قۆڵی منداڵێك ئەگریت بەتوندی بۆ ئەوەی گوێت لێبگرێت هەر بەسزا دائەنرێت، کەواتە هەر ڕەفتارێك کە دایکوباوك و گەورەکان ئەیکەن بەرامبەر بە منداڵ لەبەرئەوەی کارێکی کردووە کە ئەوان پێیان ناخۆشە بەسزادان لێرەدا باس ئەکەین و ئەنجامەکانی بۆسەر دەروون و کەسایەتی منداڵ باس ئەکەین.

کاتێك لە کەسێك ئەپرسیت کە بۆچی سزی منداڵەکەی ئەدات لەوانەیە بڵێت کە (فێری ئەکەم) جابزانین چۆن ئەم منداڵە فێری شت ئەبێت بەهۆی سزادانەوە، سزادانی منداڵ یەکێکە لەو باسانەی بەئاسانی ناتوانرێت باسی لێوە

بکرێت، لەبەر زۆرهۆ کە لێرەدا پێویست ناکات جارێ باسی بکەین، تەنها ئەوەندە هەیە کە هەرکەسە بەشێوەیەك ئەم باسە لێك ئەداتەوە کە بگونجێت لەگەڵ سەرجەمی پەروەردەی خۆیدا، بەلاّم کەس نیە بیسەلمێنێت کە سزادان لەپەروەردەکردندا سوودی هەیە یان سوودی هەبووە.

کاتێك کە پرسیار لەو دایکوباوکانە ئەکەیت کە بڕوایان بە سزادانە ئەڵێن (سزادان تەنها ڕێگایەکە بۆ منداڵەکەیان کە سوودی هەبێت) یاخود ئەڵێن کە (بۆیان بسەلمێنێت کە بەڕاستیەتی) یان (داخڵی دڵی خۆمم پێڕشت) یان (کاتێك کە من منداڵ بووم لێدانم خواردووە و زەرەریشم نەکردووە، بگرە سوودی هەبووە بۆم) بەلاّم شکی تێدانییە کە هەموو دایکوباوکێك کە بە منداڵی لێدانی خواردبێت ئەو ئازار و ناخۆشی و خۆبەکەمزانینەی لە بیرماوە و بیری ئەکەوێتەوە کاتێك لە منداڵەکەی ئەدات، لەبەرئەوەی هیچی لێوە فێرنەبووە، جا بۆیە دەورەی تاوان و سزا بەردەوام تازە ئەبێتەوە و مرۆڤ هیچ لێوە فێرنابێت، چونکە ئەوەی مرۆڤ بەهۆی سزاوە فێری ئەبێت ناچێتە ویژدانیەوە.

ئەوانەی بڕوایان بەسزادانە، بڕوایان وایە کە بەلای کەمەوە منداڵەکە جارێکی تر ئەگەر بیەوێت ئەوکارە دووبارە بکاتەوە ئەوە نایکاتەوە، چونکە لەوەوپێش سزای وەرگرتووە و ئیتر فێربووە کەبۆی نیە ئەو کارە بکات، ئەمە ڕاستەو منداڵەکە ئەو کارە ناکات، بەلاّم نەك لەبەرئەوەی ویژدانی ڕێگای نادات، بەڵکو ترسی هەیە، نەکردنەکەی لەترسی شتێکە کە لەدەرەوەی ویژدانی ئەودایە و نەکردنەکە بەزۆر نەك بەقەناعەتەوە، ویژدانێك کە بەم شێوەیە کاربکات ویژدانێك کە هەرگیز بڕوای پێناکرێت.

ئەگەر ترسی سزادان بێت وا لەمنداڵەکە بکات کە ڕەفتاری خراپ نەکات نەك ویژدان، ئەوا زۆر کون و کەلەبەر هەیە بۆ ئەم منداڵە کە خۆی لەم ویژدانە بدزێتەوە، هەر ئەوەندە بەسە بۆ منداڵەکە کە بزانێت کارەکەی ئاشکرا نابێت، یاخود کاتێك خواستی کردنی کارەکە بەهێزتر لەو سزایەی منداڵەکە چاوەڕوانی ئەکات ئەوە بەلایەوە گرنگ نیە چی لێئەکەن و چۆن سزای ئەدەن و ئامادەیە کە سزای خۆی وەرگرێت، بەلاّم منداڵێك کە ویژدانی بریندار بێت کاتێك بیر لەوە ئەکاتەوە کە کارێکی نابەجێ بکات، ئەو منداڵە سیستمێکی ئاگادارکردنەوەی لەناوخۆیدا هەیە کە ئەویش ویژدانیەتی و ئەمە وا ئەکات کە خۆی بەرەزامەندی خۆی ئەمکارە نەکات وە پێویستی بە سیستەمێکی ئاگادارکردنەوە نیە لە دەرەوەی خۆی کە وەکو پۆبیس هەرجار ویستی شتێ بکات خێرا پەنجەی لێ بەرزبکاتەوە و پێی بڵێت کە نابێت ئەمکارە بکات، منداڵێك کە ویژدانێکی بۆ دروست بووبێت پێویستی بە پۆلیس نیە کە چاودێری بکات.

ئەو دایکوباوکەی ئەڵێن کە (بە منداڵی لێمدراوە کەچی ویژدانیشم هەیە و زەرەرم لێنەکەوتووە) ئەمانە ڕاست ئەکەن، بەلاّم لەگەڵ ئەمەشدا مانای ئەوە نیە کە ئەم ویژدانەی لەم لێدوانەوە بۆ مابێتەوە یان زەرەری لێنەدرابێت، ئەم چاکەیە ناتوانرێت بخرێتە پاڵ لێدان و بەرگری لە لێدان بکەین، ئەم ویژدانە لە خۆشەویستی دایکوباوکەوە هاتووە بەلاّم ئایا ئەم دایکوباوکە پرسیاریان لەخۆیان کردووە کە چۆن ویژدانیان ئەگۆڕا و چۆن ئەبوون ئەگەر بە منداڵی سزا نەدرانایە؟ ئایا زەرەریان لەهیچ بارەیەکی ترەوە نەکردووە؟ بۆ نموونە ڕۆحی یارمەتی و کاری هەرەوەزی، ئایا ئەمانە لەخەیاڵێکدا ناژین کە ئەیانەوێت شتی ناخۆشیان لەبیربچێتەوە و هەموو شتێکی کۆن بەخۆش ئەزانن بۆ ئەوەی بتوانن باری ناخۆشی ژیان هەڵگرن و بتوانن بەردەوام بن لە ژیاندا.

ئەوەی دایکوباوك وا لێئەکات کە سزادان بەکاربهێنێت بۆ ئەوەی منداڵەکە فێری شتی تازە بکات، ئەوەیە کە ئەو دایکوباوکە هیچ ڕێگایەکی تری پەروەردەکردن نازانن، بۆیە لەناچاریدا پەنا ئەبەنەبەر لێدان و سزادان، بەلاَم کاتێك ئەو دایکوباوکانە تێئەگەن کە ڕێگای تر هەیە بۆ پەروەردەکردن ئەوسا ئەزانن کە چ زەرەرێکی گەورەیان لەخۆیان و منداڵەکەیان و گەلەکەشیان داوە، چونکە منداڵەکانمان هەرچەندە لەئێمەوە هاتوون، بەلاَم سەروەت و سامانی گەلن و دوا ڕۆژی گەلەکەیان لە ئەستۆیە.

هەندێك لەوانەیە بپرسێت کە ئایا بەهیچ جۆرێك دایکوباوك بۆی نیە لە منداڵەکەی بدات؟ یاخود لەچ بارودۆخێکدا بۆیان هەیە لەمنداڵەکانیا بدەن بۆ ئەوەی پەروەردەیان بکەن؟ ئەمە پرسیارێکی گرنگە و وەلاَمدانەوەی زۆر ئاسان نیە ئەمە ئەکەوێتەسەر ڕادەی تێگەیشتنی دایکوباوك لە منداڵەکەی، یان تا چ ڕادەیەك منداڵەکەیان بە گرنگ ئەزانن و ئامانجیان لە پەروەردەکردنەکەدا چیە؟

هەموو ئەمانە باسمانکرد گرنگن و کار ئەکەنەسەر ویژدایەن منداڵ، بەلاَم لەمانەش گرنگتر هەڵسوکەوت و ڕەفتاری دایکوباوکە لەژیانی ڕۆژانەیاندا لەگەڵ منداڵەکان و خێزان و کۆمەڵدا، ئەم ڕەفتار و هەڵسوکەوتە ئەگوێزرێتەوە بۆ منداڵ و منداڵ ئەیانکات بە بەشێك لەژیانی خۆی.

**پرسیاری 5**

## منداڵەکەم لەتەمەنی ( 2 ) ساڵیدایە و هەر جارێك بەجێی دەهێڵم دەست ئەکات بەگریان بەدوامدا چی بکەم؟

لەکاتێکی وادا تۆ ناتوانیت هیچ بکەیت، چونکە منداڵەکەت بەردەوام ئەگری تاکو وا لەتۆ ئەکات کە لەلای بمێنێتەوە کە ئەمەش بەتۆ ناکرێت و پێویستە هەندێکجار بەجێی بهێڵێت و بچیت بەلای کاری خۆتدا، لەبەرئەوە پێویستە بڕیاری خۆت بدەیت و ئەگەر پێویست بوو بڕۆیت و نەگەڕێیتەوە .

هەرچەندە منداڵەکە بگری بەدواتدا و لە منداڵەکە بگەێنیت کە تۆ پێوستە بڕۆیت و ناچاریت، وە وانەکەیت کە منداڵەکەت فێری ئەوە بکەیت هەرکەویستی شتێکی بۆ بچێتەسەر ئیتر دەست بکات بەگریان و هاوار، گریانی منداڵەکەت شتێکی ئاساییە و ترسی منداڵەکە پیشان ئەدات لەجیابوونەوە لە دایکی، بەلاَم ئەم جیابونەوەیە بەشێکە لەژیان و منداڵ پێویستە فێرب ببێت.

جابۆیە هەر لەئێستاوە ڕابهێنرێت لەسەر جیابونەوە، ئەوەی کە زۆر گرنگە لێرەدا ئەوەیە کە بۆ منداڵەکە باسبکەیت کەی دێیتەوە و ئەبێت پەیمانەکەت ببەیتەسەر و لەکاتی دیاریکراودا بێیتەوە بۆلای، بەهیچ مەرجێك نابێت پەیمانی درۆی بدەیتێ و تووشی دڵشکاندنی بکەیت، ئەمە کارێکی خراپ ئەکاتەسەر پەیوەندی بەینتان و کەمتر بڕوات پێئەکات ئەگەر جارێکی تر بەجێتهێشت، بەلاَم پەیمانێکی ڕاست پەیوەندیتان زیاتر بەهێز ئەکات و جارێکی تر فێر ئەبێت کە بڕوات پێبکات و نەگری بەدواتدا، شتێکی تری گرنگ کە کاری گرنگ ئەکاتەسەر گریانی منداڵەکەت بەدواتدا ئەوەیە کە بەجێهێشتنی منداڵەکەت ئەبێت بە هێواشی و لەسەر خۆبێت و لەپێش

بەجێهێشتنەکەدا قسەی لەگەڵ بکەیت و بۆی باسبکەیت کەتۆ لەپاش نەختێك ئەڕۆیت و ئەو بەجێئەهێڵێت و دوایـی دێیتەوە بۆلای، وە لەکاتی بەجێهێشتنەکەدا ماچی بکەیت و خواحافیزی لێبکەیت و بـەجێی بهێڵێـت بـەبێ ئـەوەی هیچ تووڕەبوونێك یان خەفەتێك لەدەموچاوتدا دیاربێت و خـۆت وا پیشـان نـەدەیت کـەتۆ بـەزەییت پێـدا دێتـەوە، منداڵەکەت بەڕاستی ئەترسێت و غەمناکە و نایەوێت لەتۆجیا ببێتەوە، بەلاّم جیابونەوە بەشێکە لەژیان و منداڵ زۆر شتی لێوە فێر ئەبێت و تۆش بۆ هەموو دوا ڕۆژیش خۆت و منداڵەکەت لەزۆر تەنگوچەڵەمە ڕزگار ئەکەیت.

## پرسیاری 6

## منداڵەکەمان پێیگرتووە ( 18 مانگە ) و هەراسانی کردوین، ناتوانین شتێك لەژوورەکەدا دانێین، ئەو ڕائەکاتەسەری، گوڵەکانمان ئەخاتە خوارەوە و ئەیشکێنێ، چیبکەین و تاکەی ئەمە بەردەوام ئەبێت؟

منداڵەکەتان بەهرەیەکی زیـادکردووە و بەهرەیـەکی کـەمیش نیـە، هـەتاکو ئێسـتا لەسـەر پشـت و وسـك لێـی پاڵکەوتووە و نەیتوانیوە کار لەڕووداوەکان بکات، بەلاّم ئێستا پێیگرتووە و بەهەوەسی خۆی ئەکات، ئەم منداڵە کـە هەتاکو ئێستا بۆ پێئەکەنین کە شتێکی سەیری ئەکرد ئێستا بەلایەوە سەیرە کەتۆ پێی ئەڵێیت (مەکە) ئـەم منداڵـە ئەیەوێت هەموو شتێك بزانێت و بپشکنێت، ئەم منداڵە ئەیەوێت زانیاری تازەی دەسـتکەوێت، ئـەم منداڵـە ئێسـتا ئەتوانێت کاربکاتەسەر ڕێڕەوی ڕووداوەکان و وابکات وەکو خۆی ئەیەوێت، ئایا ئەمە زۆر نیە بۆ منداڵێك کـە تـاکو ئێستا نەیتوانیوە لەجێی خۆی بجوڵێت، بەلاّم ئێستا بتوانێت کاری وابکات کە گەورەکان بەخۆیەوە خـەریك بکـات و هەموو لەگەڵ ئەو خەریك بن، ئەمە ژیانی تازەی منداڵەکەیە و ئەو خۆی بەچەقی ژیـان ئـەزانێت و ئـەبێت هـەموو گرنگی بەو بدەن، بۆ منداڵەکە هەموو شتێك تازەیە و ئەبێت زانیاری لەبارەیەوە پەیدا بکات، توانای دایکوباوك بـۆ یەکەمجار لەم قۆناغەدا تاقی ئەکرێتەوە و لەدواڕۆژیشدا پاداشتی خۆی وەرئەگرێتـەوە، ئەگـەر بتـوانن لـەم ماوەیـەدا وەکو نمونەیەکی راست بن بۆ منداڵەکە و نیشانی بدەن کە ئەمان توانایـان هەیـە کـە بـەبێ تورەبـوون و هـاوارکردن داخوازیەکانی منداڵەکە بەڕوویەکی خۆشەوە و ڕەفتـاری ڕاسـت و دروسـتیان بـەردی بناغـەی خۆشەویسـتی منـداڵ دائەنێت هەم بۆ خۆی و خێزانی و بۆ کۆمەڵیش، لێرەوە منداڵ فێر ئەبێت بزانێت خۆی کێیە و کەسایەتیی بۆ دروست ئەبێت، کەواتە ئەبێت چیبکەین بـۆ ئـەوەی هـەم بتـوانین کـاری پـەروەردەیمان بەڕاسـتی بکـەین و هـەم خۆشمـان و منداڵەکـەشمان لـەئازار و تووڕەبـوونی ئـەم قۆناغــە ڕزگاربکـەین و بگەینـە ئـەو سـەبوریە رۆحیـەی کـە هەنـدێك دایکانوباوکانی منداڵی ئەم قۆناغە لێی بێبەشن و زۆرجار خۆیان بەگونهابار ئەزانن کە لەمنداڵـەکانیان تـوڕە ئـەبن لەبەرئەوەی شتی وا ئەکات کە ئەمان بەدڵیان و ناشزانن چی بکەن.

1. لەپێش هەموو شتێکدا ئەبێت ئەم ڕاستیانەی کە باسمانکرد چاك بیزانین، چونکە ئەمە ئەبێت بـەهۆی گـۆڕینی ڕەفتارمان بەرامبەر بە منداڵەکە کە ئەمە لەخۆیدا چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەکە ئاسانتر ئەکات بۆمـان و ئاسانتر بەرەوڕووی ببینەوە.

2. ئەو شتانەی کە منداڵەکە بۆی نیە دەستکاری بکات لەبەردەست لابرێت و بخرێتە شوێنێکی بەرز، ئەمە شتێکی کاتیە و کاتێك منداڵەکە گەورەتر بوو ئەوسا شتەکان بهێنرێتە خوارەوە، چونکە منداڵەکە لەوە ناگات کەتۆ پێی ئەڵێت کە دەستکاری نەکات، ئەم تێگەیشتنە ماوەیەکی تری ئەوێت و بەندە بەقسەکردنی گەورەکان لەگەڵ منداڵەکەدا.

3. هەرکاتێك منداڵەکە چووبەلای ئەو شتانەدا کە ناتوانرێت لابرێت و لەناو ژوورەکەدا ماونەتەوە، پێویستە بەبێ تووڕەبوون لەوشوێنە لابرێت و پێی بوترێت کەبۆی نیە دەستکاری بکات، ئەم کارە ئەبێت جار لەدوای جار دووبارە و سێبارە بکرێتەوە و بەهیچ شێوەیەك ڕێگا نەدرێت بە منداڵەکە لێی بدات.

4. هەوڵ بدرێت سەرنجی منداڵەکە بەلایەکی تردا ڕابکێشرێت، هەندێکجار منداڵ بگەڕێت بەدوای شتدا و بیدۆزێتەوە، کە ئەمە لەخۆیدا یارمەتیدەرێکی باشە بۆ کەمکردنەوەی ترسی لە یەکجیابوونەوەی منداڵەکە جابۆیە دانانی کارتۆنێك لەژوورەکەدا کە هەندێك شتومەکی تێدا بێت و هەر چەند ڕۆژ جارێك شتەکانی بگۆڕێت، یارمەتی منداڵەکە ئەدا کە ئیتر نەچێت بەلای شتەکانی تردا.

5. ئەو شتناەی کە بەرزکراونەتەوە جار جار بهێنرێنە خوارەوە و لەگەڵ منداڵەکەدا دەستکاری بکرێت، ئەمە لەبەر دوو هۆی گرنگ، یەکەم، منداڵەکە تێئەگات کە هەندێك شت هەیە کە نابێت دەستکاری بکات، دووەم ئەوەیە کە هەندێك شت هەیە کەبۆی هەیە دەستکاری بکات کاتێك لەگەڵ یەکێك لەگەورەکاندایە.

وەکو ئەبینین کە منداڵ پەروەردەکردن لەم تەمەنەدا زۆر ئاسان نیە و چارێکی وا ئاسانیش نیە بۆ گیروگرفتەکانی، لەبەرئەوە باشترین شت ئەوەیە کە توانای خۆت بەکاربهێنیت بۆ ئەوەی گیروگفرتی ئەم قۆناغە کەمکەیتەوە و هەوڵ بدەیت کە خۆت بۆ گیروگرفتەکان ئامادە بکەیت پێش ئەوەی ڕووبدات، هەروەها هەوڵ بدەیت لەگەڵ کەسانی دەوروبەر قسەبکەیت و لێیانەوە سوود وەرگریت، بەلاّم لەبیرت نەچێت کە پەیوەندی بەینی تۆ و منداڵەکەت جیاوازە لە پەیوەندی کەسانێکی تر و ئەبێت بڕیاری پەروەردەکردنی منداڵەکەت لەخۆتەوە بێت و کەسێکی تر نیە منداڵەکەت بەقەدەر تۆ بناسێت.

**پرسیاری 7**

**ئایا ڕێگا بدەین بە منداڵەکەمان کە سەیری هەموو شتێك بکات لە تەلەفیزیۆندا و چیبکەین کاتێك فلیمی ماچ و موچ پێشان ئەدات، چونکە کاتێك بە منداڵ پێنج ساڵیەکەمان ئەڵێین کە نابێت ئەو سەیری بکات ئەوەندەی تر ڕق ئەگرێت و ئەچێتە بەر تلفزیۆنەکە و ئەیەوێت بیکوژێنێتەوە، چار چییە؟**

زۆرجار دایکوباوك تەلەفیزیۆن بەکار ئەهێنین بۆ دەمکوت کردنی منداڵەکەیان و وازی لێئەهێنن کە دانیشێت و سەیری هەموو شتێك بکات بەومەرجەی دەنگی لێوە نەێت، ئەمە لەڕاستیدا منداڵ هەستی پێئەکات و ئەزانێت کە

ئەمە تەنها بۆ دەمکوت کردنیەتی، لەبەرئەوە فێر ئەبێت کەبۆ ئەوەی شتی تریشی بۆ بچێتەسەر گڕوئەگرێت و داوای زیاتر ئەکات.

منداڵ زیرەکە لەشت فێربووندا و هەرچی ببینێت و ببیستێت ئەیکات و لاسایی ئەکاتەوە، بەلاّم ئەمە مانای ئـەوە نیە کە منداڵەکە لەمانای ئەو کارە گەیشتووە یان ئەزانێت بۆچی وائەکات، ئەم لاسـاییکردنەوەیەی منـداڵ هـەتاکو تەمەنی (4-5) ساڵانیش پەیوەنـدی بـە پشـکنین و گـەڕان بـەدوای راسـتیدا هەیـە و منـداڵ ئەیـەوێت لەڕاسـتی مەسەلەکان بگات، جا ئەم پشـکنینە جـاری واهەیـە کـە سـوودی هەیـە بـۆ منـداڵ و منـداڵ بەئاسـانی وەلاّمـی پرسیارەکەی دەست ئەکەوێت، ئەگەر بینی پەرداغێك کە بیدات بەزەویدا ئەشکێت ئـەوا بەئاسـانی وەلاّمـی دەسـت ئەکەوێت، بەلاّم هەندێکجار گەڕان بەدوای وەلاّمدا ئەوەندە ئاسان نیە و منداڵەکە بەهەڵە لە باسەکە ئەکات.

وتمان کە منداڵ پێویستی بە سنور و یاسا هەیە کە لەسەری بڕوات و خێزان پێویسـتە کـە ئـەم سـنور و یاسـایانە لەگەڵ منداڵدا باس بکەن، بەمە هەم منداڵەکەش و هەم خۆشت لە ئەنجامی چاوەڕێ نەکراو ئـەپارێزیت، بەمـەرجێك تۆش وەکو پەروەردەکارێکی دڵسۆز ئامادەبیت کە پەیڕەوی ئەو دەستور و یاسایانە بکەیت و لێپرسـراوی ئـەوە بیـت کەتۆ دایکوباوکیت و دایکوباوکیش پێویستی بەهەندێك سنور و یاسای تازەیە کە هەندێکجار لەوانەیـە گـران بێـت، بەلاّم پەیڕەوی کردنی لەلایەن دایکوباوکەوە ئەبێت بەهۆی کەمکردنەوەی تەنگوچەڵە لەدوارۆژدا.

بۆ ئەوەی خێزان سود لەم ئامێرە بەنرخە وەرگرێت و بەسوودی خێزان بگەڕێتەوە باشتر وایە بۆ خێزان چـاوێك بـەم خالاّنەی خوارەوەدا بخشێنێتەوە:

- کاتی سەیرکردنی تەلەفیزیۆن بۆ منداڵ دیاری بکرێت بەمەرجێك بگونجێت لەگەڵ تەمەنیدا.
- دایکوباوك لەگەڵ منداڵدا دانیشن و بەشداری منداڵەکـە بکـەن، بەمـەرجێك دانەنیشـن و دەسـت بکـەن بەتوانج و پلار و قسەکردن.
- دوای تەواو بوونی پرۆگرامەکە داوا لە منداڵەکان بکرێت کە بچنە ژووری خۆیان و لەوێ یاری بکەن.

دانیشتنی دایکوباوك بەرامبەر تەلەفیزیۆن و سەیرکردنی هەندێك زنجیرە و پرۆگرامی خێزانی وا ئەکات کە منـداڵی بچوکیش ئاشنای ئەم پرۆگرامانە ببێت و هەر کەگوێی لە مۆسیقا پێشەکیەکەی بوو ئیتر (بەغیلی و حەسوودی) بەرز ئەبێتەوە و دەست ئەکات بە داواکاری شتی وا کە ئاسان نیە لەوکاتەدا، چونکە باش ئەزانێت کە پشتگوێ ئەخرێت و لەوکاتەدا، لەبەرئەوە ناچار دەست ئەکات بەلاسـاییکردنەوەی ئەکتـەرەکان یـان ئەچـێتەبەر تەلەفیزیۆنەکـە و هـەوڵ ئەدات بیکوژێنێتەوە و دایکوباوکی توڕە بکات.

لێرەدا دوو ڕێگا هەیە بۆ دایکوباوك کە بیگرنەبـەر، یـان ئـەوەتا سـەیری پرۆگرامەکـە ناکـەن کاتێـك منداڵەکـە بەخەبەرە و هەوڵ ئەدەن تۆماری بکەن و دوایی سـەیری بکـەن، یـان ئـەوەتا لەگـەڵ منداڵەکـەدا سـەیری ئەکـەن و منداڵەکەش بەشداری خێزانەکە ئەکات لەسەیرکردنی ئەو ماچ و مووچەی کە لەوانەیە خێزانەکە پێی خۆشنەبێت کـە منداڵەکەیان سەیری بکات، ئەمە پەیوەندی هەیە بە بیروڕای خێزانەکەوە بۆ ئەم دیمەنانە و خێزان خۆی بڕیاری لەسـەر ئەدات، بەلاّم لەهەمـوو بڕیارێکدا پێویستە دایکوباوك ڕاستگۆبن و بڕیارێکی وانەدەن کە ڕێزی منداڵەکان کەمکاتەوە بەرامبەریان، چونکە وەکو وتمان منداڵ ئەوە ناکات کە پێی ئەڵێیت بەڵکو ئەوە ئەکات کەتۆ ئەیکەیت.

پرۆگرامی تەلەفیزیۆن بەهۆی کابڵ و ساتلیتەوە وا زۆر بووە کە هەموو سنورێکی پچڕاندووە و بووە بەئامێرێکی بەهێز بۆ بلاّوکردنەوەی پرۆگرامی جۆراوجۆر کە هەندێکیان لەگەڵ کولتوری هەندێك کۆمەڵ و بیرو زانستدا ناگونجێت و کار ئەکاتە سەریان، کەس ناتوانێت نکوڵی لەوە بکات کە ئەو پرۆگرامە خوێناویانەی لەم چەند ساڵەی دوایدا بلاّوبونەتەوە و ئەو هەموو خوێن و شەق هاویشتن و چاو دەرهێنان و سەربڕینەی بەهۆی تەکنیکی تازەوە بۆ مان هاتووتە کونی ژوورەوە چەند کارێکی خراپ ئەکاتەسەر تەندروستی و ڕەوشی منداڵ، جا بۆیە دایکانوباوکان کارێکی تریان بۆ زیاد بووە ئەویش ئەوەیە کە پاسەوانی ئەو پرۆگرامانە بن و لەگەڵ منداڵەکانیان قسەی لەبارەوە بکەن بەمە زیاتر خۆشەویستی دایکوباوکیان بۆ دەرئەکەوێت و فێریش ئەبن کە لەنێوان باش و خراپدا هەڵبژێرن و خۆیان سەربەست بن لەبڕیارەکانیاندا.

## پرسیاری 8

**منداڵێکی شەش ساڵانمان هەیە، هەرکە ئەچینە دەرەوە ئیتر دەست ئەکات بەگریان بۆ شیرینی و یاری ناوێرم بچمە دوکانێکەوە، چونکە ئەزانم کە ئەمکات بەسینەما، هەموو جارێك ناچار ئەبم کە بەقسەی بکەم، ئێستا کەخەریکە قوتابخانە دەست پێئەکات ئەترسم نەچێت بۆ قوتابخانە ئەگەر ئەوەی ئەیەوێت بۆی ئەکەم، ئەزانم گوناه گوناهی خۆمە، بەلاّم چیبکەم چارێك؟**

باجارێ لەخۆتەوە دەست پێبکەین و بڵێین کە پێویست ناکات دانیشت و سەرزەنشتی خۆت بکەیت، هەموومان هەڵەئەکەین لەپەروەردەکردنی منداڵەکانماندا و تەنها ڕێگەیەك بۆ ئەوەی فێرببین ئەوەیە کە بزانین کە هەڵەمان کردووە و هەوڵ بدەین خۆمان ئامادە بکەین بۆ جاری داهاتوو، ئەوەی تووش لێرەدا ئەمەیە کە کردووتە، بە باسکردنی ئەم بارودۆخەی خۆت بۆ کەسێکی تر دەریئەخەیت کە تۆ هەستت بەوە کردووە کە پێویستە بارودۆخەکە بگۆڕێت و ئامادەنیت کە بەردەوام ڕێگا بەمنداڵەکەت بدەیت کە بەئارەزووی خۆی بکات، ئەمە هەنگاوێکی گرنگە و نابێت پشتگوێ بخرێت.

1. منداڵ زیرەکە لەتاقیکردنەوەی گەورەکان بۆ ئەوەی بزانێت چی بۆ هەیە بیکات و چی بۆنیە نەیکات، بۆ ئەمەش زۆر ڕێگا تاقیئەکاتەوە، یەکێك لەم ڕێگایانە ئەوەیە کە منداڵەکەت کاتێك داخوازیەکانی داوا ئەکات کە تۆ نەتەوێت پێشانی خەڵکی بدەیت کە لەمنداڵەکەت تورە ئەبیت، یاخود سەرت قاڵ بێت بە هاوڕێیەکەوە یان میوانێکی خۆشەویست لەلات بێت یان لە ناوەڕاستی بازاڕدا کە اۆ تەنها ئەوەت بەدەستەوە ئەمێنێتەوە کە بەقسەی منداڵەکەت بکەیت، منداڵەکەت زۆر باش ئەزانێت کە چ شوێنێك هەڵئەبژێرێت بۆ ئەوەی داخوازیەکانی بۆ جێبەجێ بکرێت، لەبەرئەوەی ئەمە ماوەیەکی خایاندووە و منداڵەکە فێربووە لەوانەیە چارەکردنی نەختێك گرانتر بێت، بەلاّم ئەکرێت و ئەتوانێت منداڵەکەت فێربکەیت کە داوای شت نەکات لەهەموو شوێنێکدا هەستونەستی.

2. پێویستە دایکوباوك بەیەك شێوە ڕەفتار بکەن لەگەڵ منداڵەکەدا و ڕێگای پێ نەدەن کە بەکاریان بهێنێت بۆ سوودی خۆی و دایکوباوك بکات بەگژیەکتریدا.
3. پێش چوونە دەرەوە ئەبێت لەگەڵ منداڵەکەدا ڕێککەویت کە ئەگەر لەبازاڕ ئاقڵ بوو وە داوای شتی نەکرد کە هاتنەماڵەوە شتێکی خۆشی ئەدەیتێ یان یاریەکی لەگەڵ ئەکەیت، بەلام ئەگەر وای نەکرد وەکو بڕیاردرا بوو ئەوا بۆی نیە لەگەڵ ئێوە نان بخوات یان سەیری تەلەفزیون بکات یان هەرشتێکی وا کە بتوانرێت جێبەجێ بکرێت و لەبیرنەچێتەوە، ئەمە گرنگە کە منداڵەکە بۆی دەرکەوێت کە تۆ بەڕاستیتە و ئەوەی ئەیلێیت ئەیبەیتەسەر.
4. هەرچەند هاوار بکات و خۆی بدات بەزەویدا لەبازاڕ تۆ گوێی نادەیتێ و پێی ئەلێیت (ئەگەر ئەیەوێت خۆی بدات بەزەویدا و بگری، ئەوە خۆی بڕیار ئەدات، بەلام تۆ ئامادەنیت کە لەسەری ڕاوەستێت و ئەڕۆیت و بەجێی ئەهێڵێت، ئینجا بڕۆیت و ئاوڕی لێنەدەیتەوە، گوێ مەدە بەقسەی خەڵکی و سوربە لەسەر بڕیارەکەت و ئەگەر کەسێك دەستی خستە کارەکەتانەوە داوای لێبکە کە ئەمەکاری تۆیە و ئەو پێویست ناکات خۆی تێهەڵقورتێنێت، زۆ ناخایەنێت کە منداڵەکەت ڕا ئەکات بەدواتدا و ناچار ئەبێت بەقسەت بکات.
5. وازی لێبهێنە لەقەفرتێی خۆی بکات و داوای لێ مەکە کە نەگری، لەم حاڵەتەدا ڕق ەکەی دائەمرکێتەوە و ئەزانێت کە گریان و لەقەفرتێ دانی نادات و ناگاتە ئەنجام، بەلام ئەگەر داوای لێبکەیت کە نەگری، ئەوە تێئەگات کە تۆ پێت ناخۆشە و شەرم ئەکەیت کە ئەو بگری و ئەمە ئەکات بەچەك بەدەستیەوە بۆ ئەوەی ناچارت بکات بەقسەی بکەیت.
6. ئەگەر منداڵەکەت بەقسەی کردیت و لەبازاڕدا داوای شتی نەکرد، ئەبێت پەیمانەکەی خۆت بەبێ کەم و زیاد ببەیتەسەر، ئەم سەرکەوتنە بکەیت بەسەرکەوتنی ئەو و سوپاسی بکەیت و بۆی باسبکەیت کە ئێستا تۆ دڵخۆشبویت وە ئەگەر هەموو جارێك وابکات ئەوا پاداشت ئەدرێتەوە.
7. لەبەرئەوەی منداڵەکە ئێستا نەختێك ژمارەکردن فێربووە، باشتر وایە هەر لەئێستاوە ڕۆژانەی بۆ بڕێتەوە و خۆی سەرپشك بکەیت لە بەکارهێنانی ڕۆژانەکەیدا، مانای سەرپشککردن لێرەدا بەمانای سەرپشککردنی تەواو دێت و ئەبێت لەسەدا سەد بێت، بەمانای ئەوەی منداڵەکە چی لێئەکات بیکات و کەس بۆی نیە ڕەخنەی لێبگرێت یان داوای لێبکات کە چۆن و کەی بەکار بهێنێت ئەمە لەماوەیەکی کورتدا لەوانەیە وانەبێت وەکو دایکوباوك ئەیانەوێت، بەلام لەدوارۆژدا بۆ دایکوباوك دەرئەکەوێت کە کارێکی باشیانکردووە و خۆیان لەزۆر تەنگوچەڵەمە ڕزگارکردووە و منداڵەکەشیان فێری زۆر شت کردووە.
8. دانانی ڕۆژێك بۆ خواردن و کڕینی شیرینی و ساردەمەنی یارمەتی منداڵەکەت ئەدات کە بزانێت کەی بۆی هەیە ئەمانە بخوات و داوای بکات، بەمانایەکی تر لە کاتەکانی تردا بۆی نیە نە داوای بکات نە بیخوات، بەمە منداڵەکە تێئەگات و فێر ئەبێت کەچی بۆ هەیە و چی بۆ نیە و پێویست بەگریان ناکات.

**پرسیاری 9**

**منداڵەکەمان تەمەنی شەش ساڵ و نیوەو هەتاکو ئێستاش میز ئەکات بەخۆیدا، هەرچیەکمان کردووە بەخۆڕایی چووە، هەست ئەکەین کە خۆشی پێی ناخۆشە و شەرم ئەکات، باوکی گاڵتەی لەگەڵ ئەکات و پێی ئەڵێت ئەگەر میز بکەیت بەخۆتدا ئەوا کچان حەزت لێناکەن، ئەڵێت ئەمە وای لێ ئەکات کە بترسێت و ئیتر میز نەکات بەخۆیدا، ئایا باوکی ڕاست ئەکات یان نا.**

میزکردنی منداڵ لەناو جێگادا شتێکی ناخۆشە هەم بۆ منداڵکە و هەم بۆ دایکوباوك و خێزان، بەڵام ئەگەر لەخۆمان بپرسین کێ لەمانە زۆری پێ ناخۆشە؟ ئەوا بەبێ شك بۆ مان دەرئەکەوێت کە منداڵەکە لەهەموویان زیاتر پێی ناخۆشە، چونکە لەگەڵ ئەوەشدا کە جلەکان و جێگاکەی تەڕ ئەبێت، ئەشترسێت کە خەڵکی پێی بزانن و گاڵتەی پێبکەن، جابۆیە ئەمە لەهەموو شتێك زیاتر ئەبێت ڕەچاو بکرێت و باسەکە تەنها لەنێوان دایکەکە و منداڵەکەدا بێت.

هەموو منداڵێك جارێ لەجاران میز ئەکات بەخۆیدا و ئەمە شتێکی ئاساییە، کوڕان دوو تا سێ جار زیاترە وەك لەکچان میز ئەکەن بەخۆیاندا، نزیکەی 12 تا 25 لەسەدا لەمنداڵانی تاکو تەمەنی چوار ساڵی و 13 لەسەدا منداڵانی تاکو تەمەنی شەش ساڵی میز ئەکەن بەخۆیاندا و ئەمە بە زیاد بوونی تەمەن کەم ئەبێتەوە و زۆر کەم لەمنداڵانی 12 ساڵی میز ئەکەن بەخۆیاندا.

### هۆی میزکردن بەخۆدا

زۆر باسکراوە لەم بارەیەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانرێت بەتەواوەتی دەست بۆ هۆیەکانی ئەم دیاردەیە ڕابکێشرێت، ئەمە زۆر هۆی هەیە کە لەمانە بۆ ماوەیی، دەرمانی، دەروونی، خەوزڕان، دواکەوتویی پێگەیشتن.

ئەگەر خێزانەکە زۆر دڵگیر بوون باشتر وایە کە پزیشکی منداڵ چاوی پێبکەوێت و ئەو بڕیاربدات ئەگەر پێویست بوو کە پزیشکی دەروونی تەماشای بکات، پێویستە بەتەواوەتی لەژیانی منداڵەکە بکۆڵرێتەوە و هۆی ئەمە بزانرێت چۆن دەستی پێکردووە و چ گۆڕانێك لەخێزانەکەدا ڕوویداوە و خێزان چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەم ڕەوشەدا ئەکەن، ئایا کەسێك لەخێزانەکەدا بووە بەهۆی ئەمە، یان کەسێکی خۆشەویستی منداڵەکە مردووە یان لەوێ نەماوە یان خێزانەکە منداڵی تازەیان بووە، ژیانی ڕۆژانەی منداڵەکە چۆنە و چی لێهاتووە زۆر شتی تر کە خێزان خۆی بەلایەوە گرنگە، ئەمانە هەمووی ئەبێت شیبکرێتەوە پێش ئەوەی بڕیار بدرێت کەچیبکەن و چۆن ڕەفتار لەگەڵ منداڵەکە بکەن.

### چۆن هەڵسوکەوت ئەکەین لەگەڵ منداڵێکی وادا؟

هەندێك ڕێگای گشتی هەیە بۆ یارمەتیدانی منداڵێك كە میز ئەكات بەخۆیدا كە هیچ ڕێگایەك لەم ڕێگایانە زەرەری نیە و ئەوەندەشی تێناچێت و هەریەكێك لەمانە بەتەنها یان بەیەكەوە یارمەتیەكی باشە بۆ منداڵەكە:

◆ لەبیرت نەچێت كە هەموو منداڵێك هەندێكجار میز ئەكات بەخۆیدا و ئەمە مانای ئەوە نیە كە منداڵەكەت كەموكوڕیەكی تێدایە.

◆ منداڵەكەت كەمتر میز ئەكات بەخۆیدا كە گەورەتر بوو.

◆ منداڵەكەت بەئارەزووی خۆی میز ناكات لەناو جێگاكەیدا و بەدەستی خۆی نیە كە ناتوانێت كۆنترۆڵی میزڵدانی خۆی بكات، لەبەرئەوە دووركەوەرە لە تووڕەبوون و شەڕكردن لەگەڵیدا، چونكە ئەمە زیاتر تەنگوچەڵەمەكە قوڵتر ئەكاتەوە و زیاتر منداڵەكە میز ئەكات بەخۆیدا و ئەم میزكردنە نابێت ببێت بەشتێكی سەرەكی لە پەیوەندیتان لەگەڵ یەكتر و بەینتان ناخۆش بكات و منداڵەكە وای لێبێت شەرم لەخۆی بكات و خۆی بێنرخ سەیر بكات.

◆ كەمتر ئاو بدە بە منداڵەكەت لەپێش نوستندا.

◆ منداڵەكەت بەخەبەربێنەرەوە پێش ئەوەی خۆت بچیت بنویت.

◆ بەهیچ شێوەیەك داوا لەمنداڵەكەت مەكە كە میز نەكات بەخۆیدا، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە كە بۆی باس نەكەیت كە تۆ حەز ئەكەیت كە ئەو هەوڵ بدات كۆنترۆڵی میزڵدانی خۆی بكات بەوەی ئاگای لەخۆی بێت كە كەم ئاو بخواتەوە و ئەگەر میزی هات خێرا ڕاكات بۆ ئاو دەستەكە، دووركەوەرەوە لەوەی نارەزایی دەربڕێت كاتێك كەمیزی كرد بەخۆیدا.

◆ ئەو شەوەی كە منداڵەكە میز ناكات بەخۆیدا، ستایشی بكەیت و ئەگەر هەبوو پاداشتی ئەمەی بدەیتەوە و دیاریەكی بدەیتێ و دڵخۆشی خۆتی بۆ دەربڕیت.

◆ ئەم تەنگوچەڵەمەیە پێویستە لەنێوان دایك و منداڵەكەدا بێت و نەكرێت بە بنێشتە خۆشەی سەر زمانی خێزانەكە و لەهەموو شوێنێك و كاتێكدا باسبكرێت.

◆ بگەڕێ بەدوای هۆلا میزكردنەكەدا، لەوانەیە هۆكەی یەكێك لەمانەی خوارەوە بێت:

1. ترسی جیابونەوەی منداڵەكە لەدایكی.
2. لەدایك بوونی خوشكێك یان برایەك.
3. مردنی كەسێكی خۆشەویست.
4. داوای دایكوباوك كە منداڵەكە ناتوانێت بیان باتەسەر و ئەترسێت كە دڵیان لێی بڕەنجێت.
5. ڕووداوێكی ترسناك كە بووبێت بەهۆی ئەمە.
6. ئاژاوەی ناو ئەندامانی خێزانەكە كە بەمنداڵەكە جار ناكرێت.
7. هۆیەكی دەروونی كە دایكوباوك ناتوانن تێیبگەن و پێویستیان بەیارمەتی پزیشكی تایبەتی هەیە.

**پرسیاری 10**

**منداڵێکی ساوامان هەیە کە تەمەنی 11 مانگە، ئێستا فێربووە کە لە باوەشماندا نەبێت خەوی لێناکەوێت و هەر کە دایئەنێین خەبەری ئەبێتەوە و دەست ئەکات بەگریان، چیبکەین و چۆن ئەتوانین لەم خوە خرا پەی ڕزگارمان ببێت؟**

ئەمە خویەکی ناخۆشە کە منداڵەکەتان فێرکردووە، کەواتە منداڵەکە فێربووە و ئەبێت ڕێگایەك هەبێت بۆ ئەوەی منداڵەکە بتوانێت فێرببێت بنوێت، ئەمە زۆرجار لەدوای نەخۆشی (کۆلیك) کە زۆربەی زۆری منداڵ ئەیگرێت لەمانگەکانی یەکەمی ژیانداو جاری واهەیە هەتاکو تەمەنی شەش مانگیش بەردەوام ئەبێت، جالەم ماوەیەدا دایکوباوك زۆرگرنگی ئەدەن بە منداڵەکە و لەباوەشی ئەگرن و شەونخونی بەدیارەوە ئەکێشن، یاخود گرنگیەکی زۆری پێئەدرێت بەمنداڵەکە لەمانگەکانی یەکەمدا، لەوانەیە کە منداڵەکە هەموو شەوێك کۆلیکی هەبووبێت و دایك لەباوەشی گرتبێت و لەژوورەکەدا پیاسەی پێکردبێت، بەلاّم کاتێك منداڵەکە تەمەنی ئەگاتە چوار پێنج مانگان ئیتر ئەوەندە ئازاری نەماوە، بەلاّم فێربووە کە لەباوەش بگیرێت و گرنگی پێبدرێت.

منداڵێك کە ئەیەوێت هەموو شەوێك لەباوەش بگیرێت، ئەبێت هەوڵێکی زۆربدات و زۆر لەخۆی بکات بۆ ئەوەی بەخەبەربێت، شەوی یەکەم تاکو کاتژمێری دە و دوایی یانزە و تاکو وای لێدێت کەنیوەی شەوەکە بەخەبەرە و دوایش هەموو شەوەکە، منداڵەکە چاو ئەنوقێنێ و ملی خوار ئەبێتەوە، وە هەرکاتێك دایکوباوك هەوڵیان دا کە بیخەنە شوێنی خۆی ئەوا خەبەری ئەبێتەوە و دەست بەگریان ئەکات.

شەوانێکی بێخەوی وا بۆ دایکوباوك و بۆ منداڵەکەش ناخۆشە و کارئەکاتەسەر ژیانی ڕۆژانەی هەموو خێزانەکە، منداڵەکە بەڕۆژیش گرینۆك ئەبێت و ناتوانێت بەباشی نان بخوات و ئەوەندەی تر دایکوباوك بێتاقەت ئەکات و ئەوانیش ناتوانن پێویستیەکانی بەباشی بۆ جێبەجێکردن.

ئەمە ئەتوانرێت دوایی پێ بهێنرێت کاتێك زانیمان کە ئەمە بۆ منداڵەکەش ناخۆشە و ئازاری ئەدات، جابۆیە بۆ شەوی داهاتوو ئەتوانێت بیبەیتە ژووری خۆیی و شەوباشی لێبکەیت و بەڕوویەکی خۆشەوە بەجێی بهێڵێت و نەگەڕێتەوە لای هەرچەندە بگری و هاوار بکات، ئەمە شەوی یەکەم لەوانەیە ماوەی (20) دەقیقەیەك بگری و شەوی دووەم کەمتر و شەوی دوایتر کەمتر، تاکو ئەبینی لەماوەی چوار پێنج شەودا ئەمە دوایی دێت و منداڵەکە ئیتر ناگرێت و خۆی خەوی لێئەکەوێت.

ئەمە ئەکەوێتە سەر توانای دایکوباوك بۆ ئەوەی چەند ئەتوانن تەحەمەولی گریانی منداڵەکە بکەن و ئەتوانن نەچن بەلایداو ناترسن و ئەزانن کە ئەمە بۆ سوودی هەموو لایەکە و منداڵەکە هیچی لێنایەت هەرچەندە ئەگری و ئەزریکێنێت.

ئەگەر دایکوباوك بزانن کە چۆن گیروگرفتی نوستنی منداڵەکە بەئاسانی چارەسەر ئەکرێت و چۆن ئەتوانن ژیانی خۆیان و منداڵەکەیان باشتر ئەبێت لەماوەی ساڵانی داهاتوودا ئەوا بەلای کەمەوە ئەتوانن هەوڵێك بدەن و ئەم ڕێگایە تاقیبکەنەوە.

**پرسیاری 11**

**منداڵەکەمان تەمەنی 2 ساڵە و هەتاکو ئێستا گیروگرفتێکی وامان نەبووە، بەلاّم ئێستا فێربووە کە شەو خەبەری ئەبێتەوە ئەیەوێت بیگرینە باوەش، ئێمەش هەردووکمان کارمان هەیە و ناتوانین شەوی دوو سێ جار هەڵسین و ئەو بگرینە باوەش، چارمان چیە؟ ئەبێت هەر بیگرینە باوەش؟ یاخود قەیناکات ئەگەر لەگەڵ دایکی بنوێت تاکو بەیانی، چونکە بیستومانە کە ئەمە باش نیە بۆ منداڵ .**

هیچ منداڵێکی یەك دوو ساڵان نایەوێت خۆی بچێت بنوێت، ئەمە شتێکی ئاساییە، زۆر دایکوباوك خۆزگەی ئەوە ئەخوازن کە قاچی لێراکێشن و پاڵی لێبدەنەوە لەدوای ڕۆژێکی قورس و پڕ ئێش و ئازاری منداڵ بەخێوکردن و پشوویەك بەخۆیاندا بدەنەوە، بەلاّم ناخۆشترین کاتی منداڵ چوونەسەر جێگا و نوستنە و حەز ناکات ئەو خۆشیەی لەدەست بچێت کە ئەیتوانی لەگەڵیاندا بووایە و یاری بکردایە، ئەم گرفتە شتێکی ناخۆشە بۆ هەردوولایان لە ئێستاو لەدووا ڕۆژیشدا و ئەبێت بەهۆی دروستکردنی گیروگرفت بۆیان.

چۆن چاری ئەم گیروگرفتە ئەکرێت پەیوەندی هەیە بەباروودۆخی خێزانەوە و خێزان خۆی بڕیاری ئەوە ئەدات کە کەی منداڵەکەی پێویستە بچێت بنوێت و لەکوێ ئەنوێت، بۆ ئەوەی گیروگرفتی نوستن کەمتر ببێتەوە، چەند خاڵێك لێرەدا باس ئەکەین بۆ ئەوەی لەوێوە بچینە ناو باسەکەمانەوە و دایکانوباوکانیش سوودی لێوەربگرن.

1. هەرگیز نوستن بەکارمەهێنە وەکو سزادان، (ئەگەر بەقسەم نەکەیت ئەو ئەتخەمە ژوورەکەی خۆت و ئەبێت بنویت) (هەڵسە بچۆ بنو چونکە وا دیارە تۆ ئاقڵ نیت) بۆ ئەوەی منداڵەکە ئەم خوە (نوستن) نەبەستێتەوە بەسزادانەوە.

2. هەر لەسەر ڕۆشنیایی خاڵی یەکەم، باشتر وایە کارێکی وا بکەیت کە نوستن و چونە سەرجێگا ببێت بەخویەکی خۆش و منداڵەکە خۆی بەشداری ئەم خوە خۆشە بکات، بۆ ئەمەش منداڵەکە بچێت خۆی بشوات و هەندێك یاری بکات لەناو ئاوەکەدا و خۆی ئامادە بکات بۆ ئەوەی حکایەتی بۆ بخوێنرێتەوە.

3. هیچ پەلە مەکە لەکاتی ئەم یاریە خۆشانەدا و وازی لێبهێنە کە لەئاوەکەدا بێت تاکو تاقەتی ئەچێت و دوای وشککردنەوە بۆی باس بکەیت کە کاتی حکایەت هاتووە وە هەندێك ڕۆتین دروست بکەیت لەکاتی حکایەت خوێندنەوەدا، وەکو ئەوەی کە خۆی حکایەتەکە هەڵبژێرێت و چەند حکایەتی ئەوێت و بۆی باسبکەیت کەی حکایەتەکان تەواو ئەبێت بۆ ئەوەی تووشی حکایەتی زیاتر ئەکات، باشتر وایە گفتوگۆی لەگەڵ بکرێت لەگەڵ بکەیت و ڕێککەویت لەگەڵیدا کە ئەمشە و قەیناکات، بەلاّم تەنها ئەمشەو ، بۆ ئەوەی ئەمە نەکات بەخویەکی هەمیشەیی و فێرببێت ئەمە بەکار بهێنێت کاتێك کە نایەوێت بنوێت.

4. واز لەمنداڵەکە بهێنە کە ڕۆتینی خۆی هەبێت لەکاتی نوستندا، ئەگەر حەزیکرد بە شێوەیەکی تایبەتی پاڵکەوێت یان یاریەکی لەباوەشدا بێت یان پارچە قوماشێکی بەدەمەوە بێت یان پەنجەی خۆی بمژێت ئەوا گوێی مەدەرێ و گرنگی بەم شتانە مەدەو هەوڵبدە کە لەکاتی حکایەتەکەدا بەینتان ڕێك بێت، ئەم خوانە شتێکی کاتیەو ماوەیەکی تر نامێنێت.

5. منداڵ چەند پێویستی بەخەوە ئەگۆڕێت لەمنداڵێکەوە بۆ منداڵێکی تر سێ ساڵانێك بەلای کەمەوە پێویستی بەدە کاژێر خەو هەیە، بەڵام منداڵی وا هەیە لەمە کەمتری پێویستە، لەبەرئەمە ڕاست نیە کە زۆر لەمنداڵەکەت بکەیت کە هەر سەر لەئێوارە بچێت بنوێت لەکاتێکدا کە خەوی نایەت و نایەوێت بنوێت، ئەمە جاری واهەیە کەوا لەمنداڵەکە ئەکات کە بیانوی درۆ بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی بێتە دەرەوە یان لەژورەکەیدا هەر بەخەبەری بمێنێتەوە و بترسێت.

6. ژورێکی ڕووناك کە یاریەکانی منداڵەکەی تێدا بێت باشترە لە ژوورێکی تاریك کە منداڵەکە تێیدا بترسێت، ئەم یاریانە یارمەتی منداڵەکە ئەدەن لەکاتی حکایەتەکەدا کە خەیاڵی منداڵەکە ئەوەندەی تر فراوان بکات و ئەم یاریانە ببەستێتەوە بەحیکایەتەکەوە، هەندێك دایکوباوك بڕوایان وایە کە ژوورێکی تاریك یارمەتی منداڵکە ئەدات کە زووتر بنوێت، بەڵام ئەمە ڕاست نیە و باشترە کە منداڵەکە پاڵکەوێت و سەیری وێنە و یاریەکانی بکات وەك لەوەی لەتاریکیدا ترسی لێبنیشێت.

7. منداڵ پێویستە هەموو شەوێك لەهەمانکاتدا بچێت بنوێت، بەڵام هەندێکجار پێویستە دایکوباوك نەرم بن لەمبارەیەوە و کاتێك کە منداڵەکە زۆر سەری قاڵە بەیاریەکەوە یان هەر هۆیەکی تر بۆی هەبێت نەختێکی تر بەخەبەر بێت، بەڵام بەبێ ئەوەی بۆی باسبکرێت کە ئەم شەو دواکەوتووە لە چوونەسەر جێگا و کاتی نوستنی بەسەرچووە، چونکە ئەمە وا لێئەکات کەشەوانی تریش هەمان بیان و بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی زیاتر بەخەبەر بێت هەروەها باسی ئەو شەوانەی بۆ مەکە کە بۆی هەیە زیاتر بەخەبەر بێت وەکو شەوانی خۆش و تایبەتی، لەبەرئەوەی وانەزانێت کەشەوانی تر ناخۆشن و ئەم شەوانە خۆشن.

## پرسیاری 12

## منداڵەکەمان تەمەنی 2 ساڵەو هەتاکو ئێستاش ئەترسێت لەخەڵکی و هەر میوانێکمان دێت ئەو دەست ئەکات بەزریکاندن، چیبکەین؟ چارمان چیە.

منداڵ بەقۆناغی یەك لەدوای یەکدا ئەڕوات لەژیانیدا، لەقۆناغی یەکەمدا کە قۆناغی منداڵی ساوایە منداڵ فێرئەبێت کەخۆی بناسێت و خۆی لەدایکی جیابکاتەوە و بزانێت کە ئەمیش مرۆڤێکە و خۆی جیا بکاتەوە لەخەڵکی، لەهەمانکاتدا منداڵەکە ئەزانێت کە بەبێ دایکی ناتوانێت بژی و پێویستی بە دایکی هەیە و فێرئەبێت کە پەیوەندی بە دایکیەوە ناتوانێت ببەستێت و وردە وردە پەیوەندی بە ئەندامانی تری خێزانەکەوە ئەبەستێت و هەرکەسێك لە دەرەوەی خێزانەکە بێت و هەتاکو ئێستا منداڵەکە پەیوەندی پێوە نەکردبێت ئەوا بە بێگانە ئەژمێردێت و منداڵەکە لێی ئەترسێت و ئەترسێت لەوەی ئەگەر لە دایکی دورکەوێتەوە ئەوە لەکیسی ئەچێت و ئەترسێت دایکی بەجێ بهێڵێت، جابۆیە میوانێکی تازە کە دێتەماڵەکە ئەو جارێ پەیوەندی لەگەڵ پەیدا نەکردووە و نایەوێت بچێتەلای، باشتر وایە بۆ ئەو کەسانەی کە جارێ پەیوەندیان بەمنداڵەکەوە نیە خۆیان نەختێك دوورە پەرێز بگرن و هەر لەچاوپێکەوتنی یەکەمەوە پەلاماری منداڵەکە نەدەن لەبەرئەوەی خۆشیان ئەوێت بەڵکو هەندێك

چاوەڕوان بکەن تاکو منداڵەکە خۆی ڕائەهێنێت بەڕووی ئەو کەسە و خۆی ئەیەوێت بێت بۆلای، ئەوسا ئەبینن کە منداڵەکە خۆی هەوڵئەدات کەبێت بۆلای و دەستی بۆ درێژ ئەکات و لەپاش نەختێك ئەبینیت کە باوەشی میوانەکە پڕئەکات لەشتومەك و ئەیەوێت بچێتە باوەشیەوە، لێرەدا نابێت ئەوەمان لەبیربچێت کە چۆن دایکوباوك لەمکاتەدا ڕەفتار ئەکەن، هیچ شکی تێدلا نیە کە دایکوباوك شانازی بەمنداڵەکەیانەوە ئەکەن و لەهەمووکات و شوێنێکدا ئەیانەوێت منداڵەکەیان بەخەڵکی بناسێنن و هەر کەیەکێکیان بینی ئیتر منداڵەکە ئەگرنە باوەش وەکو ئەوەی بیانەوێت بەو کەسە بڵێن سەیرکە چیمان دروستکردووە، ئەم ڕەفتارە شتێکی ئاساییە و هەموو دایکوباوکێك ئەیەوێت کە خەڵکی تریش بەشداری ئەم خۆشیەیان بکەن، باشتر وایە دایکوباوك ئەم ڕاستیە بزانن و ئاگایان لەوە بێت کە منداڵەکەیان ئەم میوانە ناناسێت و ئاگای لەم شانازییەی ئەمان نیە و بەلایەوە گرنگ نیە.

**پرسیاری** 13

**منداڵەکەم هەشت ساڵانە و هەتاکو ئێستاش هەر پەڕۆ ئەخاتە دەمیەوە، جارانیش هەروای ئەکرد بەڵام قسەمان نەئەکرد لەبەرئەوەی منداڵ بوو، ئێستا پێی ئەڵێین کەچی سوودی نیە، چارمان چیە؟ من زۆر بەشتێکی ناشیرینی ئەزانم و حەزناکەم کە گەورەبوو هاوڕێکانی گاڵتەی پێبکەن.**

زۆ منداڵ هەن کە خو بەیاریەك یان پارچە پەڕۆیەکەوە ئەگرن و تا ماوەیەکی زۆریش ناتوانن وازی لێبهێنن و هەمیشە بۆنی پێوە ئەکەن، ئەم شتە وەکو (شتێکی گواستنەوەیە) لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر، ئەگەر منداڵەکە لەژیانی ڕۆژانەی خۆیدا هیچ گرفتێکی تری نەبێت و بە ئاسودەیی بژی لەگەڵ دەوروبەردا و کەسایەتیەکی سەربەخۆی هەبێت لەم حاڵەتەدا پێویست بەوە ناکات کە دایکوباوك سەغڵەت بن، گرنگ ئەوەیە کە ئەم ڕەفتارە شتێکی سەرەکی نەبێت و منداڵەکە ناچار نەکات کە ژیانی خۆی بگۆڕێت بەشێوەیەك کە نەگونجێت لەگەڵ ژیانی ئاسایی منداڵەکە و ڕێگای پێشکەوتنی لێنەگرتبێت.

**پرسیاری** 14

**کچەکەمان تەمەنی دە ساڵە و هەرچی هاوڕێکانی پێی ئەڵێن ئەو ئەیکات، هەرچەندە خۆشی حەزنەکات، ئێمە پێمان وتووە کە پێویست نیە هەرچیەکیان پێوت ئەو بیکات بەڵام سوودی نیە چیبکەین؟**

منداڵانی ئەم تەمەنە، زۆرجار هاوڕێی تایبەتی هەڵئەبژێرن کە بەباشترین هاوڕێ ناو ئەبرێت، ئەم پەیوەندیە بەتایبەتی بۆ کچان زۆر بەهێزە و بەجارێك دەست ئەگرێت بەسەر ژیانی منداڵەکەدا، بۆ کوڕان هەندێك جیاوازە و ئەمان هاوڕێی جیاوازیان هەیە لەگەڵ ئەمەیان فوتبۆڵێن ئەکەن و لەگەڵ ئەویتریان ڕەسم ئەگۆڕنەوە و بەم شێوەیە، جۆری هاوڕێیەتیان ئەگۆڕێت، منداڵەکەتان لەوانەیە حەز بەناخۆشی نەکات لەگەڵ هاوڕێکانیدا و نەیەوێت تووشی

ئاژاوە ببێت لەگەڵیان، یان زەحمەت بێت بۆی کە هاوڕێی تر پەیدا بکات و نایەوێت کە ئەم هاوڕێیەی لەدەست بچێت، یارمەتی ئێوە بۆی ئەوەیە کە یارمەتی بدەن کە هاوڕێی تر پەیدا بکات و زۆری لێنەکەن کەواز لەم هاوڕێیە بهێنێت، چونکە ئەمە ئەوەندەی تر کارەکە سەختتر ئەکات و وای لێئەکات کە زیاتر خو بگرێت بەم هاوڕێیەوە.

**پرسیاری 15**

**زۆرجار گوێمان لەخەڵکیە کە ئەڵێت وابکە باشە بۆ منداڵەکەت، کەچی هەرگیز گوێم لێنەبووە کە یەکێك بڵێت وامەکە بۆ منداڵەکەت خراپە، پرسیارەکەم ئەوەیە کە مرۆڤ چی نەکات باشە لە پەروەردەی منداڵدا؟**

## پێویستە چی نەکەیت کاتێك ئەتەوێت ڕاستی نیشانی منداڵەکەت بدەیت؟

سزادانی گیانی و ڕۆحی ئەبێت سنوری وای بۆ دابنرێت کە بەدەگمەن بەکار بهێنرێت یاخود هەربەکار نەهێنرێت چونکە هەندێك منداڵ ئەوەندەی تر ڕقگیرتر ئەبن تاکو زیاتر سزابدرێن، ئەم منداڵانە ئەم سزادانە بەملململانێیەك ئەزانن و ئەترسن ئەو کەسایەتیە بەهێزەی هەیانە لەدەستیان بچێت، لەبەرئەوە ناچار ئەبن کە پارێزگاری لێبکەن، هەروەها ئەم منداڵانە ڕادێن لەسەر ئەو جۆرەی پەروەردەیە و ئیتر بەلایانەوە گرنگ نابێت کە گەورەکان چۆن بیرئەکەنەوە و چیان ئەوێت، کە ئەمە وائە گەورەکان ئەکات بیر لەوەبکەنەوە کە زیاتر سزادان بەکار بهێنن بۆ ئەوەی بگەنە ئامانجی خۆیان ، ئەم سزادانە زۆر زەرەروزیانی گەورەی هەیە بەتایبەتی بۆ منداڵانی بێهێز کە وا ئەزانن کە ئەمان بۆیان نیە خۆیان بڕیاری خۆیان بدەن و بەکەمی سەیری خۆیان ئەکەن، کەواتە مرۆڤ ئەبێت زۆر وریا بێت لە بەکارهێنانی هەموو جۆرە سزادانێك.

منداڵ لەخێزانێکدا فێری ڕاست و چەوت ئەبێت کە خۆشەویستی هەبێت لەنێوان ئەندامەکانیدا و گەورەکان نمونەیەکی ڕاست بن بۆ منداڵەکانیان و کاتی تایبەتی تەرخان بکەن بۆ گوێگرتن و ڕوونکردنەوەی ڕووداوەکان بۆ منداڵەکانیان تاکو ئەوانیش هەست بکەن کە ڕێزیان ئەگیرێت و بەدادپەروەرانە ڕەفتاریان لەگەڵ ئەکرێت و بۆیان ڕوونئەکرێتەوە کە بۆچی ئەبێت وابکەن و بۆچی ئەبێت وانەکەن، بۆ ئەوەی بگەینە ئەم پەروەردەکردنە ڕاستیە پێویستە دایکوباوك ئەم ڕاستیانەی خوارەوە بگرنە پێش چاو و لەیادی نەکەن:

1. لە هەڕەشەی درۆ دوورکەوەرەوە: هەڕەشەکردنی درۆ (ئەگەر وانەکەیت دوایی وات لێئەکەم) هەر زوو لەلای منداڵەکە کاریگەری نامێنێت و منداڵەکە گاڵتەی پێ دێت و ئەزانێت کە تۆ بەڕاستت نیە، جا باشتر وایە کە لەم جۆرە هەڕەشانە دوورکەویتەوە و ئەگەر هەر ناچاریش بویت کە هەڕەشە بکەیت هەوڵ بدە هەڕەشەیەکی گونجاو بێت کەتۆ بتوانیت بەجێی بهێنیت.

2. هەرگیز مەڵێ کەتۆ ئیتر ئەوت خۆش ناوێت: لەوە ناخۆشتر نیە بۆ منداڵ کە ببیستێت کە خۆشەویستەکەی ئیتر خۆشی ناوێت، ژیانی ئەم منداڵە بەوەوە بەندە کە ئەزانێت و سەرپشکە لەوەی کە دایکوباوکی ئەمیان خۆش ئەوێت

و ئەمە شکی تێدا نیە، جا قسەیەکی وا کە منداڵەکە چاوەڕێی ناکات ئەبێت بەغەمێکی زۆر بۆی، وتنی ئەوەی دایە و بابە تۆیان خۆش ئەوێت هەرچیەك ڕوویدات، بەردێکی گرنگی بناغەی ئارامی دەروونی منداڵەکەیە و ئەبێت بۆ منداڵەکە بسەلمێندرێت و منداڵەکە بیبیستێت لە دایکوباوکی.

3. سزای منداڵەکەت مەدە بەوەی ڕق لەدڵی خۆتدا بهێڵێتەوە بۆ دوایی: هەر کە ڕووداوەکە تەواو بوو پێویستە تۆ خۆت ئاسایی بکەیتەوە وەکو ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت، کە منداڵەکەت دەستی کرد بەگریان هەڵی بگریت و لەباوەشی بکەیت و ماچی بکەیت وە پێی بڵێیت کە ئیتر تەواو، توڕە بونەکەی من پەیوەندی نیە بەخۆشەویستی تۆوە و من تۆم هەرخۆش ئەوێت هەرچیەك ڕوویدات، ئەگەر دایکوباوك هەربە توڕەیی بمێننەوە بۆ ماوەیەکی زۆر دوای ئەوەی کە منداڵەکە کارێکی خراپی کرد، ئەمە ناخۆشترین کاتی منداڵەکەیە و منداڵەکە هەوڵ ئەدات کە بەزوترین کات ئاشت ببنەوە و بارودۆخی خێزانەکە وەکو خۆی لێبێتەوە و زۆر هەوڵ ئەدات بۆ ئەمە، چونکە خۆشەویستی دایکوباوکی ئەمەندە گرنگە کە ئەو ناتوانێت بەبێ ئەوە بژی.

4. زۆربڵێی مەکە لەگەڵ منداڵەکەتدا: هەندێك کەس وا ئەزانن کە زۆرجاریان بەمنداڵەکەیان وتووە کە شتێك بکات ئیتر ناچاری ئەکەن کە بیکات، ئەمە زۆر زەحمەتە کە هەموو جارێك ڕاست دەرچێت، کاتێك کە منداڵ بڕیاری خۆیدا کە کارێك نەکات ئەوە ئیتر بەچەند جارێکیش زەحمەتە بیکات، باشتر وایە کە هەوڵ بدەیت لەهۆی ئەمە بگەیت، لەوانەیە چاوەڕوانی تۆبۆ منداڵەکەت لەم کاتەدا زۆرتر بێت لەوەی ئەم منداڵە بتوانێت بیباتەسەر، لەوانەیە ئەم داوایەی تۆ بۆ منداڵەکە نەکرێت و ناگونجێت لەگەڵ تەمەنیدا، ئایا منداڵەکە ئەزانێت کە منداڵێکی تر هەیە ئەمە ناکات و ئەمیش ئەیەوێت وەکو ئەو بکات؟ ئایا تۆ سووری لەسەر ئەوەی کە ئەمکارە بکات و بەدەنگێکی وا پێی ئەڵێیت کە ئەو بەڕاستی لەم مەبەستە تێئەگات؟ ئایا ئەزانێت بۆچی ئەبێت ئەم کارە بکات؟ ئایا ئەزانێت سوودی کردنی ئەم کارە چیە؟ ئایا کەسانێکی تر هەن وەکو مام و باپیر و نەنك کەوا لە منداڵەکە بکەن کەوا بکات؟ ئەگەر ئەمانە هیچی نەبوو ئەوە باشتر وایە بزانیت کە تۆ چ شێوەیەك ئەو شتە بەمنداڵەکەت ئەڵێیت، چونکە ئاسانترە بۆ منداڵ کە بزانێت کە بۆی هەیە شتێك بکات وەك لەوەی کە شتێك نەکات، باشترە بڵێیت (بەدەنگی نزم گۆرانی بڵێ وەك لەوەی بڵێیت بەدەنگی بەرز گۆرانی مەڵێ)، (زوو وەرە لەجیاتی دوامەکەوە).

6. منداڵەکەت مەترسێنە: هەندێکجار دایکوباوك منداڵەکەیان ئەترسێنن بەنیازی ئەوەی کە بەگوێیان بکات، جاری وا هەیە ئەڵێن (ئەگەر بەقسەیان نەکات قەد گەورە نابێت) یان (ئەگەر نەنوێت ئەوا دکتۆر دێت و شرینقەت لێئەدات) منداڵ خۆی لە توڕەبونەکەی تۆر ئەترسێت و تۆش ئەوەندەی تر ئەیترسێنێت، ئەمە پێویست بەوە ناکات کە بڵێین چەند زەرەری هەیە بۆی.

7. دوورکەوەرە لەقیژاندن: بەدەنگێکی پڕ لەبڕواوە بەمنداڵەکەت بڵێ کە چی بکات یان نەیکات بەبێ ئەوەی بقیژێنیت بەسەریدا، هەموو دایکوباوك و مامۆستایەك کە ئەزانن چۆن هەڵسوکەوتی منداڵ ئەتوانرێت ڕێکوپێك بخرێت بەبێ ئەوەی زۆر بەکاربهێنن ئەم ڕاستیە باش ئەزانن و بەچاپوکی بەکاری ئەهێنن و منداڵانیش بەقسەیان ئەکەن، ئەمانە ئەزانن چۆن دەنگی خۆیان بەکار ئەهێنن بۆ ئەوەی منداڵەکان بەقسەیان بکەن، ئەمە پەیوەندی نیە بەوەی کێ زیاتر ئەقیژێنێت وکێ دەنگی بەرزترە، ئەو دایکوباوك و مامۆستایەی کە هەر ئەقیژێنن بەسەر

منداڵەکانیاندا وا لەمنداڵەکان ئەکەن کە ئەوانیش فێربن بەهەمان شێوە بقیژێنن، باشتر وایە کە پێشانی بدەیت بە دەنگێکی بڕوا بەخۆبوو کەتۆ بڕیار ئەدەیت وەك لەوەی دەریخەیت کە تۆ کۆنترۆڵت بەسەر بارودۆخەکەدا نەماوە و چارت نیە بۆیە توڕە ئەبێت.

8. داوای لێبوردن بکە: کاتی توڕەبوون مرۆڤ شتی وا ئەکات وا ئەڵێت کە لەبارودۆخی ئاساییدا نایکات و نایڵێت، لەبەرئەوەیە زۆرجار دایکوباوك ئەڵێن کە (نەمزانی تۆ وا توڕە ئەبیت) (من نەمویست ئازارت بدەم) و ئەڵێن کە (ئاخر تۆمنت وا توڕەکرد) باشتر وایە لەمکاتەدا داوای لێبوردن لەمنداڵەکەیان بکەن، ئەمە لەلایەك بە منداڵەکە ئەگەیێنێت کە ناخۆشیەکە تەواو، لەلایەکی ترەوە بەمنداڵەکە ئەڵێت کە هەر تەنها ئەو هەڵە ناکات بگرە گەورەکانیش هەڵەئەکەن و هیچ شەرمی تێدانیە کە هەڵەتکرد داوای لێبوردن بکەیت بەبێ ئەوەی گوناهەکە بخەیتەسەر ئەو (ئاخر تۆ من وا توڕەکرد) کە ئەمەیان ئەنجامێکی خراپی هەیە و ئەبێت بەهۆی ئازاردانی هەستی منداڵەکە بەبێ ئەوەی منداڵەکە لەوە بگات کەتۆ بۆچی توڕەبویت و ئەمەش پەیوەندی بەینی منداڵ و دایکوباوك بۆ هەموو دواڕۆژیش خراپ ئەکات.

9. بەراوردی منداڵەکەت مەکە لەگەڵ منداڵی خەڵکیدا: بەراوردکردنی منداڵەکەت لەگەڵ منداڵی خەڵکی تردا کارێکی دادپەروەرانە نیە، منداڵەکەت خۆی خۆیەتی و پێویستە وای لێبکەیت کە خۆی خۆشوبێت لەجیاتی ئەووەی وای لێبکەیت کە خۆی خۆشبوێت لەجیاتی ئەوەی وای لێبکەیت کە ڕقی لەو کەسانە بێتەوە کە تۆ بەراوردییان ئەکەیت لەگەڵیدا، کاتێك کە تۆ ئەڵێیت (سەیرکە شیلان چەند ئاقڵە، بەقەدەر تۆشە و درۆش ناکات) ئەمە ڕاست نیە و شیلانیش منداڵێکە کە درۆ ئەکات وەکو هەموو منداڵانی تر، جا بۆ چی ئەم منداڵە بکەین بەپەری و فریشتە لەمنداڵەکەی خۆمان و وای لێبکەین کە شەرم لەخۆی بکات، هەر منداڵەی توانای تایبەتی خۆی هەیە و پێویست ناکات بەراوردی بکەین لەگەڵ منداڵێکی تردا، منداڵەکەت پێویستی بەوە هەیە خۆی بناسێت و بزانێت چەند لەباردایە نەك فلان منداڵ چەند ئەزانێت یان نازانێت، منداڵەکەت تاقانەیە و لەکەس ناچێت.

10. بیر لەسەرەنجامی کارەکەت بکەرەوە: بزانە سزادانەکەت چ کارێك ئەکاتەسەر منداڵەکەت، زۆر جار سزادانەکە سەر لەمنداڵەکەت ئەشێوێنێت لەجیاتی ئەوەی تێی بگەیێنێت کە بۆچی ئەبوایە وای بکردایە و بۆچی وای نەکردایە، بۆ نموونە: بابڵێین منداڵەکەت ڕایکردەسەر شەقامەکەو تۆش لە ترسی ئەوەی نەبێت بەژێر ئوتومبیلێکەوە هاوارت کرد کە بەگەڕێتەوە دواوە، کاتێك کە منداڵەکەت گەڕایەوە دواوە بۆلای تۆ توند قۆڵێت گرت و لێی توڕەبویت کە بۆچی ڕایکردە سەر جادەکە، لەجیاتی ئەوەی ستایشی بکەیت و ماچی بکەیت کە ئەو بەقسەی تۆی کردووە و هاتۆتەوە بۆ لات و دوایی کە ترسی خۆشت و منداڵەکەش دامرکایەوە ئەوسا باسی کارەساتەکەی بۆ بکەیت و پێی بڵێیت کە تۆ چەند ترسای لەوەی ئەو شتێکی لێ بێت چونکە تۆ ئەوت خۆش ئەوێت و حەزناکەیت هیچی لێبێت.

هەندێك دایکوباوك ئەڵێن (من هەرچی ئەڵێم منداڵەکەم بەقسەم ناکات) ئەم دایکوباوکانە پێویستە ئەوە بزانن کە هۆی سەرەکی ئەمە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم خاڵە، چونکە ئەو منداڵەی کە زۆرجار و هەمیشە پێی بوترێتەوە کە چیبکات یان نەیکات بەبێ ئەوەی هیچ ڕوویدات و تەنها زۆر بڵێیی لەگەڵ بکرێت و هەڵەی وای لەگەڵ بکرێت کەسەری لێبشێوێنێت ناچار ئەبێت کە خۆی بپارێزێت لەمجۆرە قسانە و ڕێگایەك بدۆزێتەوە بۆ خۆپاراستن لە هەڵەی دایکوباوك

هەندێکجار منداڵەکەت بەقسەت ئەکات، بەڵام زۆرجار منداڵەکەت خۆی ئەپارێزێت لەقسەکانت و لێت ئەشارێتەوە کە خەریکی چییە و درۆت بۆ ئەکات، کاتێك کە تۆش درۆ ئەکەیت بۆ دەرکەوت ئەوەندەی تر تورە ئەبێت و بەدرۆزن تاوانباری ئەکات، لەکاتێکدا ئەمەی ئەم ئەیکات هەر بەتەنها بۆ ئەوەیە کە خۆی بپارێزێت لەتوورەبوونە نارەواکەی تۆ (کە ئەمە نەك تەنها منداڵ بگرە گەورەش ئەیکات بۆ خۆ پاراستن و خۆ دورخستنەوە لەسزای ناخۆش و ئەمە شتێکی مرۆڤانە و ئاساییە) کاتێك پێتزانی بۆی راست ئەکەیتەوە و پێی ئەڵێت چی بکات و چی نەکات، کاتێك دانی بەهەڵەیەکدانا تۆ لێی تورە ئەبیت، کاتێك کە بەقسەی کردیت تۆ هەر تورە ئەبیت و چاوی لێسوورئەکەیتەوە کاتێك داوای لێبوردنی کرد تۆ هەر بەتورەیی ئەمێنیتەوە، ئیتر ئەبێت لێرەدا راوەستین و بپرسین کێ لەکێ ناگات.

لەبەرئەوە باشتر وایە کە پیاو بیر لەرەفتاری خۆی بکاتەوە و پێش ئەوەی بەناهەق بریارێك بدات کە ئەنجامی باش نەبێت، ئەگەر بینیت کە منداڵەکەت هەوڵئەدات ئەوەی ئەیکات بیشارێتەوە ئەوە لەوانەیە لەبەرئەوە بێت کە نەختێك بەپەلە و بەتوندی سزای وەرگرتبێت لەوەوپێش، کاتێك نایەوێت دان بەهەڵەکانیدا بنێت لەبەرئەوە بێت کە لەوەوپێش سزای درابێت لەجیاتی ئەوەی پاداشتی درابێتەوە.

کاتێك کەبانگی ئەکەیت و نایەت، لەوانەیە ئەمە ببەستێت بەوەی کە زۆرجار هاتووە و بەقسەی کردوویت لەجیاتی سوپاس تورەبوونی چێشتووە و نایەوێت خۆی توشی ئەو ناخۆشیە بکاتەوە.

لەوانەیە ئەمانە شتی بچوکی رۆژانە بن بەلای تۆوە نەك بەلای منداڵەکەوە، کاتێك کە منداڵەکەت یاری ئەکات و سەری قاڵە، تۆ بانگی ئەکەیت کە بچێت بنوێت، یاخود بچێت خۆی بشوات، یاخود بچێت ئاگای لە برا بچکۆلەکەی بێت، بەمانایەکی تر ئیتر یاری نەکات، ئەمەش بۆ ئەو ناخۆشە و نایەوێت گوێی لێبێت.

ئەگەر منداڵێك بەگوێکردنی بەستەوە بەکارەساتی ناخۆشەوە نەك بە پاداشت و ستایشەوە ئەوا شکی تێدا نیە کە لە پاشەرۆژیشدا ئەوە ناکات کە داوای لێئەکرێت.

ئەگەر منداڵەکەت فێربکەیت کە بەگوێکردن و دان بە هەڵەدانان ببەستێت بە پاداشت و ستایشەوە ئەوا پێویست نیە سزا بەکاربهێنیت بۆ ئەوەی بەگوێت بکات.

## پرسیاری 16

## منداڵێکمان هەیە کە هەرگیز بەقسەی دایکی ناکات، بەڵام لەگەڵ مندا هیچ گیروگرفتێکمان نیە، چارەمان چیەو ئەم منداڵە بۆ وای لێهاتووە؟

منداڵ ئاوێنەیەکی تەواوی خێزانە، ئەگەر ئەم راستیەمان زانی ئیتر ناتوانین بەراوردی منداڵی خێزانێك لەگەڵ منداڵێکی تردا بکەین، منداڵ هار نیە منداڵ هار ئەکرێت، بێحەیایی ناکات، منداڵ ئەو وزەیەی تێیدایە بەشێوەی جیاواز دەری ئەبرێت بەپێی ئەو ئیمکانیەتەی بۆی ئەخرێتەبەر دەستی، ئەگەر ئەم راستیەمان زانی ئەوا زیاتر لەمنداڵەکەمان ئەکەین.

ئەو وزەیەی لە منداڵدایە ئەمەندە زۆرە کە زۆرجار دایکوباوك سەریان لەتوانای منداڵەکە سوڕ ئەمێنێت کە چۆن ئەتوانێت ئەوەندە یاری بکات، ئەگەر خێزان بارودۆخێکی وا نەڕەخسێنێت بۆ منداڵەکە کە جێگای یاری بەکەڵکیشی تێدا بێت، ئەوا یاریەکە ئەبێت بە ئاژاوە، ئەم ڕەخساندنە پەیوەندی هەیە بەهەموو پەروەردەکردنی منداڵەوە هەر لەوکاتەی لەدایك ئەبێت، منداڵێك ئەگەر پێویستیەکانی لەشیرخواردن و نوستن بەشێوەیەکی زانستی بۆ جێبەجێ نەکرێت منداڵێك دەرئەچێت کە ئێمە پێی ئەڵێین منداڵی هار.

منداڵێك ئەگەر سنوری تەواوی بۆ دانرێت، منداڵێك کە هەربە تووڕەبوون و چاو مۆڕکۆردنەوە پەروەردە بکرێت منداڵێك کە دەستی نەگاتە قەڵەم و کاغەز و قوڕی یاری و مقەسیت و چەکوش و بزمار و جل و مۆسیقا و گۆرانی و حکایەت و قسە لەگەڵ کردن و فێرنەکرێت و بۆی ڕووننەکرێتەوە کەبۆچی ئەبێت وابکات و بۆچی ئەبێت وانەکات منداڵێکی هاری لێ دەرئەچێت، بەمانایەکی تر هەموو ئەو باسانەی لەپەڕتوکەکەدا هەن و زۆریتریش کار ئەکەنەسەر هەڵسوکەوتی منداڵ.

منداڵ زیرەکە لەتاقیکردنەوەی گەورەکاندا، کە ئەم تاقیکردنەوەیە لەژیانی هەمووماندا هەتاکو ئەمرین هەر هەیە و شتێکی مرۆڤایەتیە، لەهەڵسوکەتماندا لەگەڵ یەکتریدا هەموو کات هەوڵ ئەدەین کەرێزی ئەوانەی دەوروبەرمان بەدەست بهێنین بۆ ئەمەش زۆر ڕێگا تاقیئەکەینەوە و خۆمان لەزۆر شت ئەپارێزین، جا ئەم هەوڵەمان بەزۆر شێوە خۆی ئەنوێنێت، هەندێك بەکاری چاك، هەندێك بەجل و بەرگی جوان، هەندێك بەتووڕەبوون و پۆزلێدان، هەندێك بەکاری باش و هەتا دوایی لەم جۆرە کەسایەتیانە کە هەن لەدەوروپشتمان، کە ئەمەش لەو پەروەردەیە هاتووە کە هەریەکەمان وەریگرتووە لەژیانیدا.

لەکاتێکدا خەریکی ئەم نوسینە بووم بۆ سیپانی کوڕم باسکرد کە من خەریکم باسی هاری ئەنوسم، وە پرسیارم لێکرد کە منداڵ بۆچی هاری ئەکات؟ ووتی (نازانم، کاتێك کەمنداڵێك شتێك ئەبات لەبەرئەوەی پارەی نییە، ئەوە ئیتر ئەویتریان تووڕە ئەبێت، ئەگەر دەستی نەکەوێت ئەوا ئەیدزێت، چونکە خۆی پارەی نییە).

ئەم پرسیارکردنە خۆی جۆرێکە لەپەروەردە و بەمە منداڵەکە تێئەگات کە باوکی بیر لەچی ئەکاتەوە و چی پێخۆشە و چی پێناخۆشە، کەواتە ناتوانین دەست بۆ خاڵێکی تایبەتی ڕابکێشین کە بۆچی منداڵێك لەمنداڵێکی تر هارترە.

بۆ یارمەتیدانی منداڵێك کە ئاژاوەیەکی ناوخۆیی لەمێشك و دەروونیدا هەیە پێویستمان بەهارمۆنیەکی دەرەوەیی هەیە لەدەوروپشتی منداڵەکە، پێویستمان بەدانانی ڕۆتینێکی ڕۆژانە هەیە کە دووبارەی بکاتەوە بۆ ماوەیەکی زۆر هەتاکو ئەو منداڵە خۆی ئەدۆزێتەوە لەناو ئەو ئاژاوە مێشکیەی کە هەیەتی، ئەمە پێویستی بەکات و توانایی و پسپۆڕی هەیە، پێویستی بە لێزانین هەیە، بەلاّم ئەوەی لەسەرچاوەوە کار بکەین ئەبێت بگەڕێینەوە بۆ خێزان و بارودۆخی خێزانەکە شیبکەینەوە و لەوێوە یارمەتی منداڵەکە بدەین.

ئەوەندەی پەیوەندی بەخێزانی پەناهەندەوە هەیە لەم بارەیەوە پێویستە دەست بۆ هەندێك واقعی تازە ڕابکێشین لەمانە:

1. ڕۆڵی تازەی باوك لەم ژیانە تازەیەدا:

هەموومان ئەزانین کە باوك لە وڵاتی خۆمان ئەوەندە لەنزیکەوە خێزانی نەئەبینی و زۆر ئاگاداری هەڵسوکەوتی منداڵ نەبوو وەکو ئێستا کە زۆربەی کات ناچار ئەبێت کە بەشداری ژیانی ڕۆژانەی خێزانەکەی بکات و زیاتر ئاگای لە هەڵسوکەوتی خێزانەکەی هەیە، ئەم ڕۆڵە تازەیەی پیاو وای لێئەکات کە زۆرجار دەست بخاتە کاری گەورە و بچوکی خێزانەکەوە و زۆرجار هەر بەتەنهاش ئەو ڕۆڵە ببینێت کە زۆرجار وا ئەکات کە خۆشی تووشی ناخۆشی بێت و لەگەڵ خێزاندا گرفت دروست بکات، جا ئەگەر باوك هەوڵ نەدات ئەم زانیاریە تازەیە بۆ خۆی بەدەست بهێنێت ئەوا سەر ئەنجام لەجیاتی یارمەتی دایك ئەوەندەی تر کارەکە قورستر ئەکات.

2. بوونی منداڵ لەدوو کولتوری جیاوازدا:

کە یەکێکیان کولتوری ماڵەوەیە و خێزان لەسەری ئەڕوات و ئەویتریان کولتوری کۆمەڵی تازەیە کە هەندێکجار دایکوباوك ناتوانن هەزمی بکەن و تێبگەن ئەمە ئەبێت بەهۆی ئەوەی کە منداڵ و خێزان تووشی ناکۆکی دێن کە لەهەمانکاتدا هەردووکیان ڕاست ئەکەن، چونکە هەریەکەیان لەلای خۆیەوە مەسەلەکە ئەبینێت و بەڕاستی ئەزانێت چاری ئەمە تەنها بەوە ئەکرێت کە خێزان هەوڵبدات لە کۆمەڵگای تازە بگات و زیاتر لەمبارەیەوە خۆی فێربکات وە هەوڵبدات کەرەوشتە چاکەکانی کۆمەڵگای تازە بۆ سوودی خۆی بەکاربهێنێت و لەرەوشتە خراپەکانی دوورکەوێتەوە چونکە زۆر کردن لە منداڵ کە خۆی لەکۆمەڵگای تازە دوورخاتەوە و تەنها دەستبگرێت بە بیرو رەفتاری خێزانەوە شتێکی مەحاڵە، بەزۆرکردن لەمنداڵ ئەم کارە سەرناگرێت، تەنها ڕێگایەك بۆ ڕێنیشاندنی منداڵ کە سوودی هەبێت ڕێگای قسەکردن و گفتوگۆیە لەگەڵیدا، ئەو منداڵە لەدوو کولتوری جیاوازدا ئەژی کە قاچێکی لەملایە و قاچەکەی تری لەولاو ئەمە بۆ ئەویش ئاسا نیە.

3. شەڕوشۆڕی منداڵ لەگەڵ یەکتریدا بەشێکە لەژیانی خێزان و شتێکی تەنها نیە بەخێزانەکەی تۆوە.

ئەم ڕەوشتە نەك تەنها لەمرۆڤدا بگرە لەئاژەڵ و مەلیشدا هەیە و هەر ئەمێنێت، هەرکاتێك خێزانێك دروست بوو کە منداڵەکانیان شەڕیان نەکرد بەیەکەوە، شکی تێدا ینە کە کەموکوڕیەك لەو خێزانەدا هەیە کە زۆر سامناکترە لەوەی کە دوو منداڵ شەڕ لەگەڵ یەك بکەن.

4. دەست خستنەناو ناکۆکی نێوان منداڵەکەت لەگەڵ دایکی کارێکی ڕاست نیە:

هەروەها دەستخستنە ناو ناکۆکی نێوان باوك و منداڵەکەوە لەلایەن دایکەکەوە شتێکی ڕاست نیە، ئەم ناکۆکیە پەیوەندی بەو دووانەوە هەیە و ئەبێت خۆیان چارەسەری بکەن و ئەوانیش نابێت کارەکە بەچارەسەر نەکراوی بەجێبهێڵن و هەر لەهەمانکاتدا گفتوگۆی لەسەر بکەن و بگەنە ئەنجامێك، بەبێ گەیشتن بەم ئەنجامە نابێت ئەو دوولایەنە یەکتری بەجێبهێڵن و خۆشیان و منداڵەکەش لەگێژاوی ترس و خەفەتدا بهێڵنەوە، ئەمە خاڵێکی زۆر گرنگە و کارێکی زۆر ئەکاتەسەر پێشکەوتنی هەست و نەست و تەندروستی منداڵەکەت.

**پرسیاری 17**

**کوڕێکی حەوت ساڵی و کچێکی پێنج ساڵانمان هەیە، هەرجارەی شتێك بۆ کوڕەکان ئەکرێن کچەکەش داوای هەمان شت ئەکات، ئێمەش ناچالا ئەبین کەشتێکی بۆ بکڕین و بە هەرشێوەیەك بێت ڕازی بکەین بـۆ ئـەوەی خۆی بەکەم نەزانێت، نازانین ئەمە هەڵەیە یان نا، چیبکەین؟**

## ترسی منداڵ لە تاریکی

لەسەرەتای تەمەنی دوو ساڵیەوە و هەتاکو تەمەنی (10-12) سـاڵیش هەنـدێك منـداڵ هەسـتی ترسـیان هەیـە لەتاریکی، گاڵتە بەم ترسە مەکە، چونکە ئەم ترسە بـۆ منداڵەکـە شـتێکی ڕاسـتە، هەرچـەندە بـەلای تـۆوە ئەمـە ڕاست نەبێت.

بۆ منداڵێك ژیان پڕە لەجادو شتی سەیر، بەلاّم بۆ ئێمە ئەمە وانیە و ئێمە زیاتر لەژیان شارەزاین و بەتاقیکردنـەوە بۆمان دەرکەوتووە کە تاریکی ترسناك نیە، بەلاّم منداڵەکە خۆی بـە بچـوك و نـامۆ ئـەزانێت لەژیانـدا، لەبەرئـەوە گرنگی بدە بەمنداڵەکەت و پێی مەڵێ کە ئەو خۆی منداڵ ئەکاتەوە یان ترسنۆك یان پێی پێبکەنێت و پێی بڵێت کـە ترسەکەی بناغەی راستی نیە و نابێت بترسێت، بیرومێشکی منداڵ پڕە لەخەیالاّت و ئەگەر بـڕولای پێنەکـەیت ئـەوە ئەوەندەی تر سەری لێئەشێوێت، چونکە بۆ ئەو هەستی ترسەکە بەسە بۆ ئەوەی بڕوای پێبکـات، جـا لەشـتی ڕاسـت بترسێت یان خەیالاّوی زۆر لە مەسەلەکە ناگۆڕێت، لەبەرئەوە کاتێك منداڵەکەت ئەترسێت و هەستی بەترسی کردووە پێویستی بەتۆ هەیە و تۆش ئەبێت گوێی لێبگریت و بەڕاستی بزانیـت و یارمـەتی بـدەیت کـە بەسـەر ئـەم ترسـەدا سەرکەوێت، ئەم ترسە، ترسێکە لە شتێك کە منداڵەکە نایزانێت، ترسە لەوەی خۆی شاردۆتەوە لە تاریکیەکەدا لەژێر جێ گاکەدا، لەدوای پەردەکەوە، یان لەودی و پەنجەرەکەوە.

ئەگەر منداڵ لەخێزانێکی ئاساییدا گەورە بوبێت و سەرپشك بێت لـەوەی کـە ئـەتوانێت قسـە لەگـەڵ ئەنـدامانی خێزانەکەدا بکات و بڕوای پێبکەن، ئەوە ئاسانە کە ئەم ترسەی منداڵ کەمبکرێتەوە، لەبەرئـەوە وازی لێبهێنـە بـەو شێوەیەی خۆی ئەیەوێت ترسەکەی دەببڕێت و داوای لێ مەکە ئەبێت پێت بڵێت ئەو شتە چیە کەلێی ئەترسێت ئەگـەر خۆی بۆت باس نەکات، بۆی باس بکە کە زۆربەی زۆری خەڵکی لەمنداڵیدا وەکو ئەو هەستیان بەو ترسە کردووە بەبێ ئەوەی خۆت بخەیتەناو وردەکاری باسەکەوە و ئەوەندەی تر منداڵەکە بترسێنێت، بۆی باس بکەیت کەتۆش لەمنداڵیـدا ئەم هەستەت هەبووە، لەهەمانکاتدا هەوڵ بدە بەیاری کردنەوە هەستی ترسەکەی کەمکەیتەوە.

دوای ئەوە بۆی باس بکە کەچۆن خانووەکە و ژوورەکان دا ئەخرێت بەشەو بۆ ئـەوەی شـتێك یـان کەسـێك نەیەتـە ژوورەوە، ئەگەر شتێك یان کەسێك بێتە ژوورەوە ئەوە منداڵەکە ڕاوی ئـەنێت، هـەروەها دوورکـەرەوە لـە حکایـەتی ترسناك لەکاتی نوستنداو داوای لێ بکە کە خۆی حکایـەتێك هەڵبـژێرێت، چـونکە لەوانەیـە کـە کاتێـك تـۆ لـەوێ نامێنێت و ئەچیتە دەرەوە، ئەوسا خەیاڵی منداڵەکە بکەوێتەکار و ئەو شتەی کە لێی ئەترسـێت بێتـە بەرچـاوی بـا

لامپایەکی بچوك لەژوورەکەدا بسوتێت و دەرگاکە نـەختێك بکرێتـەوە و هەوڵبـدە بزانێـت چـی هەیـە لەژوورەکـەدا کەسێبەر و شتی وا دروست ئەکات کە ئەو لێی ئەترسێت و هەوڵبدە لایان بەریت.

هەروەها باسی خەیاڵی بۆ بکە و خەیاڵ چییە؟ بۆی باس بکە کە خەیاڵ یارمەتیمان ئەدات کـەیاری و شـتی خـۆش لەگەڵ خۆمان بکەین، بەڵام خەیاڵ جاری واهەیە کە شتی ناخۆشیش ئەدۆزێتەوە و ئەبێت لەم کاتانەدا هەوڵ بدەین کە بیر لەشتی خۆش بکەینەوە.

بۆ هەندێك منداڵێك لەم تەمەنەداو لەتەمەنی گەورەتریشدا، وا دەرئەکەوێت کـە ئەمـە سـوودی نیـە و منداڵەکـە ترسی کەم نابێتەوە و لەوە ئەچێت کە لەشتێکی نادیار بترسێت لەتاریکیدا، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە ترسـەکە لـەوە زیاترە کە تەنها ترسی تاریکی بێت و بەم شێوەیە پەیوەندی هەبێت بەشـتێك لەژیانیـدا بـەڵام خـۆی نازانێـت چـیە؟ لەمکاتەدا پێویستە زیاتر لەم ترسە بکۆڵرێتەوە و هۆیەکانی دیاری بکرێت، لەوانەیە کە منداڵەکە خـۆی منـداڵێکی هەست ناسك بێت، لەبەرئەوە هەوڵبدە کە بزانیت ژیانی ڕۆژانەی چۆنە، شەڕوشۆڕ هەیە لەماڵەکەدا و ئـەو ئەترسـێت کاتێك دایکوباوك لەیەکتری توڕەئەبن و ئەو ئەترسێت لە لەدەست چوونیان، یاخود لێی تـوڕە ئـەبن، بـۆ منـداڵێکی بچوك گرانە کە وێنەی خۆشەویستی دایکوباوك کۆبکاتەوە لەگـەڵ هەڕەشـە و تووڕەبونـدا و سـەری لێتێکئەچـێت و نازانێت کامیان ڕاستەو بڕوای پێبکات، لەبەرئەوە ناچار ئەبێت کە لەخەیاڵی خۆیدا وێنەی خراپی دایکوباوك ڕاوبنێت و هەوڵ بدات بەسەریدا سەرکەوێت و وێنەی ساحر و جادوگـەر و خێـو و دێـو و درنـج دروسـت بکـات بـۆ ئـەوەی دایکوباوك نەزانن کە ئەم بیر لەخراپی ئەوان ئەکاتەوە.

یاخود لەوانەیە کە ڕقی خۆی بێت کە ئەم منداڵە ئەترسێنێت، لەبەرئەوەی ڕێگای نادرێت کە ڕقـی خـۆی دەربڕێـت چونکە پێی وتراوە کە توڕەبوون ناشیرینە و نابێت توڕە ببێت یان پێی ووتراوە کە منداڵێکی خراپە لەبەرئەوەی جارێك لەجاران تووڕەبووە، یان پێی وتراوە کە ئەمە ڕۆحە ڕەشەکەیەتی کە دێتە دەرەوە کاتێك کەتوڕە ئەبێت، ئـەم هـەموو قسانەو وا لەمنداڵەکە ئەکات کە لەخۆی بترسـێت و هـەرکاتێك ویسـتی تـوڕە ببێـت ئـەم تـوڕە بوونـەی لێ ببێـت بەشتێکی ترسناك و ئەترسێت لەوەی نەتوانێت کۆنترۆڵی خۆی بکات لەبەردەم دایکوباوکی، ئـەوە بـیر لـەم هەسـتانە ئەکاتەوە بەشەو.

بزانە کە ژیانی منداڵەکەت بەندە بەئێوەوە و بەهۆی ئێوەوە ئەو شت فێرئەبێت، ئەگەر هەمووکات گوێی لێبێت کە ئەو کەرە و بێئەقڵە و هارە و ترسنۆکە، ئەوا وای لێدێت کە بڕوا بەخراپی خۆی بکات و لەخۆی بترسـێت و نـەتوانێت چاری ئەمە بکات، بەڵام ئەگەر فێرببێت کەتۆ تێی ئەگەیت و گوێی لێئـەگریت و یارمـەتی ئـەدەیت، ئـەوا ئـەویش فێرئەبێت کە چاری ترسەکەی بکات بەڕێگایەکی ئاقلانە و بزانێت کە ئەمە شتێك نیە کە ژیانی لێ تێکبدات و فێـر ئەبێت کە تووڕەبوون تەنها هەستێکەو هەستێکی خراپیش نیە و منداڵەکە بەوە خراپ نابێت کـە هەسـتێکی خراپـی هەبێت، بەڵکو ئەوەی کە ئەیکەین بە هەستەکانمان و چۆن مامەڵە لەگەڵ هەسـتەکانمان ئەکـەین گرنگـە، چـۆن کـار ئەکەین لەگەڵ ئەم هەستانەدا لە فێربوون و زانستیەوە هاتووە کە دەستمان ئەکەوێت بەزۆر شێوەی جیاواز.

**پرسیاری 18**

**هەرجارێك میوانێکم دێت، منداڵە سێ ساڵەکەمان تووشی بەغیلی ئەبێت و بەتەواوەتی ڕقم هەڵئەسێنێت بۆچی وا ئەکات و چیبکەم؟**

**مــــــــــــــن**

چۆن لەخۆمان و لەخەڵکی ئەگەین کارێکی گەورە ئەکاتە سەر پەیوەندیمان لەگەڵ کەسانی تردا، لەبەرئەوەی هەرکەسە لەچاوی خۆیەوە سەیری خۆی و خەڵکی ئەکات، هەروەها لەوەی چۆن بەرامبەرەکەی ئەیبینێت و تێیئەگات هەروەها کەسێکی تریش وا ڕەفتار ئەکات وەکو خۆی لەخۆی گەیشتووە و وەکو ئەوەی چۆن لەخەڵکی گەیشتووە و چاوەڕوانی چی ئەکات لەخەڵکی.

لەکاتی پەیوەندیەکەدا، پەیوەندیکارەکان یەکتری ئەبینن و ئەبیستن و دەستیان بەریەك ئەکەوێت و یەکتری هەڵئەسەنگێنن، کە واتە لەکاتی پەیوەندیەکەدا زۆر شتی جیاواز فێرئەبن لەبارەی یەکتریەوە و هەق وابوو بەئاسانی لەیەکتری بگەن و یەکتری باش بناسن، بەلاّم بۆچی لەگەڵ ئەمەشدا هەندێکجار ئەم پەیوەندیە دروست نابێت؟ ئەمە لەبەرئەوەیە کە ئێمە یەکتری نابینین وەکو لەڕاستیدا وایە، لەبەرئەوەی لەوانەیە ئێمە هەندێك ڕووی ترمان ئەشارینەوە هەروەها ئەوەی ئێمە تێیئەگەین لەڕاستیدا بریتیە لەوەی کە ئێمە چاوەڕێی ئەکەین کە بیبینین و بیبیستین و ئەوەیە کە خۆمان هەڵیئەبژێرین، هەروەها ئێمە لەخۆمانەوە و بەشێوەیەکی ئۆتوماتیکی هەندێك ڕاوبیر و تایبەتمەندی ئەنوسێنین بەئەو کەسەوە کە وامان لێئەکات کەوایان تێبگەین کە ئێمە ئەمانەوێت، جابا بزانین ئەمە بۆ وای لێهاتووە و بانزیکتر سەیری ووشەی (من) بکەین و بزانین چییە و چی دروست ئەبێت؟

ووشەی (من) وێنەی خۆتە بۆخۆت، هەموو شتێك کەتۆ بتەوێت بینوسێنیت بەخۆتەوە لەووشەی (من) دا کۆئەکەیتەوە، ئەگەر داواتلێکرا کە باسی خۆت بکەیت کەتۆ کێیت؟ ئەوا وەلاّمی تۆ بۆ ئەم پرسیارە ئەوەمان بۆ دەرئەخات کەتۆ کێیت و تۆباسی (من) ی خۆت ئەکەیت، ئەگەر پرسیار لە(ژیلوان) بکەیت کە تۆ کێیت؟ لەوانەیە کەبڵێت (من، کچێکم حەز بە پەیوەندی کۆمەلاّیەتی ئەکەم) کەواتە پەیوەندی کۆمەلاّیەتی لەلای ژیلوان نرخێ ی تایبەتی هەیە و ئەیەوێت بەم بۆنەیەوە خۆی بە خەڵکی بناسێنێت کەواتە (من) لە چی پێکهاتووە؟

وەلاّمی ئەم پرسیارە ئەمەندە ئاسان نییە و ناتوانرێت خەڵکی بخرێتە خانەی جیا جیاوە و ناوی جیاوازیان لێ بنرێت چونکە ئەوەی مرۆڤێك بیری لێئەکاتەوە حەزی لێئەکات شتێکی چڕوپڕە و بەئاسانی ناتوانرێت باسی لێبکرێت، بەلاّم بۆ ئەوەی باسەکەمان ئاسان بکرێت (روسنبری 1979) ئەم باسەی کردووە بەسێ بەشەوە و وتوویەتی کە (من) لەسێ بەش دروست بووە:

1. چۆن تۆ خۆت ئەناسیت و لەخۆت ئەگەیت، بەمانای ئەوەی کە (هەیە).
2. چۆن تۆ حەز ئەکەیت کە وابیت یاخود وا بویتایە (حەزکردن).
3. چۆن خۆت دەرئەخەیت بۆ خەڵکی دەرەوە (دەرەوە).

یەکەمیان: لەمانەی خوارەوە پێکهاتووە:

1. مرۆڤێك سەیری خۆی ئەکات لەبارەی کۆمەڵایەتیەوە: کار، نێر، یان مێ.
2. ناونیشان کە مرۆڤ بەکاری ئەهێنێت: خوێندەوار، نەخوێندەوار، تێگەیشتوو.
3. لەچ گروپێکە....
4. ئەو شتانەی کە هەیەتی : (خانو، ئوتومبیل، پەرتوك،)..........

دووەمیان:

ئەمەیان زۆر شتی تێدایە، لەمانە ئەو هەست و بیرە بەرزەی کە ئەمانەوێت بیگەنێ و حەزمان ئەکرد کە بمانبوایە ئەمانە لەوانیە کەوەکو خەو وابێت و گەیشتن پێی هەندێك زەحمەت بێت، وەکو ئەوەی بتەوێت مرۆڤێکی تەواو بێت یاخود بتەوێت بگەیت بە ئامانجی بەرز، یاخود هەڵسوکەوتێکی تایبەتیت بکردایە لەشوێن و کاتێکی جیاوازد.

سێهەمیان:

بەشی دەرەوەی (من)ە بەمانای ئەو شێوەیەی خۆتی پێدەرئەخەیت بۆ خەڵکی، ئەمە لەهەمو قۆناغەکانی ژیاندا گرنگە، بەڵام لەقۆناغی منداڵی و گەنجیدا زۆرتر دیارە و بەشێکی زۆری (من) داگیر ئەکات، گەنجێك تەنها خەریکی ئەوە نیە کە بزانێت (خۆ)ی کێیە، بەڵکو سەر قاڵیشە بەوەوە کە بزانێت چۆن هەڵسوکەوت ئەکات و چۆن خۆی ئەناسێنێت بەخەڵکی بەو شێوەیەی کە خۆی ژیان ئەبینێت بۆ ئەوەی دانی پێدابنرێت، لەبەرئەمە زۆر رێگا تاقیئەکاتەوە، بۆ نموونە:

(ئەسرین 15 ساڵانە) ئەیەوێت بەهۆی قژبڕینێکی تایبەتیەوە یان جلێکی تایبەتیوە بزانێت (ڕیاکشونی) دەوروبەری چۆنە و ئەو چۆن بکات باشە بۆ ئەوەی قبوڵ بکرێت، بۆیە ئەبینین کە زۆرشێوەی جیا جیا تاقیئەکاتەوە تاکو ئەگاتە ئەو شێوەیەی کە بەباشی ئەزانێت، جا بۆیە ئەڵێن کە لەتەمەنی منداڵ و گەنجیدا ئەمە زیاتر کار ئەکاتەسەریان یاخود (سپیان 15 ساڵانە) هەوڵ ئەدات کە بەهۆی فوتبۆڵێنەوە خۆی بەدەوروبەرەکەی بناسێنێت و خۆی فێری زۆرشتی تەکنیکی فوتبۆڵێن ئەکات.

## چۆن ئەم ( من )ە دروست ئەبێت و پێش ئەکەوێت؟

ئەو پشکنەرانەی ویستویانە باسی ئەوە بکەن کە چۆن (من) دروست ئەبێت هەموویان دانیان بەو ڕاستیەدا ناوە کە ئەمە بەهۆی (فێربوونەوە) ئەبێت، کەواتە منداڵ بەهۆی فێربوونەوە فێر ئەبێت کەخۆی بناسێت و بزانێت کێیە و هەرکاتێك پێویست بوو لەکات و شوێنی تایبەتیدا ئەو زانیاریە بگۆڕێت و بەرەوپێشەوەی بەرێت بەو شێوەیەی خۆی ئەیەوێت.

لێرەدا باسی هەندێك لەو هەوڵانە ئەکەین کەکراوە بۆ ڕوونکردنەوەی مانای (من) بۆ ئەوەی خوێندەوار زانیاری لەم بارەیەوە زیاتر بێت و باشتر بتوانێت کاربکاتەسەر پێشکەوتنی هەستونەستی منداڵ و بزانێت چۆن لە (خۆ) گەیشتن

کار ئەکاتەسەر پەیوەندی بەینی مرۆڤەکانی کۆمەڵ و چۆن ئەتوانن کارەکانیان بەجێ بهێنن و چۆن لەسایەیەکی وادا مرۆڤێکی بەهێز و هاوتەریبیان لێدەرئەچێت و ئەتوانن ژیان بەرەو پێش بەرن.

1. یەکێك لەم تیۆریانە ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی 1900 و بۆ (کۆلی 1902) دوای ئەویش (مید 1934) هەروەها کەسانی تر وەکو (ڕۆمیدڤید 1966) و (گیرگرن 1971) و (ڕوسنبری 1979) بەکورتی ئەم تیوریە ئەمەیە:

(تێگەیشتنی مرۆڤ لەخۆی ئەگۆڕێت بەپێی ئەوەی کە خەڵکی چۆن تێیئەگەن). کەواتە مرۆڤ بەوشێوەیە لەخۆی ئەگاتە کە خەڵکی دەوروبەر ڕەفتاری لەگەڵ ئەکەن، ڕەفتاری باشی خەڵکی و هەست و نەستیان بەرامبەر بەم کارئەکاتەسەر ئەوەی کە ئەم چۆن ڕەفتاری باشی خەڵکی و هەستونەستیان بەرامبەر بەم کارە ئەکاتەسەر ئەوەی کە ئەم چۆن ڕەفتار ئەکات.

بیروڕای کەسانی گرنگ دەوروبەری مرۆڤەکە کارئەکاتەسەر هەڵسوکەوتی و بەوشێوەیە لەخۆی ئەگات، ئەو کەسە گرنگانە کەسانێکی دیارن لەژیانی مرۆڤدا کە ڕێگا نیشاندەر و ئامۆژگاری کەری ئەمن، ئەمانە لەمانەی خوارەوە پێکهاتوون:

(دایك، باوك، خوشك و برا، مامۆستا، هاوڕێ، هاوڕێی قوتابخانە).

لەگەڵ ئەمەشدا لەوانەیە کە شوێنی یەکێك لەمانە لەلای ئەم منداڵە وا نەبێت وەکو باسمانکرد، لەبەرئەوەی ئەو پەیوەندیە ڕوحیەی کە منداڵەکە هەیەتی لەگەڵ ئەم کەسانەدا، پەیوەندی بە ستایش و ڕێزی گەورەکانەوە هەیە بۆ منداڵەکە، لەمکاتەدا ئیحتیمال زۆرترە کە منداڵەکە زیاتر ڕێگا بەخۆی ئەدات کەکاری تێبکرێت و خۆی بگۆڕێت.

(شوتز) وا ئەبینێت کە پێویستی مرۆڤ بەیەکتری و وا ئەکات کە پەیوەندی دروست بکەن و ئەم پەیوەندیە ببێت بەهۆی کارکردنەسەر (مـن) ی مرۆڤەکان، هەروەها (ماسلۆ 1970) هەمان بڕوای هەیە و ئەڵێت (کە ئەم پێویستیە ئەبێت لەپلەکانی خوارەوەی ژیان دابین بکرێت پێش ئەوەی لەسەرەوە بتوانرێت دابین بکرێت).

کاتێك کە پێویستیەکانی فیزیۆلۆجی و سایکۆلۆجی منداڵ وەکو سەرپشکبوون و دڵنیایی بەتەواوەتی دابین بوو ئەوسا ئەمە پەرەئەسێنێت بۆ دابین کردنی پێویستی خۆشەویستی، خۆبەیەك زانین لەکۆمەڵدا، پەیوەندی لەگەڵ یەکتردا، بەکورتی دانانان بەوەی کە ئەم مرۆڤە مرۆڤێکی بەڕێزەوە کۆمەڵە ڕێزی لێئەگرێت، کەوا بەهۆی پەیوەندیەوە خۆشەویستی دروست ئەبێت.

ئەمە مانای ئەوەیە کە هەستی گەرم و گوڕ و ڕاست لەناو ئەندامانی کۆمەڵدا دروست ئەبێت و بەمە (مـن) ی مرۆڤ بەهێز ئەبێت، کەواتە چۆن و بەچ جۆرێك منداڵ پەیوەندییەکانی بۆ جێبەجێ ئەکرێت، ئەوە کار ئەکاتەسەر (من) ی ئەو بەهێزیان بێهێزیان ئەکات، ئەمە لەژیانی ڕۆژانەدا مانای چی؟

ئەمە مانای ئەوەیە کە ئەو کەسە گرنگانەی لەدەوروبەری منداڵەکەن لەهەڵسوکەوت و هەڵسەنگاندنیان بۆ ڕەفتارەکانی کارئەکەسەر (من) ی و پێش یان پاشیان ئەخەن، کەواتە بەهۆی تێگەیشتنیان، هەڵسوکەوتیان هەستیان و هەڵسەنگاندنیان و ڕەفتاریان بەرامبەر بە منداڵەکە ئەتوانن کارێکی گەورە بکەنەسەر (من)ی منداڵەکە.

2. بەراوردکردنی کۆمەڵایەتی: بەپێی ئەم تیۆریە لەوە ئەچێت کە هەموو کەسێك بەراوردی خۆی بکات لەگەڵ کەسانی تردا و بەم پێیە لەخۆی بگات (فتسنگر 1954).

بەپێی ئەم تیۆریە هەڵسەنگاندنی کەسانی گرنگ بەتەنها کاری خۆی ناکات بەڵکو ئەبێت ئەم هەڵسەنگاندنانە بەراورد بکرێت لەگەڵ کەسانی تردا کە ئەو کەسە گرنگە هەڵیسەنگاندون، کەواتە ئەوەی کە هەڵئەسەنگێندرێت لەلایەن کەسێکی گرنگەوە سەیری ئەوەش ئەکات کە هەمان کەسی گرنگ چۆن کەسێکی تری هەڵسەنگاندوە بۆ ئەوەی ئەم خۆی پێبپێوێت.

کاتێك (دایەن) ستایش ئەکرێت لەلایەن باوکیەوە، ئەمە بەراورد ئەکات لەگەڵ ستایش یان سەرزەنشتی باوکی بۆ (دیمەن) کە ڕەفتارێك ئەکات لەهەمان بارودۆخی وەکو ئەمدا، بەم هۆیەوە (دایەن) لە (خۆ) ی ئەگات، (دایەن) لەوانەیە واتێبگات کە جیاوازیەك هەیە لەڕەفتاری باوکی بەرامبەری وەکو لەڕەفتاری بەرامبەر (دیمەن) و بەمە تێگەیشتنی لە (خۆ)ی بەو پێیە ئەگۆڕێت، بەهەمان شێوە قوتابیانی پۆلێك بەراوردی خۆیان ئەکەن لەگەڵ یەکتریدا کاتێك مامۆستا ڕە فتارەکانیان هەڵئەسەنگێنێت لە بارودۆخی وەکو یەکدا و ئەمەکار ئەکاتەسەر پەیوەندیی نێوانیان و پەیوەندیان بە مامۆستاوە.

### چۆن تێگەیشتنی (من)ی کار ئەکاتەسەر پەیوەندی مرۆڤ

ئەو هەڵسەنگاندنەی کە مرۆڤ ئەیکات بۆ خۆی و بەشێکە لەتێگەیشتنی خۆی بۆ خۆی کار ئەکاتەسەر هەستونەستی و بیروتێگەیشتنی بەرامبەر بەخەڵکی و بناغەیەکە بۆ تێگەیشتنی کە خەڵکی چۆنی تێئەگەن و چۆن ڕەفتاری لەگەڵ ئەکەن.

مۆڤێك کە بەچاوی ڕێزەوە سەیری (خۆ)ی ئەکات، ئەزانێت کە زیاتر قبوڵ ئەکرێت و کەمتر ڕەت ئەکرێتەوە وەك لەکەسێك کەڕێزی بۆ خۆی نەبێت، ئەوەی ڕێزی خۆی بزانێت سەیری ڕەخنە و هەڵسەنگاندنی خەڵکی ئەکات وەکو کارێکی باش و سودی لێوەر ئەگرێت، مرۆڤێك کە کەمتر ڕێزی خۆی ئەگرێت زۆرجار کەمتر سەرکەوتوو ئەبێت لەکارەکانیدا، چونکە کاتێك کەزانی خەڵکی خستویانەتە ژێر چاودرێریەوە و ئەویش چاوەڕوانی ڕەخنەی نێگەتیڤ ئەکات لەوانەوە ئیتر ئەشڵەژێت لەکارەکانیدا و سەرناکەوێت، کەسانێك کە ڕێزی خۆیان کەم ئەگرن، هەستێکی وایان هەیە کاتێك کارێکی هەرەوەزی ئەکەن ئەترسن لەژێر کەوتن لەبەرئەوەی کەسانێکی تر لەوان باشترن، ئەمانە ئاسانتر کاریان تێئەکرێت، ئەمە بۆچی وایە؟

(هاماجك 1982) ئەڵێت: ڕێز و کەسایەتیی مرۆڤێك وەکو بێژنگێك وایە کە بەهۆی ئەوە و ئەو هەستو پێوانانەی خەڵکی هەیەتی بەرامبەر ئەیبێژێت، بۆیە کەسێك کە خراپ لەخۆی گەیشت بێت، ناچار ئەبێت کە هەڵسەنگاندنی خەڵکی کاری تێبکات و هەر جارە بەو پێیە هەڵسوکەوت بکات کە خەڵکی ئەیەوێت بیبینێت، لەبەرئەوە بەو شێوەیە خەڵکی تێئەگات کە ئەو وا هەست ئەکات و قبوڵ ئەکرێت وەکو خەڵکی ئەیەوێت و ئەیبینێت، بەڵام کەسێك

کە (خۆ)ی بەهێزی هەبێت ناچار نیە کە هەڵسەنگاندنی خەڵکی قبوڵ بکات هەرچۆنێك بێت و پێویستی بەوە نیە کە خۆی بگۆڕێت بۆ ئەوەی قبوڵ بکرێت لەلایەن کەسانی دەوروبەریەوە.

### پرسیاری 19

### منداڵەکەمان تەمەنی دوو ساڵە و هەتاکو ئێستاش ئەترسێت لە خەڵکی و هەر میوانێکمان دێت دەست ئەکات بەزریکاندن، چیبکەین و چارمان چیە؟

منداڵ بەقۆناغی یەك لەدوای یەکدا ئەڕوات لەژیاندا، لە قۆناغی یەکەمدا کە قۆناغی منداڵی ساوایە، منداڵ فێر ئەبێت کە پەیوەندی لەگەڵ دایکیدا پەیدابکات و دوایش لەگەڵ ئەندامانی تری خێزاندا، و لەقۆناغی دوایتردا ئەم پەیوەندیە وردە وردە کەم ئەکاتەوە و خۆی ڕزگار ئەکات، منداڵەکەی ئێوە لەقۆناغی یەکەمدایە و لەوە ئەترسێت کە ئەو پەیوەندیەی کە هەیەتی بەئەندامانی خێزانەوە لێی تێك بچێت و کەسێکی تر شوێنی ئەو بگرێتەوە، جا بۆیە لەکاتێکی وادا گرانە بۆی کە کەسێکی تر لەنزیك دایکیەوە ببینێت و ئەترسێت لەوەی دایکی لەدەست بچێت، جا بۆیە هەر کەسێك لەدەرەوەی خێزانەکە بێت یاخود منداڵەکە هەتاکو ئێستا پەیوەندی لەگەڵ دروست نەکردبێت منداڵەکە ئەترسێنێت و ئەگری، ئەمە شتێکی ئاساییە و ترسی نیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە نیشانەی پێشکەوتنی هەستی منداڵەکەتە و پێویستە بەژیری مامەڵەی لەگەڵ بکرێت.

پێویستە لەسەر خزم و کەسوکار و هاوڕیانی خێزانەکە لەسەر خۆبن کاتێك کە بۆ یەکەمجار چاویان بە منداڵەکە ئەکەوێت هەوڵ نەدەن بیگرنە باوەش لەم تەمەنەدا، هەربۆیەشە کە لەتەمەنی زوتردا ئەم کەسانە بەئاسانی ئەیانتوانی منداڵەکە بگرنە باوەش، بەلاّم ئێستا هەندێك گران بووە و منداڵەکە نایەوێت بچێتەلای هەموو کەس، هەروەها دایکات پێویستە زۆر لەمنداڵەکە نەکەن کە بچێتە لای ئەو کەسانەی کە نایەوێت و پێی بڵێن کە ئەوە ناسیاوی خۆیانە یان بەهەر هۆیەکی ترەوە بێت وا لەمنداڵەکە بکەن کە شەرم لەخۆی بکات و وابزانێت کە شتێکی خراپ ئەکات ئەگەر نەچێت، ئەم بارودۆخە لەقۆناغی داهاتوودا نامێنێت و منداڵەکە خۆی پەیوەندی دروست ئەکات لەگەڵ کەسانی دەوروبەر.

### پرسیاری 20

### کچە پێنج ساڵانەکەم زۆرجار خەوی ناخۆش ئەبینێت و ئەڵێت کە خێوی دیوە، ئەم چیە و چیبکەم؟

هەموو کچێکی پێنج ساڵان ئەم هەستە ترسناکەی هەیە، ئەمە پەیوەندی بەدووشتی بەیەکەوە بەستراو هەیە، یەکەم خەیاڵی منداڵەکە و دووەم توڕەیی و ڕقی لەدایکی لەتەمەنی (ئوئیدیباڵ) دا کە ئەکەوێتە ئەم تەمەنەوە.

کچێکی بچوك کە ئەوێت باوکی هەر بۆخۆی بێت و ڕقی لەدایکی ئەبێتەوە بەم هۆیەوە، خەو بەجادوگەرەوە ئەبینێت کە نیشانەی دایکەکەیە لەخەویدا، کوڕێکە کە ئەیەوێت لەباوکی ڕزگاری ببێت و دایکی هەربۆخۆی بێت

خەو بەخێوەوە ئەبینێت، چونکە لەخەودا منداڵ سزا ئەدرێت بۆ ئەو بیرە خراپەی کە هەیەتی بەرامبەر ئەو دایکە یان باوکە کە لەخۆیان ئەچن ئەم خەوانـە شـتێکی ئاسـایین لـەم تەمەنـەدا و بەتـەواوبوونی ئـەم قۆناغـە خەونـەکانیش تەواو ئەبن.

**پرسیاری 21**

**کوڕەکەمان پێنج ساڵانە و زۆر شەرمنە وە دڵنیا نییە لەوەی لەگەڵ منداڵانی تردا پەیوەندی دروست بکـات زۆر خەفەت بارین بەوەی ئەمە کاربکاتەسەر پێشکەوتنی مێشك و هەسـت و نەسـتی، چـی ئـەبێت بـەهۆی شەرمنی، و چۆن ئەتوانین یارمەتی بدەین؟**

شەرمنی لەوانەیە کەشتێکی بۆ ماوەبێت یان تایبەتی بێـت بەمنداڵەکەتـەوە، چـونکە هەنـدێك منـداڵ زۆرتریـان ئەوێت کە تێبگەن کە خەڵکی چی ئەوێت لێیان و چۆن پەیوەندی دروست ئەکرێت و کـاتی خـۆی ئـەوێت بـۆ ئـەوەی تێبگەن کە ئەمان جیاوازن لە منداڵانی تر و بزانن کە بەبێ کرژبوون پەیوەندی لەگەڵ کەسانی تردا بکەن.

کاتێك کە باس شەرمنی ئەکرێت پێویستە پەیوەندی نێوان منداڵەکە و دایکوباوك ڕەچـاو بکرێـت، ئایـا دایکەکـە ئامادەیە کە دەست لە منداڵەکەی بەربدات و وازی لێ بهێنێت کە خۆی پەیوەندی دروست بکـات لەگـەڵ منـداڵانی تردا؟ ئەمە هەرچەندە هەندێك دایك واپیشان ئەدات کە ئەیەوێت منداڵەکەی پەیوەندی بکات بەخەڵکی ترەوە، بەڵام بەشێوەیەك کە تێیئەگەێنێت کە (لەبیرت نەچێت، هەر من گرنگم بۆتۆ) لەمکاتەدا منداڵەکە حەزناکات هاوڕێیـەتی منداڵانی تر بکات، هەندێك دایکوباوك حەزناکەن کە منداڵەکەیان دنیای خۆی فراوانتر بکات و هاوڕێی تری هـەبێت چونکە ئەمە مانای ئەوەیە کە منداڵەکەیان لەدەست ئەچێت، ئەم ڕەفتارەی دایکوباوك بەهۆی ترسەوەیە و پەیوەندی بەشەرمەوە نیە و گرنگە کە ئەم دووشتە لەیەك جیابکەینەوە.

**پرسیاری 22**

**پیاوەکەم بەرتیل ئەدات بەمنداڵە چوار ساڵەکەمان بۆ هەرکارێك ئەیکات، ئایا ڕاسـتە ئەگـەر مـن پـێم ناخۆشبێت و بڵێم ئەمە ڕاست نییە؟**

منداڵ ئەیەوێت و حەز ئەکات کە شتی ڕاست بکات و پێیخۆشە کاتێك کە پاداشـتی ئەدرێتـەوە، بـەڵام بـانزیکتر سەیری (پاداشت) بکەین، پاداشت بەبیری منداڵ و لەلای منداڵ ئەوەیە کە هەست ئەکات کە ئـەتوانیت شـتێك یـان کارێك بکات، ئەم هەستە نرخێك بۆ کارەکەی دائەنێت.

لێرەدا و لەم نموونەیەدا لەوە ئەچێت کە باوکەکە بڕوای بە توانای منداڵەکە نیە کە بتوانێت شتێك بکات بەخۆشـی خۆی و بۆ خۆی، منداڵەکە زۆر حەزئەکات کە هەست بەوە بکات کە ئـەتوانێت و ئەیـەوێت شـتێك بکـات و بەمـە هەستی (خۆ)یی، خۆی زیاد ئەکات و گەورە ئەبێت و ئەگەشێتەوە لەگەڵ هەر کارێك کە ئەیکات.

بەهێزکردنی (خو)یی منداڵەکە لەلایەن دایکوباوکەوە گرنگیەکی تایبەتی هەیە، جاری وا هەیە ئەتەوێت پاداشتی منداڵەکە بدەیتەوە بەشتێکی کۆنکرێت کە زیاترە لە تەنها سوپاسێك یان ماچێك یان قسەیەکی تر کە لەوە ئەچێت بەرتیل بێت و وای لێبێت، کە هەرجارێك منداڵەکە کارێکی باشی کرد خێرا دیاریەکی بدەیتێ و بەمە وا لەمنداڵەکە بکات کە دایکوباوك ئەیانەوێت خۆشەویستی و پەیوەندی باشیان بەمنداڵەکەوە بکرن، یاخود بەرتیلی بدەنێ بۆ ئەوەی شتی ڕاست بکات، ئەم پەیامە دیار (خۆ)یی منداڵەکە بریندار ئەکات و زەرەری لێئەدات لەجیاتی ئەوەی سوودی پێبگەێنێت.

ئەوەی دڵخۆشکەری منداڵەکەیە، پەیوەندیەکی باشە لەگەڵ دایکوباوك یدا، دایکوباوکێکی هەژار لەوانەیە بتوانێت تەنها پارچە دارێك یان ماچێك بدات بە منداڵەکەی کە لەناخی دڵەوە هاتبێت و (خۆ)یی منداڵەکە ئەوەندە بەهێز بکات کە زیاتر بێت لەدیاری و بەرتیلی باوکێکی دەوڵەمەند کە کاتی ئەوەی نەبێت بزانێت منداڵەکەی لەچی دایەو (خۆ)یی منداڵەکە بەم بەریتل و دیاریانە بەهێز نەکات.

بەهەر جۆرێك بەریتل بدەیت بە منداڵەکەت بۆ ئەوەی بتەوێت پەیوەندیەك دروست بکەیت کە بناغەکەی لەسەر ڕاستگۆیی نەبێت و بۆ هەڵخەڵەتاندنی منداڵەکە بێت، ئەوا بەئاسانی منداڵەکە ئەتوانێت لەڕاستی شتەکە بگات و ڕێزی نەمێنێت بۆ دایکوباوکی، هەروەها ئەمە نیشانەیەکە بۆ ئەوەی کە ئەو دایکوباوکە بڕوایان بەخۆیان نیە کە بتوانن پەیوەندیەکی بەهێز و ڕاست دروست بکەن لەگەڵ منداڵەکەیاندا و پێویستە بەو شێوەیە سەیری مەسەلەکە بکەن، لەپەیوەندی نێوان دایکوباوك لەگەڵ منداڵدا هەندێکجار ڕووئەدات کە پەیوەندی نارێکوپێکی بەینی دایکوباوك و ڕێك نەکەوتنیان لەسەر جۆری پەروەردە و دروست کردنی باوردۆخێکی وا کە هەریەکەیان بیەوێت بەشێوەیەك منداڵەکە ڕازی بکات، ئەوە منداڵەکە ئەبێت بەقوربانی ئەم نارێکیەی نێوان دایکوباوك و سەری لێئەشێوێنێت و نازانێت کامیان ڕاست ئەکەن و وای لێدێت کە هەمیشە لەسەر دووپەت یاری بکات و بیەوێت هەردووکیان ڕازی بکات، کە ئەمە ئەبێت بەهۆی دووبەش بوونی کەسایەتی و کەسێك بێت کە نەتوانێت بەئاسوودەیی وەکو خۆی ئەیەوێت بژی و هەمیشە هەوڵ بدات کە بەدڵی خەڵکی بکات و خۆی لەبیربکات، یاخود بەپێچەوانەوە بڕوای بەکەس نەمێنێت و تەنها بیر لەخۆی بکاتەوە، کە ئەمە هەردووکیان ڕێگای ژیانێکی ئاسودەیی لەمنداڵەکە ئەگرێت و ژیانی لێ تێك ئەدات، کەواتە گرنگە بۆ دایکوباوك کە بگەنە ئەنجامێك کە هەردوولای پەیوەندیەکە (دایکوباوك – منداڵ) ڕازی بکات و بەهەردوو دایکوباوك هەمان پەیام بدەن بە منداڵەکە.

## فشەکردن

## پرسیاری 23

## کوڕێکی دەساڵانمان هەیە کە فشە بەهەموو شتێکەوە ئەکات، بەتایبەتی کە چەند ئەزانێت و چەند زیرەکە، بەڕاستی نازانم ئەمە لەکوێوە هاتووە و بۆچی وا ئەکات نازانم چیبکەم؟

منداڵ لەقۆناغی جیاوازدا فشەی جیاواز ئەکات لەبارەی شتی جیاوازە وە لەبەرهۆی جیاواز، ئەگەر منداڵەکەت لەهەموو شتێکدا فشەئەکات ئەوا ئەبێت زیاتر بیری لێبکەیتەوە و چارێکی بۆ بدۆزیتەوە، چونکە ئەمە نیشانەیەکە

بۆ ئەوەی کە منداڵەکەت لەژیانی خۆی سەرپشك نیە و پێویستی بە گەورەکردن و جوانکردنی خۆی هەیە، بۆ ئــەوەی خۆی بپارێزێت لەوەی بەناشیرینی ببینرێت، ئەمە مانای ئەوەیە کە بڕوای بەخۆی نیە و ئەیەوێت بەفشە بــۆ خــەڵکی بیسەلمێنێت کەوایە.

هەروەها ئەتوانین ئەم فشەکردنە بەنیشانەیەك بۆ هاوارکردن بۆ یارمەتی دابنێین، کــە ئەمــەش مانــای ئەوەیــە کــە ئەزانێت کە ئەو لەناو خەڵکی و هاوڕێکانیدا قبوڵ ناکرێت وەکو خۆی و پێویستە درۆ و دەلەسەی پێوەبنێت بۆ ئەوەی قبوڵی بکەن، ئەگەر فشەکردنە دەوامیکرد ئەوە نیشانەی نەخۆشیەکی زۆر سامناکە و پێویستی بەیارمەتی پزیشــکی تایبەتی هەیە بۆ ئەوەی لەهۆی ڕاستی نەخۆشیەکە تێبگات.

وەکو یارمەتیەکی سەرەتایی، باشتروایە کە منداڵەکەت قســە لەگــەڵ یــەکێکی دەرەوەی خێــزان بکــات و گفتــەگۆ لەسەر تەنگوچەڵەمەکانی لەگەڵ کەسێك بکات کەخۆی بڕوای پێیەتی و متمانــەی پێئــەکات کــە قســەکانی لــەنێوان خۆیاندا ئەمێنێتەوە، چونکە ئەم فشانە نیشانەیەکی دیارن بۆ گیروگرفتێکی قوڵتر کە لەپێش هەموو کەسێکدا ئەبێت منداڵەکە خۆی تێبگات و بەسەریاندا سەرکەوێت.

## پرسیاری 24

## چی ڕوودەدات ئەگەر.....

**کچێکی حەوت ساڵانمان هەیە کە هەردەم پرسیار ئەکات چی ئەبێت ئەگەر... بۆ نمونــە پرســیار ئــەکات کەچی ئەبێت ئەگەر تۆ و بــاوکم جیابونەوە؟ چی ئەبێت ئەگەر من نەخۆشکەوتم و کەس لەماڵەوە نەبوو؟ چی ئــەبێت ئەگــەر بــاوکم مــرد، ئــیتر زۆر بــیر لــە مجۆرە شــتانە ئەکاتــەوە و باســیان ئــەکات، ئایــا ئەمــە ئاساییە یان نا؟**

ترس و پەژارەی منداڵەکەت لە بناغەدا ئەگەڕێتەوە بۆ دڵنیا نەبوون و نائارامی هەستەکانی، منداڵ زۆرجار غــەم و پەژارەی جیاوازی هەیە لە قۆناغی جیاوازدا کە هەندێکجار بەئاشکرا دەریئەبڕێت و پێویستی بەوەلاّم هەیە، ئەم غەم و پەژاریەی تۆ باسی ئەکەیت لەوە ئەچێت زیاتر بێت لەوەی کە ئاسایی بێت.

پرسیارکردنی لە جیابونەوەی نیشانەی ئەوەیە کە منداڵەکە هەست بە پەشێویەك ئەکات لە خێزانەکەدا و ئەترســێت لە جیابونەوەی ئێــوە و بەجێهێشــتنی، لەوانەیــە گــوێی لەئاژاوەیــەك بوو‌بێــت یــان هەســتی بەناخۆشــیەك کردبێــت لەناوماڵەکەدا و گەیشتبێتە ئەو ئەنجامەی کە ئێوە لەیەك جیائەبنەوە و لەوانەیە لە قوتابخانە بیستبێتی کە ژن و پیاو لەیەك جیائەبنەوە و هاوڕێی وای هەبێت کە دایکوباوکی لەیەك جیابوبێتنەوە.

کەواتە پێویستە مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ بارودۆخی خێزان و بزانێت چی ڕوویداوە و ئەو تەنگوچەڵەمانەی لەخێزانەکــەدا هەیە کامەیان وای لەم منداڵە کــردووە کــە وابــیر بکاتــەوە و ئــەمجۆرە پرســیارانە بکــات، ئــەم پرســیارانەی منــداڵ بارومترێکی باشن بۆ دایکوباوك بۆ ئەوەی بزانن منداڵەکەیان بیر لەچی ئەکاتــەوە و بــزانن خۆیــان وەکــو دایکوبــاوك گەیشتونەتە کوێ لە پەیوەندیاندا لەگەڵ یەکتریدا، چونکە ئاسانە کە مرۆڤ خۆی لەبیربچێتەوە بەهۆی پــەروەردەکردنی

منداڵەوە و کاتێك ئەزانێت کە بەجارێك باری ژیانی ناخۆش بووە و لەپەیوەندی کۆمەڵایەتی دواکەوتووە و پەیوەندیەکەیان وەکو ژن و مێرد لەگێژاوێکی ناهەمواردایە بەبێ ئەوەی بەخۆیان بزانن، کەواتە پرسیاری منداڵەکە ئەم سوودەی هەیە و ئەبێت گرنگی پێبدرێت.

ئەگەر هۆی پرسیارەکان ئەمانە نەبوو، ئەوە مانای ئەوەیە کە ئەم پەژارە و ئاژاوەیە پەیوەندی بەئاژاوەی دەروونی خۆیەوە هەیە و پێویستە پزیشکی تایبەتمەندی دەروونی چاوی بەمنداڵەکە بکەوێت.

**پرسیاری** 25

**منداڵی خوشکەکەم لەم بەینەدا هاتن بەمیوانی بۆ ماڵی ئێمە، سەرم سوڕما لەئاقڵی و ڕێکوپێکی کچەکەیان کە لەتەمەنی هەشت ساڵی دایە، هەموو ماوەی میوانداریەکە ئەو کچە خەریکی شت خستنەوە شوێنی خۆی بوو ئاگاداری منداڵەکانی ئەکرد، لەوەدا بوو کە پیاو بڕوای نەئەکرد کە ئەمە کچێکی ئەوەندە ڕێکوپێکی لێدەرچوو بێت، ئەمە چیە و ئایا ئەمە ڕاستەیان نا؟**

لێرەدا گرنگە بزانین کەتۆ باسی منداڵێك ئەکەیت لەماڵی کەسێکی تردا، زۆر دایکوباوك جارێك لەجاران گوێی لێبووە کە خەڵکی ئەڵێن چەند منداڵەکەی ئەمان گوێڕایەڵ و ئاقڵە و ئەمان سەریان سوڕ ئەمێنێت لەم قسەیە و سەری بۆ ئەلەقێنن و لەدڵی خۆیاندا ئەڵێن بۆ بڵێیت باسی منداڵەکەی ئێمە بکات یان لێی تێکچووە.

باوکێك ووتی: کاتێك کە منداڵەکەم لەتەمەنی حەوت ساڵیدا بوو هەر خەریکی بۆڵەبۆڵ و گلەیی کردن بوو ژیان لەگەڵیدا ئەوەندە ئاسان نەبوو، کاتێك مامۆستاکەیان بۆی باسکردم لە کۆبونەوەیەکی دایکوباوکاندا کە منداڵەکەم چەند ئاقڵ و لەسەرخۆیە و چۆن هەموو ڕۆژێك ئەو یەکەم کەسە کە هەڵئەسێت تەختە ڕەشەکە ئەسڕێتەوە و قەڵەم و لاستیك دابەش ئەکات بەسەر قوتابیەکاندا، لەڕاستیدا بەباشی گوێم لەمامۆستاکە نەئەگرت چونکە وامئەزانی کەهەر بۆیە وائەڵێت لەبەرئەوەی دڵی من خۆش بکات، تا لەوکاتەدا مامۆستایەکی ترهات و لەسەر قسەکانی ئەو مامۆستایەی یەکەم ئەوەندەی تری باسکرد، کە چوومە ماڵەوە پێم ووت کە شتێك هەیە من تێیناگەم بەڵکو ئەو بۆم ڕوونبکاتەوە و پێم ووت کە بۆچی لەماڵەوە ئەوەندە ئاقڵ نیە، کەچی لەوەڵامدا ووتی کە هەموو ئاقڵیەکەم لەقوتابخانە بەکار ئەهێنم و بەشی ماڵەوەم پێنامێنێت، لەبەرئەوە زۆر ئاساییە کە ڕەفتاری منداڵ باشترە لەشوێنێکی تر وەك لەماڵەوە.

باوکێکی تر باسی ئەوەی کرد کە چۆن لەگەڵ منداڵەکەیدا ناخۆشی بووە لەبەرئەوەی زۆر لەگەڵی خەریك بووە بۆ ئەوەی ئوتومبیلەکەی لەگەڵ بشوات، بەلام منداڵەکە بەگوێی نەکردووە کەچی لەباش نەختێك یارمەتی دراوسێیەکانی داوە و ئوتومبیلەکەی ئەوی شتووە.

## دوژمنایەتی خوشکوبرا

شەڕوشۆڕی خوشك و برا ئەوەندە زۆر لەژیانی ڕۆژانەی خێزاندا دووبارە ئەبێتەوە، کە مرۆڤ لەبیری ئەچێتەوە کە ئەمانە نەك تەنها خوشك وبران، بەڵکو هاوڕێ و دۆستی یەکتریشن و جاری واهەیە کە هەست ئەکەن کە باشترین هاوڕێی یەکترن و لەهەمانکاتدا خراپترین دوژمنی یەکترن.

شەڕوشۆڕی نێوان خوشك و برا بەشێکە لەژیانی خێزان و هەر ئەمێنێت لەبەرئەوەی هەر خێزانەی توانایەکی جیاوازی هەیە لەهەستونەست و توانایی دارایی کە ئەمە هەمووشتێك ئەگرێتەوە، لەگرنگیدان بەمنداڵەکە هەتاکو جلوبەرگ کڕین، لەبەرئەوە منداڵەکان ناچارن کە پێشبڕکێ لەگەڵ یەك بکەن بۆ ئەوەی دایکوباوك گرنگی بەئەوەیان بدات کە زیاتر و باشتر ژیان ئەبات بەڕێوە و سەرنجی دایکوباوك ڕائەکێشێت بۆلای خۆی، منداڵەکان هەمیشە لەو بیرەدان کە گوایا (کێ چی وەرئەگرێت لەماڵەوە؟) ئایا منیش وەکو ئەویتر سەیر ئەکرێم و بەشی خۆم وەرئەگرم؟ منداڵەکان وەڵامی ئەو پرسیارەیان ئەوێت (ئایا من لەهەموویان خۆشەویستترم؟) لەبەرئەوەی پەیوەندی هەر خێزانێك جیاوازە لە خێزانێکی تر، لە بەرئەوە زۆر گرانە کە بەشێوەیەکی تەواو بتوانرێت باسێکی وا چڕوپڕ بکرێت.

بۆ نموونە: (ریاکشونی) منداڵێك کاتێك کە منداڵێکی تر لەدایك ئەبێت لە خێزانەکەدا پەیوەندی هەیە بەوەی ئەم منداڵە لەچ پلەیەکی پێشکەوتنی عەقڵی دایە، نێرە یان مێ، جیاوازی تەمەن، ژمارەی منداڵان، ژمارە چەندە لە خێزاندا، چ ڕۆڵێك ئەبینێت لەپەیوەندی نێوان ئەندامانی خێزانەکەدا، چۆن دایکوباوك ڕەفتار ئەکەن لەگەڵ منداڵەکاندا.... وە ......وە.

لەزۆر ڕووی گرنگەوە، خوشك و برا هاوکاری یەکترن لەناو خێزاندا، کاتێك کە منداڵەکان نزیکن لەتەمەنەوە، لەیەکتری ڕادێن لەسەر ئەوەی کە دەسەڵاتیان زۆر کەمترە لە دایکوباوك، کەواتە لەوانەیە شتێکی باش و پۆزەتیڤ بێت کاتێك کە کەسێکی تر هەبێت کە تەمەنی نزیك بێت لەتەمەنی منداڵەکانەوە و دەسەڵاتی وەکو ئەو وابێت، هەرچەندە ئەمە مانای ئەوەیە کە ئەبێت خۆشەویستی و گرنگی دایکوباوك لەبەینی خۆیاندا بەش بکەن، کەواتە کاتێك کە تەنها دوو سێ ساڵێك جیاوازی هەبێت لەنێوان منداڵەکاندا ئەوە ئاسانترە کە پەیوەندیان بەهێزبێت و ئاسانتر بن هاوڕێی یەکتری، هەرچەندە منداڵە گەورەکەیان ڕۆڵی ڕێگا نیشاندەر ئەبینێت، جا ئیتر بچوکە کە بیەوێت یان نا، هەروەها کاتێکیش کە خوشك و برا لە تەمەنی جیاوازدان وەکو سێ ساڵێك و دەساڵێك ئەوەندە جیاوازی بەکەڵك هەیە لە نێوانیاندا کە ڕێگایان نادات لەیەکتری نزیك ببنەوە و تووشی تەنگوچەڵەمە ببن، هەرچەندە تەنگوچەڵەمە هەر ڕووئەدات لەنێوانیاندا و تووشی ناخۆشی دێن و ئەمەش بەشێکە لەژیان و سوودی خۆی هەیە لەبەرئەوەی خوشك و برا زۆر شت بەیەکەوە بەش ئەکەن لەخێزاندا، لەگەڵ ئەمەشدا گوێ بەیەکتری ئەدەن و یەکتریان خۆش ئەوێت و هەست و نەست و پەیوەندی بەهێز دروست ئەکەن، پەیوەندی نێوان خوشك و برا کارێکی گرنگی هەمیشەیی دایکوباوکە و هەردەم پێوەی خەریکن.

ئەم جۆروپڕیەی پەیوەندی خێزان و بوونی ئەم جیاوازیانە وائەکات کە ئەنجامەکەیش جیاوازبن، وە بەزۆر شێوەی جیاواز خۆی بنوێنێت کە ئەکەوێتە مابەینی هاوئاهەنگیەکی تەواو لەنێوان خوشك و برادا لەئێستاو لە داوڕۆژیشدا و

پەیوەندیەکی ناتەواو نەگونجاو کە ئەمەیان لەبەر نەبوونی سایەکی هاوتەریب و ئاسایی لەخێزاندا و لەبەر بێتوانایی خێزان بۆ چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەی ڕۆژانەیان بەشێوەیەکی ئاقلانەو لەسەرخۆ و بەکارهێنانی زۆر و زۆرداری بۆ ئەمە و ڕێزنەگرتنی ئەندامانی خێزان بۆ بیروڕای یەکتری و نەچاندنی ڕۆحی یارمەتی و هەرەوەرزی و دیموکراتی لەناو منداڵانی خێزاندا کە ئەمانە ڕێگا لەپێشکەوتنی منداڵەکان ئەگرێت.

**پرسیاری** 26

## کوڕێکی سێ ساڵانم هەیە و سکم پڕە بەمنداڵێکی ترەوە لەشەش مانگیدا چۆن منداڵەکەم ئامادە بکەم و پێی بڵێم کە منداڵێکی ترمان ئەبێت؟ ئایا چی بکەم؟

منداڵە سێ ساڵەکەتان ئەزانێت کە منداڵی تریش لەدنیادا هەیە جگە لەو، عەقڵی بەوە ئەشکێت کە هەندێك لەهاوڕێکانی براو خوشکی تریا هەیە، لەم بارەیەوە تاڕادەیەك منداڵەکەت ئامادەیە کە تێبگات کە منداڵێکی تر لە خێزاندا شتێکی ئاساییە، بەڵام نازانێت مانای چی.

بۆ ئەوەی یارمەتی منداڵەکەت بدەیت و ئامادەی بکەیت بۆ هاتنی منداڵێکی تر بۆ خێزانەکە، پێویستە هەندێك شت هەیە بیزانێت، لەمانە ئەو خۆی چۆم پەروەردەکراوە؟ ئایا بۆی هەبووە وەکو منداڵێکی سەربەست و ڕەفتار بکات؟ ئەچێت بۆ باخچەی ساوایان و فێرە لەگەڵ منداڵانی تر هەڵسوکەوت بکات؟ منداڵی یەکەمە و هەر لەماڵەوە بووە؟ کە ئەمە وای لێبکات کە نەتوانێت یاری و خۆشەویستی خۆی لەگەڵ کەسانی تردا بەش بکات و منداڵێك بێت کە حەز بەتەنهایی بکات و ئەم منداڵە تازەیە هەڕەشە لەشوێنی کۆمەڵایەتی بکات، چونکە منداڵە تازەکە پێویستی بەکات و گرنگی پێدانی زیاتر هەیە و دایکەکە ناچارە کاتی خۆی بەش بکات لەنێوان منداڵەکاندا، کەواتە ئەمە بارودۆخێکی تازەیە و لەماوەی داهاتوودا تووشی ناخۆشیان ئەکات و تەنگوچەڵەمەی تایبەتی خۆی هەیە ئەبێت چارەسەری بکرێت.

کاتێك دایکوباوك باسی لە دایکبوونی منداڵێکی تازە ئەکەن بۆ یەکەمجار، منداڵەکەیان بەخۆشیەوە چاوەڕوانی ئەم ڕووداوە ئەکات و لەوانەشە کە ماف بدات بەخۆی کە ئەو منداڵە تازەیە هینی خۆیەتی و بۆخۆی بێت و جاری وا هەیە ئەڵێت کە (منداڵێکی تازەم ئەبێت) یاخود (منداڵێکی تازەم هەیە لەماڵەوە) کاتێك کە گوێت لەم قسانە ئەبێت ئەوە بزانە کەلەسەر ڕێگای ڕاستیت و ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە منداڵەکەت خۆی ئەناسێت بەهۆی ئێوەوە، ئەزانێت کە دایکوباوك پەروەردەکەری ئەون، بەتایبەتی کچان ئەمە زوو دەرئەخەن و ئەمە نیشانەیەکی باشە.

وەکو خۆ ئامادەکردنێك پێویستە دایکوباوك بتوانن بیر لە پلەی تێگەیشتنی منداڵەکەیان بکەنەوە و لەوێوە کاربکەن، ئایا منداڵێکی سێ ساڵانەی پێشکەوتووە یان نا؟ ئایا زۆر لەگەڵی خەریك بوون و بەقسەیان کردووە؟ هەروەها گرنگە کە کات بدەیت بە منداڵەکەت کەخۆی ڕابهێنێت بۆ ئەم بیرە تازەیە لەماوەی ئەم نۆ مانگەی کە دایکەکە سکی پڕشە بەسە بۆ ئەوەی کە بیر لەوەبکەیتەوە کە چۆن یارمەتی منداڵەکە بدەیت و وای لێبکەیت کە هەستونەستی خۆی والێبکات کە منداڵەکە قبوڵ بکات، باشتروایە باسی منداڵە تازەکە نەکەیت پێش ئەوەی کە دیار

ئەبێت کەسکت پڕە و ناتوانرێت لە منداڵەکە بشاردرێتەوە کەتۆ خەریکی منداڵت ئەبێت، ئەمە لەبەر ئەوەی کە لەپێش ئەمەدا و لەمانگەکانی یەکەمدا ئیحتمالی ڕودانی کارەساتی ناخۆش و لەبارچوونی منداڵەکە زۆرە و پێویست ناکات کە منداڵەکە لەمبارەیەوە تێکەڵ بکرێت، لەلایەکی ترەوە نەبوونی منداڵەکە بەهۆی بەرزنەبوونەوەی سکی دایکەکەوە شتێکی زەحمەتە بۆ منداڵەکە کە تێبگات، هەروەها منداڵەکە لەوانەیە تاقەتی بچێت لە چاوەڕوانکردن و ئەم چاوەڕوانیە ببێت بەرق و تووڕەبوون کاتێك کە منداڵەکە لەدایك ئەبێت، هەربۆیەشە منداڵی وا هەیە کە لەدوای لەدایکبوونی منداڵەکە ئەڵێت (بابینێرینەوە بۆ شوێنی خۆی).

باشتر وایە واز لەمنداڵەکە بهێنیت یارمەتیت بدات لە کاروباری خۆ ئامادەکردن و بەشداری بکات لەو گۆڕانانەی کە ئەبێت لەماڵەکەدا و ئاگای لێبێت کە بۆچی وا ئەکەن، بۆ ئەوەی لەهەمانکاتدا بۆی باس بکەن کە زۆرشت لەماڵەکەدا ناگۆڕێت و وەکو جاران ئەمێنێتەوە و ئەوشتانەی کە ئەم هەیەتی هەهینی خۆیەتی و شوێنی تایبەتی بۆ تەرخان بکرێت کە شتەکانی خۆی تێدا دابنێت، هەروەها بۆی باس بکرێت کە ئەو خوشکێك یان برایەکی ئەبێت کە ئەتوانێت یاری لەگەڵ بکات و ببێت بەهاوڕێی، هەروەها زۆر گرنگە کەبۆی باس بکەیت کە خۆشەویستی تۆ بۆ ئەو ناگۆڕێت و وەکو جاران ئەمێنێتەوە و تۆ ئەتوانیت هەردووکیانت وەکو یەك خۆش بووێت.

وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی منداڵەکە لەمکاتەدا نرخێکی تایبەتی هەیەو نابێت فەرامۆش بکرێت بەوەی کە ئەم پرسیارانە پەیوەندی بەمنداڵەکەوە نیە و پێویست ناکات ئەو بیزانێت، چونکە کاتێك منداڵ پرسیارێکی کرد ئەوە مانای ئەوەیە کە شتێك لەبارەیەوە ئەزانێت، بەڵام هەمووی نازانێت و سەرپشك نیە لەوەی کە ئەیزانێت و ئەیەوێت زیاتر بزانێت، جا بۆیە دایکوباوك ئەبێت وەڵامەکانیان ڕاست بێت و بگونجێت لەگەڵ ڕادەی تێگەیشتوویی منداڵەکەیان و کاتێك کە نازانن وەڵامێکی ڕاستی بدەنەوە داوا لەمنداڵەکە بکەن کە ڕاوەستێت تاکو ئەتوانن وەڵامێکی ڕاستیان بدەنەوە داوا لەمنداڵەکە بکەن کە ڕاوەستێت تاکو ئەتوانن وەڵامێکی ڕاستیان دەست ئەکەوێت لەشارەزایەکەوە.

ئەوەی گرنگە لێرەدا ئەوەیە کە لەوانەیە بەهۆی ئەم هەواڵی لەدایکبوونی منداڵە تازەیە منداڵەکەی هەندێك شتی تازە ببێت و خۆی منداڵ بکاتەوە و شەو میز بکات بەخۆیدا و هەر تاوە نا تاوێك خۆی بخاتە باوەشی دایکیەوە باشتر وایە ئاگاداری ئەم گۆڕانانە بیت و بزانیت چی ئەکەیت.

## **پرسیاری 27**

## **هەرجارێك یاریەك ئەکڕم بۆ کوڕە حەوت ساڵانەکەم، کچە پێنج ساڵانەکەشم داوای شتێك ئەکات، کە زۆرجار ناچار ئەبم بۆی بکڕم کە ئەشزانم ئەمە باش نیە چیبکەم؟**

ئەم گیروگرفتە لەتەمەنێکی زووەوە دەست پێئەکات و بۆ ماوەیەکی زۆر دایکوباوك سەغڵەت ئەکات ئەگەر هەر لەو تەمەنە زووەوە بڕیاری خۆیان نەدەن و بەشێوەیەکی ڕاست ڕەفتاری لەگەڵ نەکەن، پێدانی دیاریەك یان کڕینی شتێك بۆ منداڵێك لەمنداڵەکان ئەبێت لەسەر بناغەی هەندێك ڕاستی بێت کە پەیوەندی بەو منداڵەوە هەیە کە

شتەکە وەرئەگرێت و تەنها بۆ ڕازی کردن و خۆ دورخستنەوە نەبێت لە بۆڵەبۆڵ و گیروگرفتی منداڵەکە، کە ئەمانەیە دایکوباوك نایەوێت قسەیان لەبارەوە بکات و بەپێویستی نازانێت کە پێویستی بەدیالۆگ و قسەکردن هەیە لەبارەیانەوە لەنێوان ئەندامانی خێزانەکەدا کەچی کێ ئەکڕدرێت و بۆچی؟ جا بردنە دەرەوەی ئەم دیالۆگە بۆ ناوبازاڕ و دوکان و سەرجادە و چارەسەرکردنی لەوێ تەنها بەقازانجی منداڵەکە و سەرکەوتنی ئەو ئەگەڕێتەوە، چونکە ئەو باشتر ئەزانێت لەکوێ و کەی شەڕی خۆی ئەکات و لەکوێ دایکوباوك کەمتر بەهێزن و ئەتوانرێت وایان لێبکرێت کە بەقسەیان بکەن.

ئەگەر پێدانی دیاری و یاری لەسەر بناغەی پێویستی منداڵ بێت و ڕەچاوی تەمەن و پێگەیشتنی عەقڵی و نێرومێی منداڵان بکرێت، ئەوا پێویست بەوە ناکات کە خۆمان تووشی ئەو تیکەڵ کردنەوەی کەسایەتیی منداڵەکان بکەین و خۆشمان و منداڵەکانیش لەهەڵەی تێگەیشتنی ناڕاست ئەپارێزین.

ئەگەر پێش ئەوەی لەخۆمانەوە و بەزەوقی خۆمان دیاری و یاری بۆ منداڵەکان بکڕین، قسەیان لەگەڵ بکەین و گفتوگۆی ئەوەیان لەگەڵ بکەی کە بۆچی هەندێك یاری باش نیە و زەرەر بەخشە بەلاّم ئەگەر ئەو ئەیەوێت بیکڕێت ئەوە بڕیاری خۆیەتی و بۆی هەیە بیکڕێت، بەلاّم هەندێك یاری هەیە کە ئێمە وەکو دایکوباوك بەهیچ جۆرێك نایهێڵین کە منداڵەکەمان بیکڕێت و بێتە ماڵەکەمانەوە، چونکە ناگونجێت لەگەڵ دەستور و یاسای خێزانەکەماندا.

هەروەها ئەوەی کە حەوت ساڵانەیەك توانای بەسەردا هەیە و پێویستیەتی وەکو ئەوە نیە کە منداڵێکی چوار ساڵانە پێویستیەتی و توانای بەسەردا ئەشکێت، ئەم جیاوازیە پێویستە ڕەچاوبکرێت لەکاتی پێدانی دیاری و یاری بەمنداڵ و بۆیان باسبکرێت کە بۆچی ئەم جیاوازیە هەیە لەنێوانیاندا، بۆ ئەوەی لەڕاستی و تواناو کەسایەتی خۆیان بەڕاستی تێبگەن و لاسایی یەکتری نەکەنەوە و بزانن جیاوازن لەزۆر بارەوە و ئەم جیاوازیە بەکاربهێنرێت بۆ بەهێزکردنی پەیوەندیان و بنە بەتەواوکەری یەکتری نەك لاسایی کەرەوەی یەکتری.

ئەمانە هەمووی پێویستی بەقسەکردن و ئالۆگۆڕکردنی بیروڕا هەیە لەنێوان ئەندامانی خێزاندا و کاتی خۆی ئەوێت بۆ ئەوەی بگەنە ئەنجامێکی باش کە هەموو لایەك ڕازی بکات، بەلاّم کاتێك دایکوباوك لەخۆیەوە بڕیار ئەدات کەخۆی بەباشی ئەزانێت ئەوە پیاو ئەبێت پرسیار لەخۆی بکات کە ئایا ئەو دایکە یان باوکە یاریەکە بۆ کێ ئەکڕن؟ ئایا بۆخۆی و ڕازیبوونی خۆیەتی یان بۆ منداڵەکەیەتی؟

هەروەها کاتی هەڵبژاردنی دیاری بۆ منداڵ ئەبێت بەئاقلانە هەڵبژێردرێت پێویست ناکات خێزان هەرلەخۆیەوە و لەبەرئەوەی دایك یان باوك زەوقی هەیە و دڵی خۆشە ئیتر بێتە ماڵەوە و هەندێك دیاری بۆ منداڵەکان هێنابێت و منداڵانان نەزان ئەمە بۆچی، لەوانەیە ئەمە جارێك ڕووبدات و شتێکی خۆش بێت بۆ منداڵەکان، بەلاّم نابێت ببێت بەکارێکی هەمیشەیی و زۆرجار دووبارە بکرێتەوە، جا بۆیە باشتراویە ئەم دیاری و یاریانە لەکاتی جەژنی لەدایکبوون و سەری ساڵ و جەژنی نەورۆز و کاتە تایبەتیەکاندا بکڕدرێت و بدرێت بە منداڵ و چاوەڕوان کردنی منداڵ بۆ ئەم ڕۆژانە بەشێکی گرنگە لە ژیان و فێری چاوەڕوانی و دان بەخۆداگرتن یان ئەکات و فێرئەبن کە هەرشتە کات و شوێنی خۆی هەیە، جەژنی لەدایکبوون تەنها بۆ شیرینی خواردن و دیاری نیە و منداڵ زۆر شتی تری لێوە فێرئەبێت.

کەواتە ئەگەر بمانەوێت منداڵ فێری ئەوە بکەین کە لەمانای شت وەرگرتن تێبگات ئەبێت هەرلەزووەوە فێری ئەوەی بکەین کە ئەو کەسێکە جیاوازە لەکەسانی تر و پێویست ناکات هەموو شتێك کەوەربئەگرێت و بۆی ئەکرێت وەکو کەسانی تربێت و دایکوباوك نابێت گوێ بداتە ئەو لەقەفرتێ و بۆڵەبۆڵەی ئەیکات بۆ ئەوەی بەناهەق شتی دەستکەوێت ئەوەت لەبیرنەچێت کەهەموو کات منداڵەکەت تاقیتئەکاتەوە و ئەیەوێت بزانێت تاکو کوێ بۆی هەیە دەستدرێژی بکاتەسەر مافی ئەوانەی دەوروبەری، منداڵ ئەبێت ئەوە بزانێت کە وەرگرتنی شتێك یان دیاریەك لەبەرئەوەیە کە شتێکی کردووە کەبەلای دایکوباوك و کۆمەڵەوە باشە و لەبەرئەوەیە کە سوپاس ئەکرێت بە دیاریەك جا ئەگەر براکەی یان خوشکەکەی ئەمەی نەکردبوو ئەوا پێویست ناکات کە درۆی لەگەڵ بکەین و وێنەی ڕاستی ژیانی بۆ بگۆڕین و بەدرۆوە ئەم جیاوازیە بشارینەوە و سوپاسی درۆی بکەین، بەهۆی مامەڵەیەکی ڕاستەوە منداڵەکە زۆرتر شت فێرئەبێت لەژیانیدا وەك لەوەی بەهۆی دیاریەکەوە وای لێبکەیت کە بۆڵەبۆڵ نەکات، گرنگە کە بۆی بسەلمێنیت کەتۆ ئەوت خۆش ئەوێت و ئەو کەسی دووەم نیە.

## خۆناسین

کاتێك کە منداڵ تەمەنی ئەگاتە دەوروبەری دووساڵی، ئیتر دەست ئەکات بەوەی خۆی بناسێت ئەمە زیاتر قوڵئەبێتەوە و وەکو کەسێك لەتەمەنی (3-4) ساڵیدا ڕوویەکی کۆمەڵایەتی وەرئەگرێت.

منداڵ لەدایك نابێت بەو هەستەوەی کە ئەم کێیە، لەپێشەوە مرۆڤ نازانێت کە ئایا خۆشەویست ئەبێت لەلای خەڵکی، یاخود چ هەست و نەستێکە ئەبێت بەرامبەری؟ ئایا لەخۆیان ڕازی ئەبن یان نا؟..... هتد، ئەمانەو زۆرشتی تر کە پەیوەندی بەخۆیەتیەوە هەیە پێویستە فێرببێت، هەرهەمان شتە کەکار ئەکاتەسەر ڕازی بوون و ژیانی ئاسودەیمان، ئەگەر خۆمان فێربکەین کە لەخۆمان بگەین و خۆمان قبوڵ بکەین وەکو هەین، ئەوا ئیحتمال زیاترە کە زیاتر پێشکەوین و مرۆڤێکی مێشك و هەست ساغ دەرچین، کە ئەتواننی توانای خۆمان بەشێوەیەکی کۆنستروکتیڤ بەکاربهێنین بۆ چارەسەرکردنی ئەو تەنگوچەڵەمانەی دێنە ڕێگامان، بەلاّم ئەگەر خۆمان فێربکەین و فێربکرێین کە ڕقمان لەخۆمان بێتەوە و هەست بەسەر لێشێواوی بکەین و هەستی گوناهباری و شەرمەزاریمان تێدا چەسپێندرابێت و بێزمان لەخۆمان بێتەوە، ئەوە ژیان زۆر ناخۆش ئەبێت بۆ مان.

منداڵەکەت پێویستی بەوەهەیە کەلەخۆی و ژیانی خۆی و دەوروبەری ڕازی بێت و پێویستی بەوەهەیە کەببێت بەکەسێکی بڕوابەخۆ بوو کە قبوڵی ڕووە بەهێز و بێهێزەکانی خۆی بکات، بەبێ ئەوەی خۆی بەرز یان نزم بکاتەوە و بتوانێ بەبڕوایەکی بەهێزەوە بەرەنگاری ژیان ببێت، بۆ ئەوەی ئەمە بکات پێویستە ئەوەندە بەهێزبێت و توانای ئەوەی هەبێت کە ڕاستگۆبێت لەگەڵ خۆی و خەڵکیدا، پێویستە توانای ئەوەی هەبێت کە بزانێت کەی و چۆن ئەتوانێت پێشبکەوێت و ئەوەندە دڵنیا بێت لەخۆی کە بتوانێت گوێ لە ڕەخنەبگرێت، بەبێ ئەوەی هەست بەوە بکات کە پێویستە بەرگری لەخۆی بکات یان بەخۆی بەژێر کەوتوو بزانێت، کەواتە پێویستە بزانێت کەخۆی کێیە و خۆی بناسێت، ئەو تواناییانەی هەیەتی لەکات و شوێنی خۆیدا بەکاریان بهێنێت، جا چۆن منداڵەکەت ئەتوانێت ئەم ڕەوشتانە فێرببێت و پێشیان بخات ئەگەڕێتەوە بۆ ئەم تەمەنەی ژیان (3-5) ساڵی و ئەو تاقیکردنەوانەی لەژیاندا

فێریان ئەبێت، منداڵ پێویستە هەست بەوە بکات کەڕێزی ئەگیرێت و ڕێزی تایبەتی خۆی هەیە، خۆی هەوڵ ئەدات وەکو خۆی بێت و هەوڵ نادات وابێت وەکو خەڵکی ئەیانەوێت، لەپێشدا باسی ئەوەمانکرد کە منداڵەکە پێویستە هەست بەدڵنیایی بکات لەو کەسانەی کە نزیکن لێیەوە، ئەمە بناغەیەکی بەهێزی کەسایەتی منداڵە لەماڵەوە و لێرەوە ئەم دڵنیاییە تەشەنە ئەکات بۆناو کۆمەڵ کە پێویستە منداڵەکە لەناویدا، کەواتە لەناو کۆمەڵدا هەست بەسەربەستی بکات وتکە کەسایەتیی قبوڵ بکرێت و دەست نەخەنە ڕێگای پێشکەوتنیەوە.

لەسەر ڕۆشنایی ئەم زانیاریانە، دایکوباوك ئەتوانن یارمەتی منداڵەکەیان بدەن کە لەخۆی ڕازی بێت و خۆی قبوڵ بکات وەکو خۆی، وێنەی یەکەمی (خۆ)ی منداڵ لەوەوە دروست ئەبێت کە دەوروبەر چۆن سەیری ئەکەن، لەبەرئەوە ئەتوانرێت وێنەیەکی پۆزەتیڤ بدرێت بەمنداڵەکە هەر لەئێستاوە، لەبەرئەوە منداڵەکە پێویستی بەوە هەیە کەیارمەتی بدرێت کە خۆی خۆشبووێت و واسەیری خۆی بکات وەکو مرۆڤێکی پۆزەتیڤ و ڕووخۆش و یارمەتیدەر کە کەسانی دەوروبەر پێیان خۆشە کە پەیوەندیان هەبێت لەگەڵیداو لەبوونی لەناویاندا هەست بەخۆیەکی ڕۆحی بکەن.

ئەمە مانای ئەوەیە کە ستایش کردنی منداڵەکە ئەبێت بەشێوەیەکی ڕاست و لەسەر بناغەیەکی ڕاستی بێت و دایکوباوك دوورکەونەوە لەبریندار کردنی کەسایەتیی منداڵەکە کاتێك ئەیانەوێت ڕەخنە لەڕەفتارێکی منداڵەکە بگرن، وەکو (چەند منداڵێکی خراپی) یان (بێئەقڵیت) لەجیاتی ئەوەی کە بڵێت (خراپ بوو کەوات کرد) هەروەها ئەمە مانای ئەوەیە کە تۆ یارمەتی منداڵەکە ئەدەیت کە هەستونەستەکانی خۆی قبوڵ بکات لەجیاتی ئەوەی بیترسێنێت، کە ئەم ترساندنە وای لێئەکات هەستەکانی شارێتەوە و تووشی شەرمەزاری ئەکات و خۆی بەخەتابار ئەزانێت هەرکاتێك ئاشکرابوون، لەم هەستانە هەستی تووڕەبوون، ترس، سەرلێشێواوی.

## تورەبوون

بابڵێین کەمنداڵەکەت دانیشتووە و یاری ئەکات و تۆ ئەتەوێت بێت جلەکانی لەبەربکات و لەگەڵتدا بێت بۆ بازاڕ بەڵام ئەو حەزئەکات زیاتر یاری بکات و نایەوێت واز لەیاریەکانی بهێنێت، بۆ زۆری لێئەکەیت و ئەویش زیاتر بەرەنگاری تۆ ئەبێتەوە و ڕقی هەڵئەسێت، تۆش زیاتر تورە ئەبێت، ئەنجام دایکێکی تورە منداڵێکی تورە بەدوای خۆیدا ڕائەکێشێت بۆ بازاڕ، بەمە دایکەکە بەمنداڵەکەی ئەڵێت کە ئەو (دایکەکە) ئێستا چۆن بیر لەمنداڵەکەی ئەکاتەوە بەبێ ئەوەی قسەی پێ بڵێت، بانزیکتر سەیری ئەم ڕووداوە بکەیت و بزانین چی ڕوویدا؟

منداڵەکە کاتێکی خۆشی هەیە لەگەڵ یاریەکەیدا و ئەمە کاتێکی بەنرخە بۆی و شتی لێوە فێرئەبێت و ئەیەوێت بگاتە ئەنجامێك و نایەوێت وازی لێبهێنێت، جا ئەگەر حەزیش نەکات لەگەڵتدا بێت بۆ بازاڕ ئەوە ئەوەندەی تر بیانوی بەدەستەوەیە کە تووڕەببێت، لەبەرئەوە تورە بوونەکەی ئاساییە، هەروەکو چۆن تورەبونەکەی تۆش ئاساییە، تۆ ئەتەوێت هەندێك کار هەیە لەو ڕۆژەدا بیکەیت و پێویستە فریای کارەکانت بکەویت لەو ڕۆژەدا کە یەکێکیان ئەوەیە کە بچیت بۆ بازاڕ، هەرچەندە کەتۆ حەزیش ناکەیت کە بچیت بۆ بازاڕ بەلام تۆ ئەزانیت کە پێویستە، بەڵام منداڵەکە

ئەوە نازانێت و ئاگای لەمە نیە و بەلاشیەوە گرنگ نیە، لەبەرئەوە تۆ تورە ئەبیت کاتێك منداڵەکە بەقسەت ناکات ئیتر ئێوە تورە ئەبن لەیەکتری و دڵتان لەیەکتری ئەرەنجێت.

لەراستیدا هیچتان (هەڵە) نین، بەڵکو دوو خواستی جیاواز دروست بووە و تەنگوچەڵەمەی (خواست) هەیە لەنێوانتاندا و پێویست ناکات منداڵەکە هەست بەخراپی خۆی بکات، باشتروایە پێی بڵێیت:

( ئەزانم تۆ تورەی، منیش تورە ئەبم ئەگەر کەسێك نەهێڵێت شتێك کە پێم خۆشە بیکەم، بەلاّم مرۆڤ ناتوانێت هەموو کات ئەوە بکات کە خۆی پێیخۆشە لەبەرئەوە با هەوڵ بدەن چارێکی وا بدۆزینەوە کە بۆ هەردووکمان باش بێت، بەبیروڕای تۆ چیبکەین؟).

ئەمە نابێت بەهۆی ئەوەی کە ڕق و تورەبوونەکەی یەکسەر وون ببێت، چونکە تۆ سوری لەسەرئەوەی ئەو ئەوە بکات کەتۆ ئەتەوێت، بەلاّم تۆ بۆی دەرئەخەیت کەتۆ ئەزانیت ئەو چۆن هەست ئەکات و هەستەکانیشی ئاساییە و پێویست بەوە ناکات کەشەرم بکات، بەمە وای لێئەکەیت کە هەستەکانی خۆی قبوڵ بکات و لەدوارۆژیشدا بتوانێت کاریان لەگەڵ بکات و بەرەوپێشیان بەرێت.

پێشکەوتنی هەست و نەستی منداڵ ئەئاڵۆزێت ئەگەر تۆ قبوڵیان نەکەیت وەکو خۆی و وای تێبگەیەنیت کە ئەو (هەموو کات ئاوا ئەکات) کە ئەمە ڕاست نیە و هەموو مرۆڤێك جارجار تورە ئەبێت و ئەمیش وەکو مرۆڤ بۆی هەیە کەتورە ببێت، جا کاتێك کەتۆ وای پێئەڵێت کە ئەو هەموو کات هەروا ئەکات مانای ئەوەیە کە وای لێدێ کە هەمووکات تورە ببێت و لەگەڵ توورە بوونەکەشدا ویژدانی بریندار ببێت یان هەستونەستەکانی لەبیرخۆی بەرێتەوە و ئەوەندەی تر دڵی ناخۆش ببێت و لەژیاندا ناشاد بێت.

لەبیرخۆ بردنەوە یان شاردنەوی هەستونەست لەخۆیەوە نابێت، ئەگەر منداڵ جارجار هەستونەستەکانی دەرنەبڕێت و رشێگای نەدرێت کەچی ئەوێت بیڵێت، ئەبێت بەهۆی شڵەژاندنی هەستونەست و دروستبوونی گیروگرفت بۆی، لەوانەیە کە ببێت بە منداڵێك کە زیاد لە پێویست کۆنترۆڵی هەستونەستی خۆی ئەکات کەوای لێدێت بەلایەوە زەحمەت ئەبێت هەستونەستی خۆی وەکو خۆی ئەیەوێت دەربڕێت و هەمیشە هەستە ڕاستیەکانی خۆی بشارێتەوە و بۆ ئەمەش هەست بەویژدان برینداری بکات و شەر لەخۆی بکات و هەستەکانی بشارێتەوە بۆ ئەوەی کەس درك بەهەستە ڕاستیەکانی نەکەن.

ئەم ڕق و کینەی منداڵ دەرکەوێت یان نا منداڵەکە ئەکەوێتە بەربەرەکانێ لەنێوان ڕووی چاك و ڕووی خراپی ڕەفتارەکەی، لەملانێی ئەم دوو ڕووەدا ڕووی خراپ سەرئەکەوێت بەسەر ڕووی چاکداو منداڵەکە ناچار ئەکات کە هەمیشە هەوڵبدات ئەمە بشارێتەوە، ئەمە ئەو دیاردەیە دروست ئەکات کە زانایانی دەروونیشکەرەوە پێی ئەڵێن (کەسایەتی دووفاقە) کە بەهۆی ئەم کەسایەتیەوە بەلایەوە گران ئەبێت هاوتەریبی دروست بکات لەنێوان ڕووەکانی جیاجیای ژیانداو نەبێت بەکەسێکی تەواو.

هەروەها لەوانەیە کە نەخۆشی و ئازاری لەشیش دروست ببێت، لەبەرئەوەی پەیوەندی نێوان لەش و رۆح زۆر بەهێزە و لەیەکجیا ناکرێتەوە، نیشانەی ئەم نەخۆشیانە لەلەشدا دەرئەکەوێت وەکو ماسولکە ڕەق بوون، بێتوانایی و تورە بوونی خێرا و بەبێ هۆ و زۆر نیشانەی تر.

هەردوو دەرونشیکەرەوە و پزیشك گەیشتونەتە ئەو بڕوایەی کە هەندێك نەخۆشی لەش قورسی کـە هەنـدێك کـەس تووشی ئەبن پەیوەندی هەی بەوەی کە ناتوانن هەستەکانیان وەکو خۆی دەربېرشن و ناتوانن خۆیان قبوڵ بکـەن وەکـو خۆیان و ڕێز و نرخ بۆ خۆیان دابنێن.

کاتێك منداڵەکەت هەندێك قسەی ڕەق بەرامبەرت بـەکار دەهێنێـت وەکـو (قیـنم لێـت ئەبێتـەوە) یـان (خۆزگـە بمردیتایە) یان هەر قسەیەکی تر لەم بابەتانە، پێویست ناکات قسەکانی بەتوندی وەرگیرت و لێی تورە ببیت، چـونکە منداڵەکە بەتەواوەتی مانای ئەم وشانە نازانێت و تەنها ئەوەندەیە کە ئەویش بیستونی و ئەیانکاتەوە، کاتێك کە تـۆ ڕقت هەڵئەستێت ئەڵێت کە (چەند ڕقم لەفلاَن کەسە) ئیتر منداڵەکەش وشەکە فێرئەبێت، بەبێ ئەوەی بزانێت کە ئەم وشەیە ئەوەندە ناخۆشە و هەستونەستی خەڵکی بریندار ئەکات، منداڵەکەت بەڕاستی ڕقی لـەتۆ نیـە و ناشـیەوێت هەستی تۆ بریندار بکات، ئەوەی ئەو ئەیکات ئەوەیە کە بێدەسەلاَتی خۆی دەرئەبڕێت بـەتۆ، چـونکە تـۆ نایهێڵێـت کەشتێك بکات یان شتێکی ئەوێت و تۆ نایدەیتێ.

هەروەها کاتێك منداڵەکەت ئەڵێت (یا خوابمریت) منداڵەکە نازانێت مردن چـیە و مردوویـەکی نـەدیوە و نەیـدیوە کەسێك بمرێت، کاتێکیش وا ئەڵێت ئەیەوێت تۆ لەو کاتەدا لـەوێ نـەبیت و وازی لێبهێنیـت، ئەگـەر لـەم کاتانـەدا لەمنداڵەکەت تورە ببیت، مانای ئەوەیە کە هەستێکی گوناهباری ئەدەیت بە منداڵەکـەت کـە ئـەو لەڕاسـتیدا ئـەو خەتاباریەی نیە، کاتێك کە پێی ئەڵێیت کـە وشـەکانی نیشـانەی خراپیـەتی، ئـەوە ئـەو وائـەزانێت و ئەگاتـە ئـەو ئەنجامەی کە ئەگەر ڕقی هەڵسێت ئەوە ئەو منداڵێکی باش نیە، منداڵی باش نابێت ڕقـی دایکوبـاوکی هەڵسـێنێت بەمە وای لێدێت کەشك لەوە بکات کە بۆی هەبێت تورە ببێت و هەستی خۆی دەربڕێت کاتێك کە ئەیـەوێت شـتێك بکات کە خۆی ئەیەوێت.

هەروەها ئەگەر هەموو جارێك تورە ببێت یان بەمنداڵەکە بڵێت کە (چۆن ئەتوانیت قسەی وا بەڕووی مندا بکەیت) ئەوا منداڵەکە هەست بەناڕەوایی تۆ ئەکات و ئەبێت بەهۆی ئەوەی کە ڕێگـا لەدروسـتبوونی پەیوەندیـەکی ڕاسـت و دڵسۆز ئەگرێت لەنێوانتاندا لەئێستاو لە پاشەڕۆژیشدا و منداڵەکە شك لەوە ئەکات کـە ئـەتوانێت پەیوەنـدی ڕاسـت لەگەڵ کەسانی تریشدا ببەستێت و گومان لەتوانای خۆی بکات بۆ دروستکردنی ئەم پەیوەندیە.

هەندێك دایکوباوك سەریان سوڕ ئەمێنێت لەوەی کە پێیان بوترێت کە لێبوردنیان هەبێت بەرامبەر بەمنداڵەکانیان لەمکاتانەدا و ئەڵێن کە پێویستە بۆ منداڵەکان بسەلمێندرێت کە مرۆڤ نابێت لەهەموو شوێنێکدا هەموو شتێك بڵێت و ئەگەر ئاوا بڕوات لەدواڕۆژدا چی ڕووئەدات، ڕاستە دایکوباوك نابێت ڕێگـای منـداڵ بـدەن کەچـی ئـەڵێت بیڵێـت لەهەموو شوێنێکدا، بەلاَم پێویستە لەمنداڵەکە تێبگەن کە کاتێك دانیشتووە و یاری ئەکات و ئێمە ئەمانەوێت ئـەو یاریەکەی بەجێ بهێڵێت و کارێکی تربکات، کە تورەبوونەکەی ڕاستەوبۆی هەیە کە تورە ببێت، ئەمە وا ئـەکات کـە بتوانێـت مامەڵـە لەگـەڵ هەستونەسـتەکانی و تورەبونەکـەی خـۆی بکـات و تێبگـات کـە هەستونەسـتی تـۆش و تورەبوونەکەشت هەقە، هەروەها فێر ئەبێت کە پەیوەندی ڕاست لەسـەر تێگەیشـتنی هەستونەسـتی یـەکتری بناغـە دائەکوتێت و پێویست بەدرۆ و لەیەکتری تورە بوون ناکات.

کاتێك کە منداڵەکەت هاوار ئەکات و ئەڵێت کە من تۆم خۆشناوێت یان ڕقم لێتە، ئەتوانیت پێی بڵێیت کە ئەزانم تۆ ئێستا من خۆشناوێت، بەلاّم هەر ئەبێت بچین بۆ بازاڕ، لەوە مەترسە کەووشەی ناخۆشت بەرامبەر بەکارئەهێنێت، چونکە وردە وردە فێرئەبێت و لەشوێنی خۆیدا بەکاریان ئەهێنێت کە بەڕاست ڕقی لەشتێك ببێتەوە، هەروەها بەهەمان شێوە و ڕەفتاری لەگەڵ ئەکەیت کاتێك کە ئەڵێت (خۆزگە تۆ بمردیتایە) لێرەدا ئەتوانیت یارمەتی بدەیت کە لەمانای مردن تێبگات، لەبەرئەوەی کە مردن شتێکی کۆنکریتە، ئەتوانیت پێی بڵێیت کە ئەمە شتێکی ناخۆشە و مردن مانای ونبوونە و تۆ هەرگیز نایبینیتەوە، ئایا حەز ئەکەیت کە مردن ون ببم و ئیتر تۆ من نەبینیتەوە، باشە ئەی کێ خزمەتی تۆ بکات؟ ئەمە بەسە بۆ ئەوەی منداڵەکە تێبگات کە مانای مردن چیە و ئەویش هەرگیز حەز ناکات لەتۆ جیاببێتەوە، چونکە زۆرباش ئەزانێت کە بەبێ تۆ ناتوانێت بژی.

هەستونەست ڕۆڵێکی گرنگ ئەبینێت لە ژیانماندا، بیر گرنگە بەلاّم هەست و نەستەکانمان کە وامان لێئەکات کە لەژیان ڕازی ببین یان نا، لەبەرئەوە ئێستا کە تۆ دایکوباوکیت پێویستە زیاتر ئاگاداری هەستونەستی منداڵەکەت بیت، نەك تەنها منداڵەکەت چەند ئەزانێت و چەند زیرەك و زیت و وریاو ئاقڵە، بەڵکو گرنگی بدەیت بە پێشکەوتنی هەستونەستی و یارمەتی بدەیت بۆ پێشکەوتن و کاتی خۆتی بۆ تەرخان بکەیت.

ئەمە مانای ئەوە نیە کە گوێ نەدەیتە منداڵەکان چی ئەڵێن و چی ئەکەن بیکەن و چۆن هەستونەستی خۆیان دەرئەبڕن دەری ببڕن و دایکوباوك سەیریان بکەن، بەڵکو مانای ئەوەیە کە دەستور و یاسای ڕوون و ئاشکرایان بۆ دابنێن و بۆیان ڕوونبکەینەوە کە چۆن مرۆڤ هەستونەستی خۆی دەرئەبڕێت بۆ نموونە: ڕێگای ئەدرێت کە تووڕە ببێت و خۆی بدات بەزەویدا و لەقەفرتێی خۆی بکات، بەلاّم کاتێك دەست بەشت شکاندن ئەکات و شت فڕێ ئەدات بەژوورەکەدا ئەوە ئیتر سنوری خۆی بەجێئەهێڵێت و ڕێگای نادرێت، یاخود ئەچێت بەگژ دەوروبەرەکەیدا، بەتایبەتی کاتێك شەڕ لەگەڵ منداڵی لەخۆی بچوکتردا ئەکات و ئەیەوێت ئازاری بدات، بەهەمان شێوە ئەگەر منداڵەکە دەستی کرد بەشکاندنی یاری و شتەکانی خۆی، پێویستە تێیبگەێنین ئەگەر شتەکانی شکاند ئەوە ئێوە ناتوانن بۆی بکڕنەوە و ئەو ئەبێت بەبێ ئەو شتە بمێنێتەوە، بەلاّم ئەگەر هەوڵیدا شتی کەسانی تر بشکێنێت، ئەوە پێویستە یارمەتی بدەیت کە تێبگات کە کەسەکەی تر چۆن هەست ئەکات و تێبگات کە ڕەفتارەکەی چۆن هەستی کەسانی تر بریندار ئەکات، باشتروایە پێشەکی بۆی باسبکەیت کە ڕەفتارەکەی چ ئەنجامێکی ئەبێت و لێپرسراویەك بدەیتە دەست خۆی یان لەهەندێك کاتدا ڕێگای لێبگرێت کە ڕقەکەی ببێت بەهۆی زەرەردان لەخۆی و لەشتەکانی، بەلاّم جاری واهەیە کە تووڕەبوونەکە لەپڕێکا ڕووئەدات و زەرەرەکە تازەکەوتووە، لەبەرئەوە پێویستە فێرببێت کە تووڕەبوون شتێکەو دەربڕینی هەستی توڕەبوونەکە شتێکی تر.

هەروەها وەکو دایکوباوك پێویستە بزانێت کە تووڕەبوون سوودی نیە، ئەگەر ئەو هەست بەوە بکات کەتۆ توڕەیت لەبەرئەو کارەساتەی کە ڕوویداوە، لەوانەیە ئەویش ئەوەندەی تر توڕە ببێت و ڕووی ڕقەکەی بکاتە تۆ، منداڵەکە زیاتر و باشتر ئەم تاقیکردنەوەیەی بۆ ئەبێت بەدەرسێك ئەگەرتۆ تەنها دەست بۆ ڕەفتارەکەی ڕاکێشیت کە باش نەبووە لەبەرئەوەی ئەشکێت و کەشکاش ئیش ناکات و ئەوسا ناتوانێت بەکاری بهێنێت، ئەگەر دڵگیربوو وە دۆشداما ئەوا خێرا دڵخۆشی ئەدەیتەوە و پێی ئەڵێیت کە تۆ ئەزانیت کە ئەو توڕەیە و تۆش جاری واهەیە کە توڕە ئەبیت

بەلاَم شتەكانت فرِێ نادەیت و فێربوویت كە ئەگەر تورِە بویت چی ئەكەیت وە تۆ لەو بروایەدایت كە ئەویش رِۆژێك لە رِۆژان فێر ئەبێت دەست بەسەر تورِەبونەكەیدا بگرێت و شت فرِێ نەدات بە ژوورەكەدا، باشتروایە یارمەتی بدەیت كـە رِێگایەك بدۆزیتەوە بۆ دەربرِینی رِقەكەی و ئەتوانیت پێی بلَێیت كە ئایا ئەتوانێت بقیژێنێت بـۆ مـاوەی دوو دەقیقـە یان ئەتوانێت لەسەر یەك قاچ رِاوەستێ یان سـەرمەوقولات بـدات یـان رِابكـات بـەدەوری ژوورەكـەدا تـاكو هـیلاك ئەبێت یان ...... یان.

ئەگەر منداڵەكە گریا بۆ یاریەكەی كەشكابوو ئەوە باشتروایە یاریەكەی لابەریت و ئەگەر توانیت چاكی بكەیتەوە وە پەیمانی بدەیتێ كەبۆی چاك ئەكەیتەوە، یان ئەگەر توانیت یاریەكی تری بۆ پەیدا بكەیت بەمەرجێك پەیمان بـدات كـە ئاگاداری بێت و نەیشكێنێت، چونكە تۆ ناتوانیت هەموو جارێك یاریەك شكا بۆی بكرِیتـەوە، بـۆی بسـەلمێنیت كـە خۆی لێپرسراوی یاریەكانی خۆیەتی و ئەبێت بزانێت لەكوێ دایان ئەنێت.

## ترسی منداڵ

ئەوەی لەبارەی تورِە بوونەوە و ترا بۆ پەروەردەیەكی رِاست ئەتوانرێت بوترێـت لـەبارەی ترسـەوە و هـەمان رِەفتـار لەگەلْ منداڵەكەدا بكرێت و لەسەر هەمان دەستور رِەفتاری لەگەلْ بكەین.

كاتێك منداڵەكەت ئەلێت كە لەتاریكی ئەترسێت یان لەخێو ئەترسێت لەناو جێگاكەیدا و تۆ وەلاَمی ئەدەیتەوە كە هیچ نیە و پێویست بەترس ناكات و پێی پێئەكەنیت، منداڵەكە دەست ئەكات بەشككردن لەهەستونەستی خۆی ئـەو هەست ئەكات كە ئەترسێت و كەچی تۆ پێی ئەلێیت كە نەترسێت، ئایا هەستەكانی رِاستە یان نا، ئەگەر هەستەكانی رِاستە ئایا شەرم بكات، كەواتە لەمكاتەدا رِێگـای نادرێـت كـە سـارِێژی ترسـەكەی بكـات بەشـێوەیەكی رِاسـت و مامەڵەیان لەگەلْ بكات و بەسەریاندا سەركەوێت، بەمە وا تێئەگات كە گەورەكان نازانن و تێناگـەن كـەترس چـیە و ئەوان ناترسن، ئەوەی ئەترسێت تەنها ئەمە و شتێك هەیە لەئەمدا كە لەگەورەكاندا نیە و ئەبێت ئەمە هەڵە بێت.

منداڵ پێویستی بەوە هەیە كە گوێی لێبگریت كاتێك باسی ترسەكەی ئەكات، پێویستی بەوە هەیە كـە تـۆ بلێیـت (منیش هەروا هەستم ئەكرد كە منداڵ بووم، هەرچەندە هەتاكو ئێسـتا خێوێكیشـم نـەدیوە لەناوجێگاكەمـدا، دوای ئەوە لەگەلْ منداڵەكەدا سەیری جێگاكە بكەن و پرسیاری لێبكەیت كە ئایا ئەیەوێت لامپایـەك داگیرسـێنێت بەشـەو دەرگای ژوری نوستنەكەی كراوە بێت، تۆش كە منداڵ بویت وات ئەكرد، ئیتر نە ئەترسایت.

ئێمەی گەورە ئەبێت ئەوەمان لەبیرنەچێت كە منداڵی بچوك ژیان و جیهان بەشێكی ترسـناك و هەرِەشـاوی ئـەبینن منداڵ ئەزانن كە چەند بچكۆلە و بێهێزن و چەند پێویستیان بەدەورپشتیان هەیە، لەبەرئەوە ئەترسن لەبریندارى لەش و ونبونی دایكوباوك و ئەترسن لەتەنهایی، ئەمانە هەمووی شتی ناخۆشە بـۆ منداڵەكـە و لێیـان ئەترسـێت، بـەلاَم منداڵ ناتوانێت بەشێوەیەكی رِاستەوخۆ هەستەكانی دەربرِێت و باسیان بكات و جاری واش هەیە كە هەر بەتـەواوەتی تێیان ناگات، لەبەرئەوە ترسی ونبونی پارچەكانی لەشی و بریندابونیان بەشێوەی خەو و خەیاڵ و خێو و دێو و درنـج دەرئەبرِێت و ترسی لەدەستچونی دایكوباوكیان لە ترسی تەنهایی و بێكەسی شەودا خۆی ئەنوێنێت، وەكو دایكوباوك پێویستە دان بەوەدا بنێین كە ترسی منداڵ لە برینداربوونی لەشولاری بناغەكەی لەترسـی منداڵـەوە هـاتووە لەئێمـە

ئەمە ڕاستیەکی ناخۆشە و زۆرجار دایکوباوك نایانەوێت دانی پێدابنێن، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە هەرچەندە دایکوباوك نایانەوێت منداڵەکەیان ئازار بدەن و خۆشیان ئەوێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕووئەدات کە ئەقیژێنن بەسەریدا و قوڵی ئەگرن و لێی توڕەئەبن بۆ ئەوەی بەقسەیان بکەن، جالەبەر هەر هۆیەك بێت، ئەم توڕەبوونانە بۆ منداڵ زۆر ترسناکە و ئەگەر پێوانەی قەبارەی خۆت بکەیت لەگەڵ قەبارەی منداڵەکەت ئەوسا بۆت دەرئەکەوێت کە چەند سامناکە کە مرۆڤێکی وا بەقەبارە گەورەتر لەخۆت بنەڕێنێت بەسەرتدا.

جائەگەر ڕقت لەمنداڵەکەت هەڵسێت و شەڕی لەگەڵ بکەیت، ئەوە ئەوەندەی تر تۆ بەترسناك ئەزانێت، لەهەمانکاتدا ئەم منداڵە ناتوانێت ئەم وێنەیە لەگەڵ ئەو وێنەیە یەکبخات کەتۆ کەسێکی خۆشئەوێت و ئەو پێویستی بەتۆ هەیە و چۆن ئەبێت هەمان کەس ترسناکیش بێت و خۆشیشی بوێت، تۆ زۆربەی کات ئەوت خۆشئەوێت و هەرچیەکی بوێت زۆرجار بۆی ئەکەیت و زۆرجار بۆت دەرخستووە کە تۆ لەترس و ناخۆشی ئەیپارێزیت، ئەمە بۆ ئەو گرانە تێیبگات و ڕاستی لێتێك ئەچێت و تووشی ترس و شڵەژان ئەبێت.

جا لەبەرئەوەیە کە ئەو ترسەی خۆی ئەخاتەسەر شتی خەیاڵاوی و دێو و درنج، چونکە ئەو ئەزانێت کە بۆی هەیە لەمانە بترسێت، هەر بۆیەشە ئەمانە بەکارئەهێنێت بۆ ئەوەی بەسەر ترسەکەیدا سەرکەوێت، ئەمە مانای ئەوە نیە تۆ وەکو دایکوباوك خۆت بەخەتابار دابنێیت و سنور بۆ منداڵەکەت دانەنێیت لەکاتی پێویستداو لەشتی ترسناك نەیپارێزێت، ئەمە بەشێکە لەژیان و گرنگە ئەم ڕاستیە بزانێت کە منداڵەکەت چۆن بیرئەکاتەوە.

هەروەها زۆرشتی تر هەن کە ئەبن بەهۆی ترساندنی منداڵەکەت، تەلەفیزیۆن وێنەی ناشیرین و حکایەتی ترسناك دەنگی بەرز و لەپڕی کەسانێك کە منداڵەکە لێیان ئەترسێت، کەواتە دایکوباوك ئەتوانن یارمەتی منداڵەکەیان بدەن بەوەی بزانن منداڵەکەیان لەچی ئەترسێت و ڕێگای پێشکەوتنی ئاسایی منداڵەکە نەگرن.

ڕێگا بە منداڵەکەت بدە کە باسی هەستی ترسەکەی بکات و وای لێ مەکە کە شەرم لەخۆی بکات، گوێگرتن لەمنداڵ گرنگە بەتایبەتی لەمکاتەدا کە ئەیەوێت سەرپشك بێت لەڕاستی هەستەکانی، ئەمە یارمەتیەکی زۆرە بۆ منداڵەکە، بەڵام مانای ئەوە نیە کە لەترسەکەی ڕزگار ئەبێت.

ئەگەر منداڵەکەت لەشتێك ئەترسێت کە ئەتوانرێت بپارێزێت لەو شتە ئەوە باشتروایە کە بیپارێزیت بۆ ماوەیەك و هەوڵبدەیت لەو ماوەیەدا بزانیت بۆچی؟

ئەگەر منداڵەکەت ترسا لەوەی کە دایکوباوکی لەدەست بچێت یان لێیان جیاببێتەوە، ئەوە پێویستە بگەڕێیت بەدوای هۆی ترسەکەدا و بزانیت چۆن دروستبووە، چونکە منداڵێك کە لەخێزانێکی ئاسایی و پڕ ئاسودەدا گەورە بوبێت پێویست ناکات کە بترسێت لەوەی شتی ناخۆش ڕووبدات، کاتێك ئەو خۆی لەگەڵ تۆدا بەسەرپشك بزانێت ئیتر بیر لەهەستی ترسناك و ڕووداوی ناخۆش و لەدەستچوونی تۆ ناکاتەوە، ئەگەر منداڵەکەت ئەو هەستانەی تێدا دروست بوو بوو، لەوانەیە لەبەرئەوە ئەوەبێت کە ئێوە بەبێ ئەوەی بەخۆتان بزانن یان بیر لەبوونی منداڵەکە بکەنەوە قسەو باسی واتان کردبێت کە بوبێت بەهۆی ناخۆشی بۆ منداڵەکە، لەوانەیە ڕۆژێك لەڕۆژان وتبێت ئەگەر وانەکەیت ئیتر من دایکی تۆ نیم، یان ئەمجارە وابکەیت ئیتر ئەڕۆم لێرە، یان ئیتر تۆم خۆشناوێت، ئەم قسانە هەرچەند تۆ بەڕاستت نیە و ناتەوێت بەڕاستی منداڵەکە بترسێنیت، بەڵام ئەو هەر بیریان لێئەکاتەوە و ئەبێت بەمایەی غەم بۆی.

هۆیەکی سەرەکی ترسی منداڵ ئەوەیە کە منداڵەکە هەستی بەناکۆکی نێوان دایکوباوك کردووە و ئەزانێت کە دەنگە دەنگەکەیان ئەبێت بەهۆی ئەوەی یەکێکیان هەر بەجێی ئەهێڵن و ئەم ئەو یەکەیانی لەدەست ئەچێت.

جا بەلای ئەوەوە گرنگ نیە کامیان بێت، گرنگ ئەوەیە کە ئەم ژیانەی لێتێك ئەچێت و خەتاکەشی ئەخاتەسەر خۆی، لەبەرئەوە ترسی لێئەنیشێت و هەوڵ ئەدات کە ترسەکەی بشارێتەوە و کاری ئەبێت بەچاودێری کردنی پەیوەندی نێوان دایکوباوکی، جا بۆیە مرۆڤ بەئاسانی ئەتوانێت بزانێت کە بۆچی منداڵەکەی واهەست ئەکات لێرەدا تەنها چارێك بۆ ئەمە ئەگەر بکرێت دروستکردنی پەیوەندیەکی ڕاست و ژیانێکی ئاسودەیە لەناو خێزانەکەدا، ئەگینا ژیانی ئەو منداڵە ئەبێت بەژیانی ئەوانەی کە دەروونناس و پزیشکی دەرونی ئەڵێن کە (کەسانی واهەیە کە ترس هەموو ژیانی داگیرکردون و ترس و پەژارە و خەفەت هەمیشە بەشێك لەژیانیان، هەرچەندە کە ترسێکی کۆنکرێتیش نەبێت، بەلاّم ئەوان لەوە ئەترسن کە ڕووبدات و لەوانەیە کە خۆیان و دەوروبەریش تووشی کارەساتی جگەربڕبکەن.

باوکان زیاتر ترس قبوڵ ئەکەن لە کچەکانیان وەکو لە کوڕەکانیان، چونکە باوکان ئەیانەوێت کە کوڕەکانیان ئازاو چاونەترس بن و شانازی بە ئازایەتی خۆیانەوە بکەن، بەلاّم مرۆڤ ناتوانێت داوا لە منداڵێکی بچوك بکات کە وەکو گەورەیەك هەست بکات پێشئەوەی ئەو منداڵە خۆی ناسیبێت، کەواتە پێویستە منداڵەکە لەپێشدا دان بەترسی خۆیدا بنێت و ترسەکەی قبوڵ بکات و لەوێوە یارمەتی بدەیت کە بەسەریدا سەرکەوێت، وە لەبەرئەوەی کە مرۆڤ جیاوازە لەیەکتری و تواناو کەسایەتیی جیاوازیان هەیە، هەروەها منداڵیش جیاوازن و توانا و کەسایەتیی جیاوازیان هەیە و هەر منداڵەی لەشتێك ئەترسێت و هەر منداڵەش بەشێوەیەکی جیاواز چاری ئەم ترسە ئەکات و ئەبێت یارمەتیەکانیش جیاواز بن، بەیارمەتی تۆ منداڵەکەت ئەتوانێت دان بەترسەکەیدا بنێت و لەترسەکەی بگات، ئەوسا دەسەلاّتی ترسەکە بەسەریدا کەم ئەبێتەوە، ڕوونکردنەوەیەکی ئەوەی کە چۆن ترس ئەوەندە بەتوندی بەسەرماندا زاڵ ئەبێت، ئەوەیە کە ئێمە ناتوانین دەستی بەسەردا بگرین و ترسەکە بەئاسانی بەسەرماندا زاڵ ئەبێت، لەبەرئەوەی ئێمە لەخودی ترسەکە ئەترسین، بەلاّم کاتێك کە دان بەوەدا ئەنێین کە ئەترسین لەجیاتی ئەوەی ئینکاری بکەین و خۆمان وا پیشانبدەین کە ناترسین، ئەبینین کە ئەتوانین بەسەریدا سەرکەوین، چونکە ترس شتێکی ئاساییە بەرامبەر ئەو شتانەی کە تێیانناگەین یان ناتوانین خۆمانی لێ بپارێزین، جا لەبەرئەوە هەرچەندە لەبارەی ترسەکەوە بزانین ئەوە کەمتر لێی ئەترسین، تۆ ئەتوانیت یارمەتی منداڵەکەت بدەیت بەوەی کە بۆی باسکەیت کە ترسەکەی لەشوێنی خۆیدایە و شتێکی ئاساییە و پێویست بەوە ناکات شەرم لەخۆی بکات و هەموو مرۆڤێك لەشتێك ئەترسێی و بەشێوەیەك فێر ئەبێت کەبەسەریدا سەرکەوێت و کاتێکی خۆی ئەوێت بۆ ئەمەو تۆش کە منداڵ بویت هەروەکو ئەم ترساویت.

**غەمباری**

تاقیکردنەوەیەکی گرانی تر کە منداڵ پێویستە فێری ببێت، ئەوەیە کە هەست بەغەمباری بکات و بزانێت چۆن مامەڵەی لەگەڵ ئەکات، کاتێك منداڵێکی بچوك غەمبار ئەبێت، شتێکی ئاساییە کە بگری، چونکە گریان

شێوەیەکی کاریگەرە بۆ دەربڕینی هەستونەستەکانی مرۆڤ و مرۆڤ هەست بەلەش سوکیەك ئەکات دوای گریانەکە، بەلاّم ئەگەر منداڵ گوێی لەوە بێت (خۆتۆ منداڵ نیت و لوشمە لوشم ئەگریت، یاخود شەرم ناکەیت خۆتۆ گەورەیت) یاخود (گریان بۆ پیاو نەهاتووە) و زۆریتر لەم قسانە، ئەوا ناچار ئەکرێت کە هەستەکانی بشارێتەوە و لەبیرخۆیان بەریتەوە و واپێشان بدات کە غەمبار نیە، مرۆڤ نایەوێت کە منداڵەکەی هەر لەخۆیەوە دەست بکات بەگریان کاتێك شتێکی بۆ نەچووەسەر، بەڵکو مرۆڤ ئەیەوێت کە منداڵەکەی بتوانێت هەستونەستی خۆی دەربڕێت کاتێك کە خەفەتبار و دڵشکاوە و بزانێت کە پێویست بەشەرم ناکات، پێشەکەوتنی ڕاستی هەستونەستی منداڵ مانای ئەوەیە کە منداڵەکە بۆی هەبێت بگری هەروەکو چۆن بۆی هەیە کە پێ بکەنێت بەپێی ئەو بارودۆخەی کەتێیدایە.

هەستی منداڵ زۆر زوو ئەگۆڕێت، ئێستا پێئەکەنێت و ساتێکیتر غەمبارە و دەست ئەکات بەگریان و لەپڕێکدا ژیر ئەبێتەوە و ئیتر بەم شێوەیە لەوانەیە کاتێکی باش بەسەر بەرێت بەبێ ئەوەی دایکوباوك بزانن بۆچی، ئەمە لەبەرئەوەیە کە منداڵ ناتوانێت وەکو گەورەیەك دەست بەسەر هەست و نەستەکانیدا بگرێت و بیانشارێتەوە، هەرچەندە ئێمە وەکو گەورەیەك واهەست ئەکەین کە هەستەکانی بەڕێژەیەکی گونجاو نیە لەچاو بارودۆخەکەدا و ئەو هەڵەیە ئەکەین و پێی ئەڵێین کە (جاخۆ ئەوەندە ترسناك نەبوو، یاخود جاچی بوو خۆ نەمردی، و زۆریتر لەم قسانە کەبەلای منداڵەکەوە ڕاست نیە و ئەو هەستەکەی هەرچییەك بێت لەناخی دڵیەوە هاتووە و بۆ ئەو ڕاستە و درۆ ئەکات.

## گەلەکۆمەکێ

لەفەرهەنگی خاڵدا واهاتووە (قسەکردن بەیەك و کۆبونەوەی چەند کەسێك لەیەکێك یان چەند کەسێك بەگژداچوون) کاتێك کەیەکێك یان گروپێك جار لەدوای جار دووچاری ڕەفتاری نالەباری دەرونی و گیانی ئەبن، لەلایەن کەسێك یان گروپێکەوە ئەوە پێیئەوترێت (گەلەکۆمەکێ).

ئەم دیاردەیە هەر لەکۆنەوە هەبووە و شتێکی تازە نیە، بەلاّم لەسالانی 1970 وە گرنگی زیاتری پێدراوە و زانیاری لەبارەیەوە کۆکراوەتەوە، بەتایبەتی لە وولاتانی ئەسکەندەناڤی، هەروەها لەدوای ساڵەکانی 1980وە لەیابان و ئنگلستانیش گرنگی پێدراوە.

ئەوەی ئەبێت لێرەدا بیلێین ئەوەیە کە: کاتێك کە دووکەسی وەکو یەك بەهێز بەیەکدا ئەچن و تووشی ئاژاوە ئەبن ئەمە پێی ناوترێت (گەلەکۆمەکێ) بەڵکو کاتێك ناهاوسەنگیەك هەبێت لەنێوانیاندا ئەوا پێی ئەوترێت (گەلەکۆمەکێ).

لەو پشکنینانەی کە هەتاکو ئێستا کراوە دەرکەوتووە کە یەك لەحەوتی قوتابیان بەلای کەمەوە هەفتەی یەکجار تووشی ئەم ناخۆشیە دێن، هەروەها دەرکەوتووە کە منداڵانی بچوك و بێهێز زیاتر توشی ئەم ناخۆشیە دێن وەك قوتابیانی مامناوەنجی، شتێکی تر کە لەم پشکنینانە دەرکەوتووە ئەوەیە کوڕان زیاتر تووشی گەلەکۆمەکێ دێن وەك لەکچان، ئەمە ئەگەر باسی گەلەکۆمەکێی ڕاستەوخۆ بکەین، چونکە شکی تیدانیە کە کچان زیاتر تووشی گەلەکۆمەکێی ناڕاستەوخۆ ئەبن، وەکو وەلاوەخستنی کۆمەلاّیەتی و قسەلەگەڵ نەکردن و پەناگوێخستن.

## مامۆستا چی ئەکەن و دایکوباوك چەند ئەزانن؟

لەسەدا (040) منداڵانی پۆلەکانی یەك تا سێ و لەسەدا (65)ی منداڵانی پۆلی چوار تا شەش ئەڵێن کە (تەنها جارێك یان قەد مامۆستا شتێك ناکەن بۆئەوەی ئەم ڕەفتارە بوەستێنن، ئەمە لەهەندێك قوتابخانەدا وایە، بەڵام قوتابخانەی وا هەیە کە کارێکی باش ئەکات بۆ نەهێشتنی گەلەکۆمەکێ).

لەسەدا (65)ی قوتابییەکان ئەڵێن کە کەسێکی گەورە لە ماڵەوە جارێك لەجاران باسی ئەمەی بۆکردوون، ئەمە ئەوە ئەگەێنێت کە (دایکوباوکی ئەمجۆرە قوتابیانە زۆر کەم لەمبارەیەوە ئەزانن).

## شێوەی دەرەوەی لەشولار چ ڕۆڵێك ئەبینێت؟

ئەگەر داوا لەمنداڵان بکەین کە هۆیەکانی گەلەکۆمەکێمان بۆ ڕوونبکەنەوە لەوانەیە ئەمانەی خوارەوە بڵێن:
(قەڵەوە، سورە، ڕەشە، عەینەکی لەچاوە، جلی سەیر لەبەرئەکات، زمانی جیاوازە، چڵمنە، یاخود هەرهۆیەکی تر) هەرچەندە لەپشنکینی دوو گروپدا دەرکەوتووە کە ئەمە ڕاست نیە و ئەوکەسانەی کە تووشی گەلەکۆمەکێ ئەبن یان گەلەکۆمەکێ ئەکەن زۆر جیاوازن نین لەکەسانی تر، ئەمە بۆ چی وایە؟ لە پشکنینەکەدا دەرکەوتووە کە لە 75 لەسەدا لەم کەسانە خۆیان جیاوازیەك یان زیاتریان هەیە لەکەسانی تر، لەبەرئەمە، ئەوەی بەدوای جیاوازیدا بگەڕێت لە کەسێکی تردا ئەوە بەئاسانی ئەتوانێت ئەو جیاوازیە بدۆزێتەوە و بەوهۆیەوە بیچەوسێنێتەوە و بەمەش بۆ چونەکەی ڕاست دەرئەچێت و خۆی بەڕاست ئەزانێت، کەواتە ئەمە ئەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە بڵێین:
شێوەی دەرەوەی لەشولار لەوە ئەچێت کە هۆی (گەلەکۆمەکێ) بێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە وانیە هەرچەندە هەندێکجار وایە.

## نیشانەکانی ئەوکەسانەی گەلەکۆمەکییان لێئەکرێت چین؟

هەموو ئەو پشکنینانەی کە هەتاکو ئێستا کراون، شێوەیەکی تایبەتی ئەدەن بەم منداڵانە، ئەم منداڵانە زیاتر ترسنۆکن و لەخۆیان دڵنیا نین، زۆربەی کات خۆیان دوورە پەرێز ئەگرن و هەستیان ناسکە و کەم قسەن، کاتێك کە قوتابیانی تر شەڕیان پێئەفرۆشن، ئەمان دەست ئەکەن بەگریان و خۆیان ئەکێشنەدواوە، ئەمانە بەچاوێکی نزم سەیری خۆیان ئەکەن، هەست بەکەمی ئەکەن، خۆیان بەبێئەقڵ و ناشیرین ئەزانن، هەست ئەکەن کە تەنها و بەجێماون لە قوتابخانەدا، زۆرجار ئەمانە تەنها یەك هاوڕێشیان نیە، ئەمانە هەندێکجار تووڕەت و ڕقی خەڵکی هەڵئەسێنن، ئەمجۆرە منداڵانە پێیان ئەوترێت منداڵی (گەلەکۆمەکێ لێکراوی پاسیڤ).

هەندێك پشکنین و زانستی وای دەرخستووە کە منداڵی گەلەکۆمەکێ لێکراو بەتایبەتی کوڕان پەیوەندیەکی نزیکتریان هەیە لەگەڵ دایکوباوکیاندا وەك لە منداڵانی تر، ئەم پەیوەندیە لەوانەیە بەهۆی گەلەکۆمەکیەکەوە بێت

یــان بوبێــت بــەهۆی ئــەوەی منداڵەکــە گەلەکۆمــەکێی لێبکرێــت بــەهۆی دەستبەســەرداگرتنی دایکوبــاوك بەسەر منداڵەکەدا.

شێوەیەکی تر هەیە کە کەسانێکن کە دەوروبەر گەلەکۆمەکێیان لێئەکات ئەمانە کەسێکن کە دەوروبەر تورەئەکەن، ئەمانە کەمترن لەگروپی یەکەم، ئەمجۆرە قوتابیانە بەشێوەیەکی گشــتی نــاتوانن تــەرکیز بکــەن و ئــاژاوەی دەرونیــان هەیەو بەئاسانی ئاژاوە و ناخۆشی لەدەوروبەریان دروست ئەبێت، ئەمــەش بــەهۆی ئــەو مزاجــە ڕەقــەی هەیانــە کــە هەندێکجار ئەبێت بەهۆی ئەوەی کە لەگەڵ هەموو پۆلەکەشدا ناخۆشیان بۆ دروست ببێت.

لەناو کوڕاندا بەخۆوەیی و لاوازی ڕۆڵێکی گرنگ ئەبینێت لەمبارەیــەوە، بــەلاّم ئــەوە مانــای ئــەوە نیــە کــە هــەر منداڵێکی بەهێز گەلەکۆمەکێ، لەخەڵکی ئەکات و هەر منداڵێکی بێهێز گەلەکۆمەکێ قبوڵ ئەکات، بــەڵکو جــاری واهەیە کە پێچەوانەکەشی ڕاستەو منداڵی بێهێز و بێتوانا ئەیەوێت گەلەکۆمەکێ لە هاوڕێکانی بکات.

## نیشانەکانی گەلەکۆمەکێکەر چین؟

نیشانەیەکی دیاری ئەم جۆرە منداڵانە پێداهەڵچونیانە بەهاوڕێکانیانــدا، ئــەم پێــدا هەڵچــونە ئــەتوانین بڵــێین کــە بەشێکی لەوەسفی ئەم قوتابیانە، ئەمانە زۆرجار بەگژ دایکوباوك و مامۆستاشدا ئەچنەوە، ئەمانە زیــاتر بەچــاوێکی پۆزەتیڤ سەیری بەکارهێنانی شەڕ و زوڵمداری ئەکەن، پێویستیەکی زۆریان هەیــە بــۆ دەســت بەســەرداگرتن بەســەر دەوروبەریاندا، هەست بە ناخۆشی و ئازاری زوڵملێکراو ناکەن و بەزەییان پێدانایەتەوە، ئەمانە بەچــاوێکی پــۆزەتیڤ سەیری خۆیان ئەکەن زیاد لەوەی کە لەڕاستیدا وایە.

لەلای زۆر دەروونناس و دەرونشیکەرەوە وا باوە کە ئەمانە لــەناخی دەرونیانــدا ترســنۆك و نائــەمینن، بــەلاّم لــەو پشکنینانەی کە (Dan Lweus) کردوویەتی هیچ شتێك نیە کە ئەم ڕاستیە بسەلمێنێت، بــەڵکو ئەمانــە کــەمتر ترسنۆکن و هەروەکو منداڵانی تر سەرپشکن لەخۆیان.

ئەوەی کە پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێت لێرەدا ئەوەیە کە منداڵ هەن کە بەشداری ئەکــەن لەگەلەکۆمەکێــدا، بــەلاّم ئەمانــە خۆیــان دەســتیان بــە گەلەکۆمەکێکــە نــەکردووە، ئەمانــە پێیــان ئــەوترێت (گەلەکۆمەکێکــەری پاســیڤ) یاخود (ئەڵقە لەگوێ).

پشکنینی قوتابیانی پۆلی (6-9) دەریخستووە کە ئەمجۆرە قوتابیانە بەشێوەیەکی مــام نــاوەنجی بــەناوبانگن لــەناو قوتابیەکاندا، ئەمانە گروپێــك لــەخۆیان کــۆ ئەکەنــەوە کــە لــە (2-3) قوتــابی پێکهــاتووە و وای دەرئــەخات کــە خۆشیئەوێن و یارمەتیان ئەدات، ئەم بەناوبانگیەی گەلەکۆمەکێکەرەکە لە پۆلەکانی بەرزتردا کەمئەبێتەوە و ئەگاتە ژێر مامناوەندیەوە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندەی گەلەکۆمەکێ لێکراوەکە کەمنابێتەوە.

لەبەرئەوە مرۆڤ ئەتوانێت گەلەکۆمەکێ وەکو شێوەیەکی ناکۆمەڵایەتی یاخود ڕەفتاری لادان لەدەستورە یاسا ســەیر بکات، لەسەر ڕۆشنایی ئەمە ئەتوانین بڵێین کە ئەم جۆرە مرۆڤانە زووتر و ئاسانتر دەســتئەکەن بەهەڵســوکەوتێك کــە تووشی گیروگرفتیان ئەکات لەژیاندا وەکو خواردنەوە، دزی و نارکۆمانی.

## چ جۆرە خێزانێك منداڵی گەلەکۆمەکێکەر دروست ئەکات؟

کاتێك  کە باسی منداڵی ئاوا ئەکەین، ئەبێت لەخۆمان بپرسین کە ئایا چ بارودۆخێکە کە منداڵی ئاوا دروست ئەکات؟ لەڕاستیدا سێ شتی سەرەکی هەن کە کار ئەکەنەسەر ئەمە:

1. هەستونەستی پەروەردەکار و بیروڕایان بەرامبەر بە منداڵەکە، بەتایبەتی لەساڵانی یەکەمی ژیاندا، هەستونەستێکی ساردوسڕ ئەبێت بەهۆی بەهێزکردنی ڕۆحی شەڕ لەمنداڵەکەدا و بەپێچەوانەشەوە، هەستێکی گەرم و خۆشەویستی ئەبێت بەهۆی ڕۆحی خۆشەویستی.
2. دیاریکردنی سنوری سادە و ئاشکرا بۆ منداڵەکە و ڕەچاوکردنی دەستور و یاسای خێزان لەلایەن منداڵ و گەورەکانەوە ئەبێت بە بەردی بناغەی هەموو هەڵسوکەوت و ڕەفتارێکی منداڵەکە و لێلادانی ئەوەندە ئاسان نابێت بۆ منداڵکە و ئاسانتر ئەتوانێت خۆی بگونجێنێت لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا.
3. هۆیەکی تری ئەم دیاردەیە ئەوەیە کە دایکوباوك سزا بەکارئەهێنن لەپەروەردەدا، ئەمە ئەو ڕاستیە ئەسەلمێنێت کە زۆرداری دروست ئەکات.

کەواتە ئەتوانین بڵێین کە:

خۆشەویستی زۆر و خۆخەریکردنی دایکوباوك بە منداڵەکەیەوە، دانانی سنوری ڕوون و ئاشکرا بۆ ئەو ڕەفتارانەی کە بۆی هەیە یان بۆی نیە، بەکارهێنانی ڕێگای گفتوگۆ لە جیاتی هەڕەشە و لێدان، ئەمانە هەمووی ئەبێت بەهۆی ئەوەی کە منداڵەکە پێویستی بەئەوە نەبێت گەلەکۆمەکێ لە خەڵکی بکات یان ڕێگا بدات بە خەڵکی گەلەکۆمەکێی لێ بکەن، بەڵکو ئەمانە ئەبن بەهۆی دروست کردنی منداڵێکی هاوتەریب و سەربەست لەڕەفتارەکانیدا.

لەم پشنکنینانەدا دەرکەوتووە کە (توڕەیی) منداڵ پەیوەندی نیە بە (سۆسیۆئیکۆنۆمی) خێزانەوە، وەکو بودجەی خێزان، خوێندەواری، پلەی ژیان و .... هتد، منداڵی توڕە و شەڕ فرۆش لەهەموو گروپێکی کۆمەڵدا هەیە، هەمان شت ئەتوانین بڵێین لەبارەی گەلەکۆمەکێشەوە.

## میکانیزمی گروپ

بۆ ئەوەی باشتر لەم دیاردەیە بگەین، باشتر وایە کە باسی ئەو میکانیزمە بکەین کە ئەمجۆرە مرۆڤانە ئەباتبەڕێوە لەگروپدا.

لەزۆر پشکنیندا دەرکەوتووە کە چ منداڵ چ گەورە ڕقاویتر و شەڕانی تر ڕەفتار ئەکەن کاتێك کە کەسێکی تر ئەبینن کە توڕە و شەڕانیە، کاریگەری ئەمە بەهێزتر ئەبێت کاتێك کە منداڵەکە بەچاوێکی ڕێزەوە سەیری نمونەکە ئەکات، وەکو ئەوەی بەئازای بزانێت، یان بە چاونەترس و بەهێزی بزانێت، ئەوەی کە زیاتر کاری تێئەکرێت ئەو

منداڵانەن کە زۆر لەخۆیان ئەمین نین و شوێنێکی دیاریکراویان نیە و لەگەڵ ئەوەشدا حەزئەکەن کە خۆیان دەرخەن و خۆیان بنوێنن، کە ئەمە بە (social smijia) ناو ئەبرێت.

میکانیزمی تری کاری گروپ لەسەر ڕەفتاری منداڵ ئەوەیە کە گوێ نەدان بەڕەفتاری ناشیرین و گەلەکۆمەکێ ئەبێت بەهۆی ئەوەی کە کەسانی دەوروبەرش چاو لەم ڕەفتارە بکەن و لاسایی بکەنەوە، ئەم میکانیزمە ئاواکار ئەکات.

کاتێك کە گەلەکۆمەکێکەرەکە پاداشت ئەدرێتەوە بەهۆی سەرکەوتنەکەیدا بەسەر بێهێزەکەدا، ئەمە ئەبێت بەهۆی ئەوەی کە ئەوانەی دەوروبەر کە هەتاکو ئێستا بێلایەن بوون ئێستا ئیتر کۆنترۆڵیان بەسەر ڕەفتارەکانی خۆیاندا نامێنێت و بەشداری لەم گەلەکۆمەکێیەدا ئەکەن، ئەمەش لەبەر بێهێزی کەسایەتییانە کە ناتوانن کۆنترۆڵی ڕەفتاری خۆیان بکەن و هەر خێرا بۆ ڕازیکردنی چەوسێنەرەوەکە خۆیان ئەخەنە پاڵی و وەکو ئەو ئەکەن، جابۆیە گرنگە کە گەورەکانی دەوروبەر هەر زوو ئەم ڕەفتارانە بوەستێنن و چاوپۆشی لێنەکەن.

میکانزمێکی تری بەشداربوونی منداڵی ئاسایی لەم ڕەفتارەدا بەهۆی بوونی لەناو گروپدا ئەوەیە کە ئەم بەشداربوونە ئەبێت بەهۆی کەمبونەوەی بەرپرسیاریەتی خۆیی، چونکە بەشداربووەکان ئەم بەرپرسیاریە دابەش ئەکەن بەسەر هەموویاندا و هەریەکەیان گوناهەکە ئەخاتە ئەستۆی ئەویتریان و بەمەش هەستی گوناهباری خۆیان کەم ئەکەنەوە.

زۆر هۆی تر هەن بۆ زیادبوونی ئەم دیاردەیە لەکۆمەڵدا هەندێك لەوانە: تەلەفزیۆن و سینەماو فیلمە خوێناویەکان میرات و گواستنەوەی هەندێك جینات بۆ منداڵەکە، ئەمانە ئەو فاکتانەن کە هەتاکو ئێستا زانراون و چاوەڕوانیش ئەکرێت کە لەداڕۆژدا ڕاستی و زانستی تازە بخرێنەڕوو.

## چـــــــی بـــــــکەیـــــــن

ئەو کارانەی کە ئەتوانرێت بۆ بەرگریکردن لەم گرفتە کە باری سەرشانی ژمارەیەکی زۆری لەمنداڵانی قوتابخانەکانی (سەد و بیست هەزار منداڵ لەسوید) گران کردووە، ئەتوانین بەم شێوەیە باسیان بکەین:

- ♦ لەسەر مستەاوی قوتابخانە
- ♦ لەسەر مستوای ناوپۆل
- ♦ لەسەر مستەوای تاکەکەس

ئەمانە کاری قوتابخانەن و لەسەر قوتابخانە پێویستە کە پلانی تایبەتی هەبێت بۆ بنبڕکردنی ئەم دیاردەیە، ئەوەی کە لێرەدا پەیوەندی بە دایکوباوکەوە هەیە ئەوەیە کە داوا لەقوتابخانە بکەن کە ئاگاداریان بکەن لەبارودۆخی منداڵەکەیان لەناو قوتابخانەداو ئامادەیی خۆیان بۆ یارمەتی قوتابخانە دەرخەن.

## دایك و باوكی گەلەكۆمەكێكەرەكە ئەتوانن چی بكەن؟

هەرچەندە وا هەست ئەكرێت كە پێویستی سەرشانی قوتابخانەیە كە ئەم كارە بكات، بەلاّم دایكوباوك ئەتوانن زۆر یارمەتی منداڵەكەیان بدەن بۆ ئەوەی ئەویش زیاتر كۆنترۆڵی ڕەفتارەكانی خۆی بكات و لە ئازاردانی هاوڕێكانی كەمكاتەوە.

یەكەم: لەپێش هەموو شتێكدا دایكوباوك ئەبێت بەڕون و ئاشكرا بۆ منداڵەكەی ڕوونبكاتەوە كە ئەمان ڕێگا بەڕەفتاری وا نادەن و بەگرنگیەوە سەیری باسەكە ئەكەن، ئەگەر هەردوو قوتابخانە و ماڵەوە هەمان پەیامیاندا بە منداڵەكە، ئەوا ئیحتیمال زۆر كە منداڵەكە چاوێك بە ڕەفتارەكانی خۆیدا بخشێنێتەوە و لەگۆلەكۆمەكێكردن لە دەوروبەری كەمبكاتەوە.

دووەم: دانانی سنوری ڕوون و ئاشكرا بۆ هەڵسوكەوتی منداڵەكە، كە ئەم سنوردانانە ئەبێت ئەوەندە ئاسان و سادەبن كە منداڵەكە بەتەواوەتی تێیانبگات و ڕێگای ئەوەی لێببەسترێتەوە كە بەئارەزووی خۆی و كەسی ویستی بەپێی خواستی خۆی لێكیان بداتەوە، ئەمە زۆر گرنگە، چونكە منداڵی لەم جۆرە، بەلایانەوە زۆر زەحمەتە كە خۆیان بخەنەژێر ڕكێفی دەستوروباسای كەسانی ترەوە و هەردەم هەوڵ ئەدەن لێی لابدەن، ئەمە ڕێگا لەوە نابەستێتەوە كە ئەم دەستوروباسایانە لەگەڵ منداڵەكەدا باس بكرێت و ڕەزامەندی ئەوی لەسەر بێت گفتوگۆی خۆی لەسەر كردبێت.

سێهەم: ستایش كردنی ڕەفتاری باشی منداڵەكە و پاداشت دانەوەی كارە باشەكانی كە بۆی بسەلمێنێت كە تەنها كاری باش پاداشت ئەدرێتەوە و كاری نابەجێ سزا ئەدرێت.

چوارەم: زۆربەی هەڵسوكەوتی نابەجێی لەمجۆرە، كاتێك ئەكرێت كە گەورەكان ئاگایان لێی نیە و لەوێ نین، بۆیە بەشداری بوونی گەورەكان لەژیانی ڕۆژانەی منداڵەكانیاندا، ئەم گرفتانە كەمئەكاتەوە و تێگەیشتوویی گەورەكان بۆ ژیانی ڕۆژانەی منداڵەكان و هەست و نەستیان زیاد ئەكات و نزیكبونەوەیەك دروست ئەبێت كە ئەبێت بەهۆی باوەڕ بەهێزبوون لەنێوان هەردوولادا.

## دایكوباوكی منداڵی گەلەكۆمەكێ لێكراو ئەتوانن چیبكەن؟

كاتێك دایكوباوك هەست ئەكەن كە منداڵەكەیان گەلەكۆمەكێی لێئەكرێت لە قوتابخانە، باشتر وایە پەیوەندی ڕاستەوخۆ بكەن بەقوتابخانەوە و لەگەڵ ئەواندا پیلانێك دانێن بۆ چارەسەركردنی ئەم گرفتە، لەڕاستیدا ئەبێت ئەمە وەكو ئاگاداركردنەوەیەك وابێت بۆ خێزانەكە و هەوڵبدەن بەشێوەیەكی گشتی یارمەتی منداڵەكە بدەن نەك تەنها لەبەرئەوەی كە گەلەكۆمەكێی لێئەكرێت بەڵكو لەبەرئەوەی كە منداڵەكە پێویستی بە یارمەتی هەیە بۆ بەهێزكردنی كەسایەتیی و بڕوا بەخۆبوون.

یەكێك لەو ڕێگایانەی كە یارمەتی ئەدات لەم ڕێیەدا ئەوەیە كە یارمەتی بدرێت و پێشخستنی خواست و ئارەزووەكانی لەوەرزش و گۆرانی و مۆسیقا و تیاتر و هەرچیەكی تر كە منداڵەكە حەزی لێئەكات، ئەم یارمەتیانە و

دابینکردنی خواستەکانی منداڵەکە ئەبێت بەهۆی ئەوەی کە منداڵەکە هەست بەگرنگی خۆی بکات، پەیوەندی ببەستێت بە کەسانێك کە لەتەمەنی خۆیەوە نیزکن و ئەگونجێن لەگەڵیدا، هەروەها ئەمجۆرە منداڵانە، هەندێکجار بەهۆی لاوازی لەشولاریانەوە تووشی گەلەکۆمەکێ دێن، جابۆیە بەشداری منداڵ لەم جۆرە جموجۆڵانەدا ئەبێت بەهۆی بەهێزکردنی کۆنترۆڵیان بەسەر ئەندامانی لەشیانداو نیشانەیەك ئەدات بە دەوروبەرەکەی کە ئەم ترسنۆك نیە و ئەتوانێت ئەوە بکات کە هەموو منداڵێك ئەیکات.

هەروەها دایکوباوك ئەتوانن یارمەتی منداڵەکەیان بدەن بەوەی هانیبدەن کە هاوڕێیەتی ئەو قوتابیانە بکات کە لەسەرخۆ و هێمنن و ئەگونجێن لەگەڵ زەوق و ئارەزووی ئەوداو داوای لێبکەن کە لەدەرەوەی قوتابخانەش یەکتری ببینن و بەیەکەوە سەیران و چون بۆ مۆزەخانە و سینەما و شوێنی تریان بۆ بڕەخسێنن.

ئیتر لەمبارەیەوە دایکوباوك ئەتوانن زۆر یارمەتی منداڵەکە بدەن، بەلاّم ئەوەی کە ئەبێت لەبیرمان نەچێت ئەوەیە کە بەهیچ شێوەیەك دەست نەخەنە کاری منداڵەکەوە کاتێك کە خۆی داوا ئەکات کە ئەوان هەقیان نەبێت و ئەم خۆی چاری ئەم بارودۆخە ئەکات بەوشێوەیەی کە خۆی بەباشتی ئەزانێت، بەڵکو ئەبێت ڕێزی ئەم داوایەی بگیرێت و نەبە ئاشکرا و نەبە نهێنی هەوڵنەدەن دەستبخەنە کارەکەیەوە، بەتایبەتی ئەمە لەپۆلەکانی ناوەندیدا زۆر گرنگە و سەرپێچیکردن لەم داوایە ئەوەندەی تر باری سەرشانی گرانتر ئەکات، ئەمە لەبەرئەوەی:

1. منداڵەکە نایەوێت کە هاوڕێکانی هەست بەوە بکەن کە لەماڵەوە قسەی گێڕاوەتەوە و بەترسنۆکی لەقەڵەم بدەن لەبەرئەوە دەستخستنە ناوکاری منداڵەکەوە، لەوانەیە ببێت بەهۆی دورخستنەوەی منداڵەکە لەگۆڵمەزەکەی و دەرکرێت و جارێکی تر کەس نەیەوێت یاری لەگەڵ بکات، چونکە منداڵەکان ئیتر ناتوانن بڕوا بەکەسێك بکەن کە نهێنی گۆڵمەز بباتە دەرەوە.
2. منداڵ جاری وا هەیە شەرم ئەکات کە دایکوباوك لەبەرچاوی هاوڕێکانی شتێکی وابکەن کە هەڵەبێت و حەیای ئەم بەرن ئەمە شتێکی ئاساییە و هەموو کەسێك ڕۆژێك لەڕۆژان شەرمی لە ڕەفتاری گەورەکەی کردووە، هەرچەندە ڕەفتارەکەش ئەوەندە سەرنج ڕاکێش نەبووبێت. لەپەڕتووکی (Mobbning) لەلایەن: (Dan Olweus).

1. ڕەخنەگرتن یان هەڵسەنگاندن.
2. لەقاموسی سویدیدا ڕەخنە واهاتووە: ڕوونکردنەوەیەکە بۆ پەلاماردانی کەسێك یان کارێك بەدەست ڕاکێشان بۆ چەند بیروڕایەکی هەڵە یان ناتەواو.
3. هەڵسەنگاندن: شیکردنەوەیەکی قوڵ و پشکنینێکی وردی بەشە جیاوازەکانی ڕەفتارێك یان کارێك.
4. واباوە کە ڕەخنە باشە و قازانجی هەیە: زۆرکەس ئامانجیان تەنها ئەوەیە کە ڕەخنەبگرن و بەهۆی ڕەخنەوە بگەنە ڕاستی بابەتەکان، هەروەها داواش لەخەڵکی ئەکەن کە وابکات و ئەڵێن کە (پیاو ئەبێت ڕەخنە قبوڵ بکات). بەلاّم ڕەختە چیئەکات؟

5. ڕەخنە کەمجار دروستکەرە و ئامانجیش لەڕەخنە وا دیارە دروستکردن نیە، بەڵکو ڕوخاندنە، جا چۆن پیاو زوو ئەگاتە ئامانجێکی دروستکەرە بەوەی ڕوخێنەر بێت.

6. ڕەخنە مانای ئەوەیە، ئەوەی قسە ئەکات ڕازی نیە بە بیروهەست و ڕەفتاری خەڵکی تر، ڕەخنە دەست ڕائەکێشێت بۆ هەڵەکان بەبێئەوەی باسی ئەوە بکات کە ئەبوایە چی بکرایە لەجیاتی، ئەمە مانای ئەوە نیە کە مرۆڤ ڕەخنە نەگرێت، یاخود دەست بۆ ئەو کارانە ڕانەکێشێت کە لەگەڵ بیروڕای ئەو ناگونجێت، بەڵام لەم کاتانەدا پێویستە ڕەخنەگر لەکەوشەکنی خۆی بێتەدەرەوە و هەوڵبدات خۆی بخاتە شوێنی ئەو کەسەو و لەهەستونەست و ئەو بارودۆخەی ڕەخنەلێگیراو بگات، ئەمە بەزمانی دەروونشیکاری پێیئەوترێت (ئیمپاتی) بەمانای خۆخستنە شوێن و هەستکردن وەکو کەسێکی تر، بۆ ئەوەی بتوانێت بەشێوەیەکی موزوعی لە باسەکە بگات.

7. ئەگەر ئامانجی ڕەخنەگر ئەوە بێت کە ڕەخنەلێگیراو بچەوسێنێتەوە و تۆڵەی لێبکاتەوە ئەوە بەئاسانی ئەگاتە ئامانج و ڕەخنەلێگیراو ئەڕوخێنێت، ئەگەر ئامانجیش یارمەتیدان و پێشخستن و دەوڵەمەندکردنی بابەتەکە بێت ئەوە بەئاسانی ناگاتە ئەنجام و زەرەر ئەدات لە دروستکردنی دیالۆگێکی زانستی و بەسوود کە ئەمەیە ئامانجی ڕەخنەگرتن یاخود هەڵسەنگاندنەکە، چونکە ڕەخنەلێگیراو هەست ئەکات کە بەناهەق دەستنیشانکراوە و مامەڵەیەکی ناڕاستی لەگەڵکراوە و خۆی بەغەدرلێکراو دائەنێت، ئەوکاتەش ناتوانێت گوێ بۆ ڕەخنە بگرێت و وەڵامی بداتەوە.

8. ڕەخنەی ئەریتی ئەو ڕەخنەیەیە کە گوێ ئەداتە ڕەخنەلێگیراو کە چەند ئەتوانێت گوێی لێبگرێت و بەپێی ڕەخنەکە هەڵسوکەوت بکات، کەواتە ڕەخنەگر ئەبێت بەباشی لەبارودۆخی کارەکە شارەزابێت و بناغەیەکی ڕاستی هەبێت بۆ بۆچونەکانی و زانیاریەکی تەواوی هەبێت لە چۆنیەتی کارەکە بەمانایەکی تر.

9. (تفەنگ بەتاریکیەوە نەنێت).

10. هەندێکجار مرۆڤ کەسایەتی بێهێز، هەر کەشتێکی بیست، خێراو بەیەکجار دەنگی خۆی لەگەڵ دەنگی قسەکەردا ئەکات بەیەك، جا ئیتر باسەکە سەرزەنشت بێت یان مەدح ئەوە بەلایەوە گرنگ نیە و ئەوەی بەلای ئەوەوە گرنگە هاوڕێیەتی کەسەکەیە نەك باسەکە، ئەمە نیشانەیەکی دیارە لەکۆمەڵگای دواکەوتوودا و هەر ئەم دیاردەیەش بووە بەهۆی هاتنەکایەی کەسانی لێنەهاتوو و دوایش داپلۆساندنی هەمان مرۆڤ، کاتێك بۆیان دەرئەکەوێت کە ئەو مرۆڤە بەکەڵکی ئەو کارە نایەت و ئەمان هەڵەبوون، هەڵەشەیی و پەلاماردنی وا هەمیشە زەرەری هەیە نەك سوود.

11. یاریەك هەیە کە مرۆڤێك وشەیەك ئەچرپێنێ بەگوێی ئەوەی تەنیشتیا کە لەبازنەیەکدا کە دانیشتون و ئەویش ئەچرپێنێت بەگوێی ئەویتردا، بەم شێوەیە هەتاکو قسەکە ئەگاتەوە گوێی یەکەم کەس، بەڵام کاتێك کە قسەکە ئەگاتەوە لای کەسی یەکەم، زۆربەی جار ئەوەندە گۆڕاوە کە نایناسێتەوە.لەمەوە بۆ ماندەرئەکەوێت کە قسە چەند ئەگۆڕێت کاتێك دەماودەم ئەکات و لەکەسێکەوە ئەگێڕدرێتەوە بۆ کەسێکی تر، ئەم بەهەڵە لەیەکتری گەیشتنە شتێکی مرۆڤایەتیە وە شتێکی سەیر نیە، هەرکەسە بەجۆرێك لەهەمان هەواڵ ئەگات و

بەپێی کەسایەتی تایبەتی خۆی لێکیئەداتەوە، چونکە کەسایەتیی هیچ کەسێك لەویتر ناچێت، بۆیە تێگەیشتنەکان و بۆچوونەکانیش لەیەك ناچن.

12. شتێکی تری گرنگی ڕەخنەگرتن ئەوەیە کە پەیوەندی چۆنە لەنێوان ڕەخنەگر و ڕەخنەلێگیراودا، ئەگەر پەیوەندیان ڕاست و دروست بێت و لەسەر بناغەیەکی زانستی و خۆشەویستی دروست بوبێت، ئەوا ئاسانترە کە ڕەخنە لەیەکتری بگرن و یەکتری قبوڵ بکەن وەکو خۆیان، بۆیە نەبوونی ئەم پەیوەندیە کاری ڕەخنەگر گرانتر ئەکات و پێویستی بە پشکنینی زیاتر و وردەکاری زۆر تر هەیە بۆئەوەی ڕەخنەکەی نەریتی بێت و هەستونەستی ڕەخنەلێگیراو وەکو مرۆڤێکی جیا لەکارەکەی بریندار نەکات.

13. لەپەیوەندی کۆمەلاّیەتیدا، مرۆڤ پێویستی بە قسەکردن و کارکردنی هەرەوەز هەیە، ئەم کارە هەرەوەزیە لەکاتێکدا دروست ئەبێت، کاتێك ئەندامانی کۆمەڵ گوێ بەیەکتری ئەدەن و ڕێگای بەشداری بوونی هەموو ئەندامانی کۆمەڵساز دەکەن، ئەمە بەردی بناغەی تێگەیشتن و خۆختستنە شوێنی یەکتری دائەنێت و مرۆڤەکان ئەتوانن مەشق لەسەری بکەن، بەبێ ئەم مەشقکردنە، نەکاری هەرەوەز نە ڕەخنەی ئەریتی ئەکرێت.

14. بۆ ئەوەی ڕەخنەکان، بەتایبەتی، ڕەخنە کۆمەلاّیەتیەکان کە لەم باسەدا هاتووە، ڕەخنەیەکی ئەریتی بن پێویستە کە مرۆڤ ڕەچاوی هەندێك خاڵی گرنگ بکات.

15. ڕەخنە پێویستە ڕاستەوخۆ بێت و مرۆڤ لەگەڵ ڕەخنەلێگیراودا دەمەتەقێیەکی ڕاستەوخۆ دروست بکات.

16. ڕەخنەکە پێویستە بەڕێژەیەکی گونجاو بێت و مرۆڤ کۆیان نەکاتەوە و بەسەریەکەوە و بەکۆمەڵ ڕەخنەکانی پێشکەش بکات، چونکە مرۆڤ ناتوانێت بەجارێك بیروڕای بەرامبەرەکەی بگۆڕێت و سەرجەمی تاقیکردنەوەکانی ژیانی مرۆڤێك بگۆڕێت، بۆیە تاکو ڕەخنە کەم و ئەریتی بێت باشتر و زیاتر ڕەخنەگر ئەتوانێت هەزمیان بکات و ڕەفتاریان لەگەڵ بکات.

17. زۆرجار ئەتوانرێت ڕەخنە لەشێوەیەکی پۆزەتیڤدا باسبکرێت و لەجیاتی ڕەخنە دەست بۆ تەواوکەرەکانی کارەکە ڕابکێشرێت، کە کارەکە چاکتر ئەکەن، شێوە و پێشنیاری جیاواز بخرێتەبەردەم ڕەخنەلێگیراو بۆ ئەوەی ئەوەی بەباشی ئەزانێت بەکاریان بهێنێت و کاریان پێبکات، ئەم پێشنیارانە دەرئیەخات کە ڕەخنەگر چەند گرنگی تایبەتی ئەدات بە باسەکەو بەلایەوە گرنگە کە باسەکە بگاتە ئەنجامێك کە سوودی هەبێت، بەمەش ڕەخنەلێگیراو زیاتر هانئەدرێت کە زیاتر هەوڵبدات لەکارەکەیدا پێشبکەوێت.

18. مرۆڤ پێویستە لە ڕەخنەگرتندا قسە بۆ خۆی بکات و بەناوی کۆمەڵەوە قسە نەکات، مرۆڤ ئەتوانێت بڵێت کە (من وا هەست ئەکەم) لەجیاتی ئەوەی.

19. (ئێمە وا هەست ئەکەین...) چونکە ڕەخنە شتێکی زاتیە و ئەوەی کە مرۆڤێك هەستی پێئەکات و بەشێوەی تایبەتی خۆی دەریئەبڕێت جیاوازە لەوەی کەسانی تر هەستی پێئەکەن و بەشێوەی تایبەتی خۆیان دەریئەبڕن.

20. لەجیاتی ئەوەی کە لەدەربڕینەکاندا وشەی ئاڵۆز و سەیر بەکاربهێنرێت، هەوڵبدرێت بەپێی توانا ووشە و دەربڕینەکان سادە و ڕوون و ئاشکرا بن و بەڕوونوئاشکرا دەستنیشانی ئەو کارانە بکات کە بەلای تۆوە

ڕوونوئاشکرا نین، مرۆڤ ناتوانێت بەجارێك سەرجەمی ژیانی کەسێك یاخود ڕووداوێك بخاتەژێر وردبینی ڕەخنەوە و ڕەخنەی لێبگرێت.

21. جیاکردنەوەی کار لەکارکەرەکە هەقێکی مرۆڤایەتیە و ئەبێت جیابکرێتەوە، ڕەخنە لەکارێك ئەگیرێت کە مرۆڤێك کردوویتی نەك لە مرۆڤێك کە کارێکی کردبێت، ئەمە زۆر گرنگە کە جیاوازی بکرێت لەنێوان کار لەگەڵ ئەو مرۆڤەی کارەکەی کردووە، ڕاستە کە ئەو مرۆڤەی ئەم کارەی کردووە بەلای تۆوە باش نیە و ڕەخنەی لێئەگریت، بەلاّم هەمان مرۆڤ لەوانەیە کاری تری کردبێت کە تەنها بەلای تۆشەوە باشە، کەواتە کاتێك کە کاری مرۆڤێك بەلای تۆوە هەڵەیە، مانای ئەوە نیە کە هەموو کارێك کە ئەم مرۆڤە کردوویەتی هەڵەیە و ئەبێت ڕەخنەی لێبگیرێت، لەوانەیە ئەمکارەی کە کردوویەتی لەبارودۆخێکی وادا کردبێتی کە ئەگەر بەوردی لێیبکۆڵینەوە و خۆمان بخەینە شوێنی ئەو ئێمەش هەروامان ئەکرد.

22. شێوەی ئاخاوتن و بەرزونزمی دەنگ و جوڵاندنی دەست و دەموچاو گرنگیەکی خۆی هەیە بەتایبەتی لەکاتی ڕەخنەگرتندا، ئەمە هەرچەندە مرۆڤ ناتوانێت کە تەنها لەم کاتەدا ئەم شێوەی قسەکردنە بگۆڕێت، چونکە شێوەی قسەکردن پەیوەندی بەڕووی سایکۆلۆجی و فیزیۆلۆجیەوە هەیە، بۆیە باشتر وایە کە ڕەخنەگر ڕەخنەلێگیراو گوێگران ئامادە بکات بۆ ئەمەو پێشەکی کورتەیەك لەسەر شێوەی تایبەتی قسەکردن و شێوەی ئاخاوتنی خۆی بۆ کەسانی پەیوەندیەکە باس بکات، ئەمە هەقێکی ڕەوای خۆیەتی و بۆی هەیە بە هەرشێوەیەك کە پەیوەندی هەبێت بەم بابەتەوە بەکاری بهێنێت بەبێئەوەی کاربکاتەسەر ناوەڕۆکی بابەتەکەو کاربکاتەسەر تێگەیشتنی مرۆڤەکان بەشێوەیەکی هەڵە لەمبارەیەوە.

23. هەڵبژاردنی کاتوشوێنی لەباروگونجاو بۆ ڕەخنەگرتن، خاڵێکی گرنگی ترە کە پێویستی بەبیرلێکردنەوە هەیە هەموو کات هەموو ڕەخنەیەك ئەریتی نابێت و ئەنجامی باش نادات بەدەستەوە، ئەگەر ڕاستیش بێت ئەم هەڵبژاردنە لێزانینێکی تەواوی ئەوێت لەهەموو ڕوویەکی باسەکەوە و پێویستی بە وردەکاری زۆرە، بۆ نمونە کاتێك کەسێك ڕەخنەی لێئەگیرێت لەبەردەم هاوڕێکانیدا و هەستی بریندار ئەکرێت، ئەبێت بەهۆی ئەوەی کە هاوڕێکانی ناچاربن کە بەرگری لێبکەن و ئەوانیش بەشداری کاری ڕەخنەگرتنەکە ببن، ئەمە لەخراپترین حاڵەتدا، ئەبێت بەهۆی کەسانی دەوروبەر و نزیك بەدرۆ و بۆ پیشاندانی هاوڕێیەتیان لەگەڵ ڕەخنەلێگیراودا، دەنگی خۆیانی بدەنێ و بەغەدرلێکراوی لەقەڵەمبدەن، کە ئەمەش ئەوەندەی تر بارودۆخەکە ئاڵۆزتر ئەکات و ڕاست و چەوت تێکەڵ ئەکات، لەمبارەیەوە ئەتوانین نمونەی زۆر بهێنینەوە لەژیانی ڕۆژانەی هەریەکێك لەخۆماندا و ئەنجامە خراپەکانی لێکبدەینەوە.

24. وشەی ڕەخنە وشەیەکی سلبییە و بەمانای شکاندن و ناڕەزایی دەربڕین دێت، هەرچەندە کە هەندێکجار مەبەستەکە بۆ ئەوە نیە، بەلاّم تەنها بەکارهێنانی ئەم وشەیە بەسە بۆ ئەوەی کە بەرامبەرەکە ڕاچڵەکێ و گوێی خۆی قوتکاتەوە و خۆی بخاتە سەنگەری خۆپاراستنەوە، بۆیە بەکارهێنانی بەشێوەیەکی زۆر و دووبارەکردنەوەی لەهەمووکات و شوێنێکدا سایەکە و کەژی پەیوەندیەکە ئەشێوێنێت، بۆیە زۆربەی زۆری ئەنجامەکەی بە نێگەتیڤی تەواو ئەبێت و ناگاتە ئەنجام، ئەم وشەیە کە لەووشەی (النقد) ی عەرەبیەوە بەهەڵە

وەرمانگرتووە و هەر کەشتێکمان بەدڵ نەبوو ئیتر ڕەخنەی لێئەگرین، بەڵام ئێمە ووشەی هەڵسەنگاندنمان هەیە کە هەردوو دیوی باسەکە هەڵئەسەنگێنێت و باش و خراپی ئەخاتەڕوو، هەر لەبەر ئەمەشە کە ئێمە لایەنە باشەکانی باسەکەمان لەبیرچووەتەوە و بەدەگمەن باسی ئەکەین لەڕەخنەگرتندا، ئەمە یەکێکە لەکارتێکردنی کولتوری عەرەبی لەسەرمان و پێویستمان بەپاککردنەوەی هەیە، چونکە هەڵسەنگاندن بەباسکردنی لاینە باشەکانی باسەکە دەستپێئەکات و دانی پێدائەنرێت، ئەوسا ئاسانە کە ئەوەی هەڵئەسەنگێندرێت گوێی خۆی بکاتەوە و گوێشلکات بۆ هەڵسەنگاندنەکە و هەتاکو ئامادەش بێت کە بیروڕای خۆی بگۆڕێت و بکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵ هەڵسەنگێنەردا، بەمەش دیارە کە کەژێکی ئاشیانەتر و یەکسانەتر دروست ئەبێت لەجیاتی ئەو کەژە نێگەتیڤەی کە لەڕەخنەدا دروست ئەبێت.

25. ئەگەر لێرەدا باسێکی تایبەت بکەین بە کۆمەڵگای خۆمانەوە و گفتوگۆیەکی هەمەچەشنە لەمبارەیەوە ساز بکەین کە هەموو شێوەکانی هەڵسەنگاندن بگرێتەوە بەکولتوری و ڕامیاری و مێژوویی و ئەدەبی و ... هتد ئەوا پێویستمان بەکەسانی شارەزا هەیە کە بتوانن لەمبارانەوە بیروڕا و بۆ چوونی خۆیان بخەنە پێشچاو و گفتوگۆیەکی زانستی سازبکەن، چونکە باسێکی وا گرنگ پەیوەندی بەکاری هەرەوەزی و ژیانی دوارۆژی کۆمەڵەوە هەیە و کارێکی پێش هەموو شتێك پەروەردەییە، بۆیە پێویستی بە مەشقکردن و لێکۆڵینەوە هەیە.

ئەم باسە خۆلاسەی ئەو باسەیە کە پرۆفیسۆرانی نەرویجی .

26. (Sven Stensaasen och Olav Sletta) لە پەڕتووکی (Grupp Processer) دا نوسیویانە و من سودم لێوەرگرتووە.

## موراڵ

چۆن تێگەیشتنی ئەخلاق پێشئەکەوێت؟ (موراڵ)

موراڵ: تێگەیتشن لەڕاست و چەوت کە هەڵسوکەوتمان ئەبات بەڕێوە توانای منداڵ بۆ تێگەیشتن و زانینی باسی جیاواز کە پەیوەندی بەڕەوشتەوە هەیە ئەگۆڕێت بەپێی قۆناغی تێگەیشتن و پێشکەوتنی بیری منداڵ و بەو پێیە ئەگۆڕێت، لەبەرئەوە تێگەیشتنی منداڵ بۆ (مۆراڵ) لە تەمەنی جیاوازدا زیاتر یان کەمتر نیە لەگەورەکان، بەڵام جۆری مامەڵەکردنی منداڵ لەگەڵ ڕەوشتدا جیاوازە لە گەورەکان.

تێگەیشتنی منداڵ بۆ ڕەوشت شتێکی حەمتمیە و گشتیە (کونفنوشونیلە) (Konventionell) یەك جۆر لەڕاستی هەیە، ئەم تێگەیشتنە پەیوەندی هەیە بەاعتمادی منداڵ بەگەورەکان و کەسانی گرنگ لەدەوروبەری، بەمانایەکی تر تێگەیشتنی گەورەکان بووە بە تێگەیشتنی ئەمان و بەهێنی خۆیانی ئەزانن، بەهەمانشێوە تێگەیشتنی منداڵ لەدەستوریاسا دروستبووە و منداڵ ڕاهێنانی لەسەر ئەکات و بەلایەوە ڕاستیەك نیە زیاتر لەڕاستی خۆی، ئەم تێگەیشتنەی منداڵ وەکو (خەریتەیەك) وایە کە یارمەتی ئەدات بۆ تێگەیشتن لەژیان و سەرپشك و ئاسودەیان ئەکات، بەمانایەکی تر ژیانیان بۆ ئاسانتر ئەکات (پیاو نابێت وابکات...)، (پیاو ئەبێت وا بکات.....).

بۆ ئەوەی ئەم دەستورویاسایانە پێشبکەون و یارمەتیدەری منداڵەکە بن پێویستە ڕوون و ئاشکرا و ئاسان بن، بۆ ئامانجێك دانرابێت و پەیوەندی پێوە هەبێت، هەروەها بگونجێت لەگەڵ تێگەیشتنی منداڵەکەدا، ئەمە لەلایەك لەلایەکی ترەوە ئەو سایەیەی کە دەستورویاساکەی تێدا ئەسەپێنرێت بەسەر منداڵەکەدا کارێکی گەورە ئەکاتەسەر ئەوەی منداڵەکە بەگوێی بکات یان نا.

ئەمە مانای ئەوەیە کە تێگەیشتنی منداڵ بۆ دەستورویاسا، ڕوون و ئاشکرایە یان نا؟ نێگەتیڤە یان پۆزەتیڤ؟ دەوروبەر چەند گرنگی ئەدەن بەم یاسایانە و بەچ شێوەیەك بۆ منداڵەکە ڕوونئەکرێتەوە و خۆیان چەند لەسەر ئەم دەستورویاسایانە ئەڕۆن؟ ئەگۆڕێت و منداڵەکەش هەمان تێگەیشتنی ئەبێت بۆ یان.

تێگەیشتنی منداڵی لاتێنس و پێش باڵغ بوون لەدەستورویاسای خێزان و کۆمەڵ زۆر گشتیەو کارێکی گەورە ئەکاتەسەر ژیان و هەروەها هەڵسوکەوتیان و پێویستیەکانیان دابین ئەکات، هەر لەبەرئەمەشە کە منداڵانی ئەم تەمەنە زۆر بەتوندی دەست بەهەندێك دەستورویاساوە ئەگرێت لەکاتی پەیوەندیەکانیدا لەگەڵ کەسانی دەوروبەری زۆر نموونە هەیە بۆ ئەم تێگەیشتنەوەی منداڵ لەمانە: هەڵبژاردن لەناو منداڵانی ئەم تەمەنەدا بەئاشکرا ئەبینرێت ئەمانە زۆرجار لەگەڵ هاوڕێکانیاندا و لەناو خێزاندا ئەم هەڵبژاردنە بەکار ئەهێنن بۆ ئەوەی بزانن چیبکەن و چیان بۆ هەیە و چیان بۆ نیە، لەلای ئەم منداڵانە زۆر بە بڕیار ئەدات و نابێت لێی لابدرێت، هەروەها زۆر یاری و هەڵسوکەوتی ڕۆژانە دەستوری خۆیان هەیە و نابێت لێیان لابدرێت، ئەمانە هەمووی منداڵەکان بەرەو تێگەیشتنی گشتی و ژیانێکی ڕێکخراو لەگەڵ کەسانی دەوروبەردا ئەبات بەڕێوەو و ژیان بۆی ئاسانتر ئەبێت، هەر بەهۆی ئەم ڕێکخستنەوە منداڵەکە ئەتوانێت دەست بەسەر ڕق و توڕەبوونی خۆیدا بگرێت و بەئاسانتر لەگۆڵمەزدا وەربگیرێت کە ئەمە تەنگوچەڵەمەیەکی گەورەیە بۆ منداڵی ئەم تەمەنە و وەرنەگرتنی لەگۆڵمەزدا زەرەرێکی زۆر ئەدات لەپێشکەوتنی هەستونەستی و سامناکە بۆی کە لەدەرەوەی گۆڵمەزدا بێت، هەربۆیەشە کەجاری واهەیە منداڵ لەخۆیەوە دوای گۆڵمەز ئەکەوێت بۆ ئەوەی هاوڕێکانی لەدەست نەچێت، چونکە ئەگەر ئەمەی بۆ نەکرێت ئەوە ناچار ئەبێت کە هاوڕێیەتی گەورەکان بکات.

## تێگەیشتنی عەقڵی

بەهۆی پێشکەوتنی منتقی بیری منداڵەوە، وردە وردە منداڵی ئەم قۆناغە دەست ئەکات بەشککردن و ئاڵوگۆڕکردنی بیری خۆی بەرامبەر بەو دەستورویاسایانەی کە هەیە، منداڵی ئەم تەمەنە تێئەگەن کە ئەم دەستورویاسایانە مرۆڤ دایناون و ئەمەندە پیرۆز و حەتمی نین وەکو ئەو وایئەزانیێ، هەروەها بۆی دەرئەکەوێت کە لەڕێگایەك زیاتر هەیە بۆ جێبەجێ کردنی کارەکانی و ژیان زۆر جۆری جیاوازی هەیە، بەم پێیە دەستورویاسا ئەکەوێتە ژێر باری لێکۆڵینەوە و تاوتوێکردنەوە، کەواتە منداڵەکە تێگەیشتووە کە ئەم دەستورویاسایانە شتێکە (نسبین) و ئەتوانرێت گفتوگۆیان لەسەر بکرێت و دەست ئەکات بەتاقیکردنەوەیان لەکات و شوێنی جیاوازدا و لە هەڵسوکەوتەکانیدا، ئەم تاقیکردنەوەیە زۆرجار تەنگوچەڵەمە دروست ئەکات لەنێوان منداڵ و گەورەکاندا، ئەمە وا لەمنداڵەکە ئەکات کە لەگەڵ هاوڕێکانیدا بگەڕێت بەدوای شیکردنەوەی تازە و سەربەست بۆ دەستورویاسای تازە کە

بگونجێـت لەگـەڵ پێشـکەوتنی بـیر و هەسـتیاندا، کەواتـە ئـەو دەستوروپاسـا گشـتیەی جـاران ئـەگۆڕێت بـۆ دەستوروپاسایەك کەلەسەر بناغەی ئەقڵی دامەزرابێت.

پێشکەوتنە ئاسانتر ئەبێت ئەگەر منداڵەکە تێگەیشتنی گشتی بـۆ ڕەخسـا بێـت و لـەقۆناغی پێشـودا یارمـەتی درابێت بۆ ئەوەی بتوانێت بەچاوی ڕەخنەوە سـەیری بکـات و بڕیـاری خـۆت بـدات، بەیارمـەتی گـەورەکان منـداڵ ئەتوانێت ئەم هەڵبژاردنە سەربەستەی خۆی بەرامبەر دەستوروپاسای گشتی وردە وردە پەرەپێبـدات و بڕیـاری خـۆی بدات و تێگەیشتنی تر لەجیاتی کۆنەکان پەیدا بکات، کەواتە:

لەم قۆناغەدا پێویستە ڕێگا بدرێت بە منداڵ و ڕێزی هەوڵەکانی بدرێت بۆ تاقیکردنەوەی ئەم دەستوروپاسـایانە وە ڕێگای بدرێت هەندێك لەو دەستوروپاسایانە بگۆڕێت بەدەستوروپاسای تازە کە جێگای کۆنەکان بگرێتـەوە، زۆربـەی زۆری ئەم هەوڵی گۆڕینە وەکو خۆی دەستوروپاساکان ئەهێڵێتەوە و منداڵ نایان گۆڕێت بەڵام ئەم تاقیکردنەوانە هـەر لەئێستاوە یارمەتی ئەدات کە قۆناغی داهاتوو بە ئاسانتر ببڕێت و زیاتر بیر و هەستەکانی عەقلانی و واقعی بێت.

ئەوەی کە نیشانەیەکی دیارە بۆ ئەو منداڵانەی ڕێگایان ئەدرێت و یارمەتی ئەدرێن لـەم قۆناغـەدا بـۆ ئـەوەی لـە قۆناغی گشتیەوە بچنە قۆناغی عقلیەوە ئەوەیە کە ئەمانە تـەنها هـەر ڕەخنـە لەدەستوروپاسـاکان ئـەگرن، بـەڵکو خۆیان دەستوروپاسای تر پێشنیار ئەکەن و دروستی ئەکەن لەجیاتی کۆنەکان، ئەم پرۆسێسە لەدانان و هەڵوەشاندنەوە و بەراوردکردنی  دەستوروپاسا وایان لێئەکات کەناچار بن لەکارەکانیاندا ڕاووبۆچـوونی خۆیـان یەکبخـەن و وابکـەن بگونجێن بەیەکەوە، ئەمە گرنگیەکی گەورەی هەیە بۆ پرۆسێسی پێشکەوتنی بیری دیموکراتی کە بریتیـە لـەدەربڕینی بیروڕای خۆی و ڕێزگرتنی بیروڕای هاوڕێکان و کەسانێك کە بەیەکەوە کار ئەکەن.

کاتێك کە منداڵی ئەم قۆناغە خۆی بەشداری بڕیاردان و سەرئەنجامی کار و ئەنجامی لێ لادان و سزادانی کرد ئـەوا ئەنجامەکەی کارەکە جیاواز ئـەبێت لـەوەی کـە گـەورەکان بەتـەنها ئـەم دەستوروپاسـایانە بسـەپێنن بەسـەریاندا، لەبەرئەوەی پێشکەوتنی عەقڵی لەم تەمەنەدا ڕێگایان نادات کـەخۆیان بخەنـەژێر دەسـتی کەسـێکی دەسـەڵاتدارەوە لەبەرئەوە زۆرجار هەڵئەچن دژی ئەم دەسەڵاتدارە و دەستورەکانی و مانئەگرن، ئەم دەسـتورانە و سـزاکانیان زۆرجـار لەلای منداڵی ئەم قۆناغە بەنادادپەروەرانە لەقەڵەم ئەدرێت، بەڵام ئەگەر سەرپێچی لەو دەستوروپاسایانە بکـەن کـە خۆیان بەشداربوون لەدانانیدا ئەوە ئەبێت بەهۆی بەهێزکردنی کەسـایەتی و بڕوایـان بـە دەستوروپاسـا بەشـێوەیەکی گشتی، لەبەرئەوە گرنگە کە منداڵەکان بەشداری گفتوگۆی دانانی دەستوروپاساکان بکەن و گەورەکان یاساودەستوری وا دابنێن کە جێگای (مساوەمە) و ئاڵوگۆڕی تێدابێت.

تێگەیشتنی منداڵ لەم تەمەنەدا بۆ (موراڵ) و دەستوروپاسا تێگەیشتنێکی (کۆنکرێتە) و ناتوانێـت ئـەو هـەموو بارودۆخەی کە کار ئەکەنە سەر بڕیار دانێـك ببەسـتێت بەیەکـەوە، بەلایـەوە سـەیرە کـە گەورەیـەك باسـی خراپـی جگەرەکێشان ئەکات لەگەڵ ئەوەشدا دانیشێت و جگەرە بکێشێت، یان دژی شەڕ قسەبکات کەچی ئەچێت سـەربازی ئەکات، ئەمە بەلایەوە لادانە لە دەستوروپاساو ئەبێت بەگژیا بچێتەوە، هەر لەبەرئەمەیە کە ناکۆکی بەینی منداڵ و گەورەکان لەم تەمەنەدا لەسەر ئەمانەیەو ئەبێت بەئاقلانە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت و بۆ منداڵ ڕوونبکرێتـەوە بۆچـی وایە وەکو ئەو ئەیبینێت و تێیئەگات.

ئەو بیرە بەرزەی کە منداڵ هەیبو بۆ گەورەکان لەقۆناغی پێشودا وردە وردە نامێنێت و ئەگۆڕێت و گەورەکان ئـەو ڕێزەیان نامێنێت وەکو جاران و زۆرجار گوناهبار بەدرۆزن و دووڕوو (ئـەکرێن – Dubelmmoral) وەك کاتێـك گەورەکان هەندێکجار هەوڵ ئەدەن ئەمە بۆ منداڵەکان ڕوونبکەنەوە و منداڵەکان ڕازی بکـەن و خۆیـان لەڕەخنـەکان بپارێزن ئەوا کارەکە ئەوەندەی تر ئاڵۆزێت و ئەنجامی خراپتر ئەبێت و منداڵەکان ئەم هەوڵەی گەورەکان بەخۆدزینـەوە لەبەرپرسیاری لەقەڵەم ئەدەن و ئەڵێن (تۆ بۆیە وائەڵێیت بۆ ئەوەی....) یان ئەڵێن (هەمووکات تۆ هەروا ئەڵێیت).

گیروگرفتێکی تری ئەم قۆناغە تێگەیشتنی جیاوازی منداڵ و گەورەیە بۆ (کات) کاتێك منداڵ باسی شتێك ئەکات کە بکرێت یان بیکات، مەبەستی (ئێستا و ئێرەیە) بەلاّم گەورەیەك ئەبێت بیر لەزۆرشتی تریش بکاتەوە بـۆ کردنـی ئەم کارە لەمانە (کاتە) لەبەرئەوەی بیری منداڵەکە زیاتر کۆنکرێتەو بیری گەورەکە زیاتر ئەگونجێت لەگەڵ ڕاستیدا.

سەرچاوەکان


1. Grupp Processer & Olav Sletta Sven Stensaaen.
2. Vǎra Bam. David Fontan.
3. Mőt mig. Solvig Gronstrőm. Beskov.
4. Att Főrsta barnens tanker. Elisabet Doberborg.
5. Att Samtala med barn.
6. Unger ǎr olika. Agneta HellestrŐm.
7. Bern och Főrǎlderar I Samspel Marie Enfedet.
8. Főrǎlderar Kunskap-Delykliga ǎren, Ottar Ottersen.
9. Ditt Lialla Bran och Du, Anneta Tholstrup.
10. Ditt Barn, Mark Robinstein.
11. Mor och Son, Evelyn, Evelyn Bassoff.